2015

کتێبێک پێویستە هەموومان بیخوێنینەوە

# لە زمانی ئەووە بۆمان دەگێڕنەوە

کۆمەڵێک بەسەرهاتی راستەقینەیە بۆ وتاربێژان و
رۆشنبیران و کەسانی سادەو تەواوی توێژەکانی کۆمەڵگا



نوسینی
شاخەوان عەلی مامۆکی

پێداچونەوە
م.نەهرۆ عەلی حەمەد
پێشنوێژو وتارخوێن

# پێناسی پەڕتووک

**ناوی کتێب:**

لەزمانی ئەوەوە بۆمان دەگێڕنەوە

**بابەت:** ئایینی

**نووسین و ئامادەکردنی:**

شاخەوان عەلی حەمەد مامۆکی

**دیزاین:**

هەرێم خدر قەرەنی ئاغایی

**تایپ:**

صەباح عەلی رسول شەنەغەیی

**هەڵەچن:**

مریەم لەتیف هەولێری

**هونەری :** بەختیار عوبێد محەمەد تەق تەقی

**تیراژ:** ١٠٠٠دانە

**چاپ:** یەکەم/ ٢٠١٥- چاپخانەی شەهاب

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارە سپاردنی(٢٥٣)ی ساڵی (٢٠١٥)ی دراوەتێ

بەسەرهاتی خواناسێکی دەستپاکی کورد لە هیندستان

لەم کتێبەدا....



خوا بەسە تا ئاگای لێتبێ!



بەرەکەتی عومرە لە سەر منداڵە کوردێك ڕەنگدەداتەوە

صۆفیگەری و هەستی شەشەم ....



بەسەرهاتی ئەو کابرایەی بەخەونێك دەوڵەمەند بوو



ئەو پیاوەی دکتۆر تەنها ٨ ڕۆژی بۆ دانا بژێ، کەچی ٢٢ساڵ ژیا!!

خوشك و برایەك لەڕێی( face book ) فەیس بووك حەز لەیەك دەکەن

ئارامگرتن گرنگترین بنەمای ڕۆیشتنە بەرەو خوای مەزن

کامێرای چاودێری ژنێکی بەتەلاقدانا!!

شەیتان چاکە دەکات؟



من پیاوی صوڵحیم، چۆن پارە وەردەگرم!

بەیەك نووکە ژنێکم بەمل داهات...

ڕەخنە لەکاری خوا مەگرن، هیچ شتێك بێ حیکمەت نییە!



موسڵمان بۆ پارە درۆ ناکات

# پێشکەشە بە :

* مامۆستا مەلا( سەلیم شوشکەیی )و دکتۆر ( عبداللطیف احمد ) کە لەڕێی وتارەکانیەوە فێری بوێری بووم هەق بناسم و ناهەق بەنەفرەت بکەم.

* مامۆستا مەلا( سید احمد بەرزنجی ) کە لەڕێی وتارەکانیەوە فێری ڕەوانبێژی بووم، فێربووم زمانی نەتەوەکەم خۆش بوێ.

* مامۆستایان مەلا ( مسعود کانی کوردەیی ) و ( فاتیح شارستێنی ) و ( شێرزاد عبدالوهاب ) و( شێخ مەزهەر خۆراسانی ) و ( میرزا حاجی احمد تاڵەبانی ) و ( دکتۆر جمال محمد رسول ) و ( عبدالمجید حەمە تەیب ) کە لەڕێی وتارەکانیانەوە چیرۆک و بەسەرهاتەکانی ژیانم خۆش ویست و ئەم هێشووەی بەردەستان گوڵچینی منە بۆیان.

* دکتۆر ( پشتیوان مامە خضر کۆیی ) هاوکار و پشتیوانم بوو.

* کاک( ئاشتی شێرکۆ ) و مامۆستا ( عومەر تۆفیق ) خاوەنی کتێبخانەی ( بەختیاری ) دەستبار و دەستگرۆی ئەم بەرهەمە بوون.

هەموو ئەوانەی بە وشە و وتە و پەرەگرافێك شتیان لێ فێربووم، خۆم بەقەرزاریان دەزانم.

شاخەوان مامۆکی

٢٠١٥/شارۆچکەی تەق تەق

❁❁❁❁❁❁ تێبینی :❁❁❁❁❁❁

✍ لەناوەوەی ئەم کتێبەدا بە پێی پێویست وەك گەواهیدەر وێنەی کەسایەتیەکا نمان داناوە و هەندێ وێنە لەبنەڕەتەوە دەست نەکەوت و نەشمانویست لەبەر زۆری وێنەکان ئەم کتێبە بکەینە کتێبێکی ئەلبوومی.

✍ ئەم کتێبە بەرگی یەکەمە و بەرگی دووەمیش ئامادەیە، هەر خێرخوازێك ئامادەیی تێدابێت، بەسوپاسەوە پێشکەشی دەکەم.

✍ بۆ دەوڵەمەندکردنی بەرگی دووەمی ئەم کتێبە، هەر کەسێك سەرگوزشتە و بەسەرهاتێکی واقعی کۆمەڵگەی کوردەواری دەزانێت، دەتوانێ پەیوەندی بەم ژمارە مۆبایلەوە .. یان ئەم ئیمەیلە بکات:

shaxawanali47@yahoo.com ----- ٠٧٥٠٤٤٨٢٢٣٧

# پێشەکی:

## به پێنووسی: مەلا نەهرۆ عەلی

الحمدلله والصلاة والسلام علی رسول الله وعلی آله وصحبه اجمعین، قوله تعالی:
﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ ﴿١٤٠﴾﴾ آل عمران.

ژیان شانۆیەکە مرۆڤەکان ڕۆڵی تێدا دەگێڕن، ئەکتەرێ دەم بەخەندەیە، ئەکتەرێکی دی دڵبەخەم و یەکێ کەم تەمەن و ئەوی تر مامە حاجی و یەکێ پیرو یەکێ لاو و یەکێ ..یەکێ..لەمەوە دەگەینە ئەو هەقیقەتەی بەهۆی جیاوازی ئاست و ڕۆڵەکان دیمەنی جیاو جوێ ببینین.

هەڵبەتە لە سەرەتای دروستبوونی ئادەمەوە تا بەئەمرۆ دەگات و تا دنیا کۆتایی دێت لە بینینی دیمەنەکانی ژیان بێبەش نابین، هەموو ڕۆژێ لەهەر دەقە و چرکەیێ لەنێو دیمەنێ گورزە دەکەین.

لە سۆنگەی ئیسلامەوە چیرۆك و بەسەرهات ئامانجێکی گەورەو مەزنی هەیە، ئاشنامان دەکات بە ئەزموونی کەسانێ کە پێش ئێمە تەمەنێکیان بەڕێ کردووە بۆ ئەوەی لەهەڵەکانیان سود وەربگرین و ڕێگەکوێرەی تاریکی و لەکەو پەڵەی پێش خۆمان ڕەوشەن و بەرچاو ڕوون بێت لەمەڕ خۆ لادان و دوبارە نەکردنەوەی، لەوەشدا برەو بەشتە باشەکان بدەین و خۆپارێزی شتە خراپەکانبین.

ئەگەر سەیری قورئان بکەین ئەوەکو تەنها بەسەرهاتەکانی سەردەمی پێغەمبەرمان(ﷺ)تۆمارکراون بەڵکو لە یەکەم مرۆڤەوە کە ئادەمە، خوا(تبارك وتعالی)بۆمانی بەیانکردووە بۆ ئەوەی لەسەرنج و تێرامان بۆیان ژیربێژانە بیربکەینەوەو ژیریمان بەگەڕبخەین، خوای کاربەجێ لە قورئانی قسەلەجێ دەفەرموێ:
﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٣﴾﴾ یوسف.

بێگومان لەدەمی نوسینەوەی بەسەرهاتەکان دوای وتەی خوای پەروەردگارو پێغەمبەری خوا(ﷺ)و هاوەڵانی بەڕێزی، لەساتی گێرانەوەی بەدەم و گۆهەڵێنان یاخود نووسینەوەی بەسەرهاتەکان کەم و زیاد لە داڕشتنەوەیان بەدی دەکرێ بۆیە مەرجە ئەو کەسەی دەینووسێ یا دەیڵێ بەزوبان شتێ نەداتە پاڵ خاوەن بەسەرهاتەکە کە ئەو ئەنجامی نەدابێ، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بۆ ڕازاندنەوەی

بابەتەکە رێگەدراوە شەن و کەوی تێدا بکرێ بەمەرجێ نەچێتە قاڵبی درۆ و بوختان، کۆکردنەوەی ئەو چەند بەسەرهات و سەرگوزشتەو چیرۆکانەی ژیان کە برای بەرێزم مامۆستا(شاخەوان عەلی) خاڵی خستونەتە بان پیت و ماندوبوونێکی زۆری دەرهەق کردووە، بەشێکی زۆری بەسەرهاتەکانی نێو ئەم پەرتووکەو ئەوانی دیکەیشی لە ئەنجامی ئەزمونی ژیان گواستۆتەوە، کە وای دەبینم بەخوێندنەوەی باسەکان سوودو کەڵکی خۆی هەبێت.

هیوادارم برەوی زیاتری پێ بدات و بەردەوامتربێ بۆ خزمەتی دین و ژین، کە بەراستی بەسەرهاتەکان بۆ هەموو چین و توێژەکان دەست دەدات هەر لە مامۆستایانی ئاینی و ئەندازیاران و پزیشکان و قوتابیان و ..هتد، وە بێ گرێ و گۆڵەو بەزمانێکە هەزمکردنی سانایە.

دوبارە تەمانی بەرەوپێچونی بۆ دەخوازم و خوای گەورە تەمەنی پڕبەرکەت بکات و سەرکەوتووی دونیاو دوارۆژی بکات و ئەم بەرهەمەی بۆ ببێتە خێر لەسەرەتای چاکەکانی، و خوای گەورەش لە دایك و باوکی هەموو لایەکمان ببورێ و پێنوسی سۆزی بەسەر گوناهانمان بخشێنێ..ئامین.

١٦ /٣/ ٢٠١٥

٢٠ ی جمادی یەکەمی١٤٣٦

کۆیە- گوندی کانی دەربەند

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾ النحل: ٩٧

# دەستپاكــی مرۆڤی خواناس

(ابوهريره) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویـەتی: ( خـوای گـەورە فەرموویـەتی ئەگـەر بەندەكەم نیازی وابوو چاكەیەك بكات، چاكەكەی بۆ دەنووسم كە هێشتا نەیكردووە، ئەگەر كردی ئەوا بە دەقات بۆی دەنووسم، بەڵام نیازی وابوو خراپەیەك بكات ئەگـەر نـەیكرد مـن لێـی خـۆش دەبم، ئەگـەر كردیشـی یـەك خراپـەی بۆ دەنووسم).هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( فریشتەكان وتیان: پـەروەردگار ئەوە بەندەكەتە نیـازی وایە خراپەیەك بكات- هەرچەندە خـوا باشتر چاوی لێیـەتی- فـەرمووی: ( چاودێری بكەن، ئەگەر كردی وەكو خـۆی بـۆی بنووسـن، ئەگـەر وازیشـی لێهێنا چاكەیەكی بۆ بنووسن- چونكە لەبەر من وازی لێهێناوە)[1]

لەفەرموودەیـەكی دیكـەدا پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرموێت:( نموونـەی ئیمانـدار وەكـو ڕووەكێكـی تـەڕی تـازە ڕوواو وایـە، بـا دەیلـەرزێنێ، بـەملاو بـەولادا لاری دەكاتـەوە، جارێـك زۆر لاری دەكاتـەوە، جـارێكیش زۆر بـەرزی دەكاتـەوە، هـەتا وشـك دەبێـت. نمونـەی كـافریش وەك سـنەوبەرێك وایـە لەسـەر قەدەكـەی ڕاوەسـتاوە، هـیچ شـتێك نـایجوولێنێ هـەتا هەڵكەنـدنی بـە یـەكجاری) لـە ڕیوایەتێكیشدا( جـارێكیش ڕاسـتی دەكاتەوە هەتا كۆتایی ژیانی دێت، نموونەی مونافقیش وەكو سنەوبەرێكی پتەو وایە هیچ شتێكی تووش نابێت)

[1] - عن ابي هريرة(ﷺ) قال: قال رسول الله(ﷺ): ( قال الله عزوجل: اذا تحدث عبدي بان يعمل حسنة فانا اكتبها له حسنة ما لم يعمل، فاذا عملها فانا اكتبها بعشرة امثالها، واذا تحدث بان يعمل سيئة فانا اغفرها له ما لم يعملها، فاذا عملها فانا اكتبها له بمثلها). وقال رسول الله(ﷺ): ( قالت الملائكة: رب ذاك عبدك يريد ان يعمل سيئة- وهو ابصر به- فقال: ارقبوه، فان عملها فاكتبوها له بمثلها، وان تركها فاكتبوها له حسنة، انما تركها من جرائي). وقال رسول الله(ﷺ): ( اذا احسن احدكم اسلامه فكل حسنة يعملها تكتب بعشر امثالها الى سبع مائة ضعف، وكل سيئة يعملها تكتب بمثلها حتى يلقي الله(عزوجل).( بخاري/حسن اسلام المرء/٤٢)

واتە:مونافیق تووشی دەردو بەڵای دونیایی نابێت تا ببێتە کەفارەتی گوناهی). نمونەی موسڵمان نموونەی دارخورمایە[٢].

✍ بەسەرهاتی یەکەم:

## بەسەرهاتی خواناسێکی دەستپاکی کورد لە هیندستان

📖 بانگخواز مامۆستا (عادل عوبێد) بۆی گێڕامەوە، وتی:

✏ گەنجێکی دەم و دەستپاك و خواناسی ئەم هەرێمە(هەرێمی کوردستان) بۆ خوێندن ڕوو دەکاتە هیندستان، لەوێ لەبەشی ناوخۆیی وەردەگیرێ و دەمێنێتەوە..ڕۆژانە بەپێی دەرفەت دەچێتە بازاڕ و ئەو شتەی پێویستبێ دەیکڕێ و پاشان دەگەڕێتەوە.

ڕۆژێکیان جانتایەکی بچووکی دۆزییەوە، تیلەنیگایەکی دەوروبەرەی داو کەسی لەو شوێنە بەدی نەکرد، لەجێوە جەنتاکەی هەڵگرتەوە، دەستی گەیاندە زنجیرەکە و کردییەوە بزانێ چی تێدایە کە ئەگەر شتێکی گرانبەهای تێدا بوو، بەدوای خاوەنەکەی بگەڕێ و بۆی بگەڕێنێتەوە. جانتاکە هەندێ کاغەز و کارتێکی چەند ملیۆن دۆلاری و پاسوێرد و ناسنامە و ئەو شتانەی تێدابوو، کە لەناو و ناونیشانی خاوەنەکەی وردبۆوە سەرسام بوو کە ئەو جانتایە جانتای سەرۆکی زانکۆکەیانە، بەشێنەیی هات، لەگەڵ دەستی خۆیدا بێ ئەوەی بیکا بەترومنەت بەسەرییەوە بردیە لای سەرۆکی زانکۆکەیان و ڕادەستی کرد، بەرێزەوە وتی: مامۆستا گیان ئەم جانتایەم لەرێی بازاڕ دۆزییەوە، کردمەوە، سەیری شتەکانی ناویم کرد زانیم هی تۆیە، لە دەروونەوە بەخۆم وت: نابێ ئەم کارە دوا بخەم چونکە مامۆستاکەم بەو بزربوونە خەفەت دەخوا، بۆیە یەکسەر هاتمە ئێرە بە ئەمانەتەوە شتەکانت بۆ بگەڕێنمەوە، جا بێجگە لەم شتانەی ناوی، لەپارەپول چیتری تیا بووە،ئەوەیان نازانم.

ئەویش کە دڵەڕاوکێیەکی زۆر لەسەروسیمای بەدی دەکرا، بەبینینی جانتاکەی کەیفسازبوو، بەدڵخۆشیەوە پەلاماری داو کردییەوە، تەماشای کرد تەواوی شتەکانی

---

[٢] - عن كعب بن مالك(ﷺ) قال: قال رسول الله(ﷺ) : ( مثل المؤمن كمثل الخامة من الزرع تفيئها الريح، تصرعها مرة و تعدلها اخرى حتى تهيج، ومثل الكافر كمثل الازرة المجذية على اصلها، لا يفيئها شيء حتى يكون انجعافها مرة واحدة). وفي رواية( : وتعدلها مرة، حتى ياتيه اجله، ومثل المنافق كمثل الازرة المجذية التي لا يصيبها شيء).(بخاري/ المرضى/ ماجاء في كفارة المرض/٥٣١٩)

تێدایە، پێی سەیربوو لە هیندستانێکی هەژار و نەداردا ئەو شتە گرانبەهایە بدۆزێتەوە، ئەوجا بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە! بۆیە کەوتە پرسیار و ئەویش یەکە یەکە وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە:

* ئەی گەنج تۆ دەتزانی ئەوە کارتی بانکە؟

– بەڵێ دەمزانی.

* دەشتزانی چی تێدایە؟

– بەڵێ، ئەوەش دەزانم ئەگەر بمویستبایە.

* ئەی بۆ گەڕانتەوە ؟ بۆچی بۆ خۆتت نەبرد؟

_ ئاخر ترسی خوام لە دڵ دەگەڕێ، دینەکەم ڕێم پێ نادات شتێك هی خۆم نەبێ بەهەقیبزانم و بۆ خۆمی ببەم.

* ئایینت چییە؟

– ئیسلام.

* ڕاستیم لێ مەشارەوە ئەمەت لەبەر ئەوە کرد بۆ ئەوەی دوو یارمەتیت بدەم؟

_ نەخێر هەرگیز بیرم لەو شتە نەکردۆتەوە کە ئەگەر هی تۆش نەبوایە، بەپێی توانا هەوڵمدەدا بەدوای خاوەنەکەی بگەڕێم و بیدەمەوە، خۆ هەر لەلام بمابایەتەوە بۆ ئێستا و سەد ساڵی دیکە، دەستم لێی نەدەدا.

* دیارە دەوڵەمەندی و دەربەست بەپارە نی؟ لەکاتێکدا ئەگەر ئەو پارەت لەبانك ڕابکێشایە هەتا مردن بەخۆشی دەژیای؟

– ببوورە من ئەوەندە هەبوو نیم، بەڵام بەبەشی خوا ڕازیم،ماڵی خەڵك بۆ خۆم بەحەلاڵ نازانم وەکو چۆن ماڵی من بۆ خەڵك حەلاڵ نیە، ئەگەر هیچیشم نەبێ ئەوە هەر ئامادەنیم شتێکی لەو جۆرە بکەم چونکە خوا ڕەقیبە بەسەرمانەوە دەبێ بزانین چۆن ڕەفتار بکەین؟ بەختەوەری هەموو کات بەپارە دەستەمۆ ناکرێ، ئەگەر پارە بەختەوەری بگێڕێتەوە، فەرموو کێ توانیویەتی ژیان بکڕێ بۆ ئەوەی نەمرێت و نەتوانێ بمرێ؟

* بەڕاستی قسەکانت خۆشن، پێم بڵێ تۆ خەڵکی کوێی؟

_ خەڵکی هەرێمی کوردستانم، هەرێمێکە سەر بە دەوڵەتی عێراق.

ئەویش لەخۆشیان شاگەشکە بوو، پەلاماریدا و لەباوەشی گرت ، ئەملاو ئەولای ڕوومەتی ماچ کرد، ئەوجا لەلای خۆی داینیشاند و قاوەیەکی بۆ بانگ کرد، پاشان

لەگەڵ خۆی بردی، خوێندکارەکانی کۆ کردەوە، بەشانازییەوە ئەو گەنجە دەسپاکەی پێیان ناساند و مەدحێکی زۆری کرد، دواقسە وتی: فەرموو ئەوانە خاوەنی ئالاّ نین و سەربەخۆش نین، بەلاّم ئاینێکیان هەیە بەجۆرێ پەروەردەیان دەکات مرۆڤ شانازیان پێوە بکات.

ئەو گەنجە تاوەکو ئەو چەند ساڵەی لەهیندستان مایەوە، ببووە نموونەی ڕێز و ستایشی تەواوی قوتابیانی زانکۆکەیان.

* * *

✍✍ بەسەرهاتی دووەم:

**بۆ ئەوەی خاوەنی پارەکە بدۆزێتەوە، دەبوو بەند بکرێ!!**

📖(ابوهریرە) (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (بەڕاستی خوای گەورە ئەگەر بەندەیەکی خۆشویست، ئەوا بانگی جوبریل دەکات و پێی دەفەرموێت: بەڕاستی من فلانە کەسم خۆش دەوێت، دەی تۆش خۆشت بوێت. دەفەرموێت: ئیتر جوبرەئیلیش خۆشی دەوێت، پاشان لە ئاسماندا جاڕ دەدات و دەڵێ: بەڕاستی خوای گەورە فلانە کەسی خۆش دەوێت، دەی ئێوەش خۆشتان بوێت، ئیتر ئەوەی لە ئاسماندایە خۆشی دەوێت، دوای ئەوە لە زەویدا پەسند دەکرێت. ئەگەر خوای گەورە ڕقی لە بەندەیەك بوو، ئەوا جبریل بانگ دەکات و پێی دەفەرموێت: بەڕاستی من ڕقم لە فلانە کەسە، دەی تۆش ڕقت لێی بێت، ئیتر جبریل ڕقی لێی دەبێتەوە، پاشان لە ئاسماندا جاڕ دەدات و دەڵێ: بەڕاستی خوای گەورە ڕقی لەفلانە کەسە، دەی ئێوەش ڕقتان لێی بێت. ئەوانیش ڕقیان لێی دەبێتەوە، دوای ئەوە ڕق و خۆش نەویستنی لە زەویدا بۆ دادەنرێت)[٣]

خەڵکی هەرێمی کوردستان لەبەهاری١٩٩١ لەمەترسی جینۆساید.. لەترسی دووبارەبوونەوەی ئەنفال و هەڕەشەی کیمیابارانی دەستی نەگریسی ڕژێمی بەعس،

---

[٣] - عن ابي هريرة(ﷺ) قال: قال رسول الله(ﷺ) ان الله اذا أحب عبدا دعا جبيريل(عليه السلام) فقال: اني احب فلانا فأحبه، قال: فيحبه جبريل، ثم ينادي في السماء فيقول: ان الله يحب فلانا فأحبوه، فيحبه اهل السماء، قال: ثم يوضع له القبول في الارض، واذا ابغض عبدا دعا جبريل(عليه السلام) فيقول: اني ابغض فلانا فابغضه، قال: فيبغضه جبريل، ثم ينادي في اهل السماء: ان الله يبغض فلانا فابغضوه، قال: فيبغضونه، ثم توضع له البغضاء في الارض).( بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٣٧).

کۆڕەوی کردە سومبولی بەرخودان و بەرەو سنوورەکانی ئێران و تورکیا ملینا، هەموو میدیاکانی جیهان بەبایەخەوە باسیان لە تراژیدیای کۆڕەوی کوردان دەکرد، کار بەوە گەیشت(UN) بێتە سەر خەت و لەنەتەوە یەکگرتووەکانەوە بۆ پاراستنی خەڵکی ئەم هەرێمە، بڕیاری دامەزراندنی هێڵی ۳۲ و ۳٦ بدەن کە لەو ڕێیەوە بەر بە هەر هێرشێکی ئاسمانی و وشکانی سوپای عێراق بۆ سەر کوردستان بگرن.

ئەوەی لەناو کۆڕەو گوزەری کردبێ، دەزانێت و تێ دەگا چ مەرگەساتێك لەو هەڵکشان و ئاوارەییە ڕووی دا؟ ترس و بیمی مەرگ وای لەو خەڵکە کرد حاڵ و ماڵی خۆیان بەجێ بێڵن، بەپێیان لە زستانێکی تووش و باراناوی، بەزگی برسییەوە دەیەها کیلۆمەتر بڕن و بچنە شوێنێك تیایدا هەست بەدڵنیایی و ئاسایش بکەن.

وادەزانم ئێستایە: بەدەیان کەس لەو ڕێیەوە بەهۆی سەرماوسۆڵەی ئەو زستانە لەو ڕێیە ڕەق بوونەوە، بەدەیەها کەس ملیان لەو هەرەت و شاخ و داخەی سەر سنوورناو کەوتنە بەر ڕەحمی مین و وەفاتیان کرد، بەدەیەهای تریش هەر بەو هۆیەوە دەست و قاچ و چاویان لەدەستدا و کەمئەندام بوون.

کابرایەکی لەخوا ترس هەبوو، بەخۆو خێزانەوە وەکو ئەو خەڵکە هەمان چارەنووسی هەڵبژارد، بەرەو سنوورەکانی ئێران ڕۆیی، هەر کە هەستیان بە شەکەت و کەیلی خۆیان بکردبایە، لەلایەکەوە لایان دەدا، دەوەستان و باروبنەیان لێی دادەنا.

ڕۆژێکیان بەمەبەستی دەست بەئاو گەیاندن لەخەتی ڕەیسی دوور دەکەوێتەوە، بەسەر داوێنی شاخ و چیاکانی ئەو شوێنە هەڵدەگەڕێت بۆ ئەوەی دوور لە چاوی ئەم و ئەو لەشوێنێکی لاپەڕگە دەستاوی خۆی بکات و بگەڕێتەوە، هەر ڕۆیشت تاوەکو لەپشت کەپکە شاخێکی گەورە وەستا، جانتایەکی بینی، جانتاکە سەرنجی ڕاکێشا کە دوای پێشاو بچێ بزانێ چییە و چی تێدایە؟

کە خۆی گەیاندە جانتاکە و کردییەوە، چ ببینێ؟ تەماشای کرد پڕاوپڕە لە پارەی پێنجی و دەیی و بیست و پێنج دیناری (پارەکە سەد هەزار دیناری سویسری ئەو کاتە بوو) پارەیەکی خەیاڵی ، مرۆڤ بە پازدە، بیست هەزار دینار شازی سەیارە و باشترین خانووت پێ دەکڕی..ئاااای خوایە گیان دەبێ ئەو پارە هی کێ بێت؟ بۆچی لێرەیان بەجێ هێشتووە؟ ئەوەندەی دیقەتی داو سەیری ئەملا و ئەولای خۆی کرد، کەسی لەو دەوروبەرە نەبینی بۆ ئەوەی پرسیاری ئەو پارەی لێ بکات و بۆی

بگەڕێنێتەوە.

بەجانتایەکی لێوان لێو لە پارە گەڕایەوە ، ئاگاداری ماڵ و منداڵەکەی کردەوە ئاگایان لەو جانتایەبێ و نەیکەنەوە، ئەویش ئەوەندەی بۆی لوا، لەو دەوروبەرە گەڕاو سووڕا، ئەو خەڵکەی تووشی بوو، بەپەرۆشەوە لێی دەپرسی: ئەرێ بێ زەحمەت کەستان نەبینیوە پارەو پوول، زێڕو زەبەن، شتێکی لەو جۆرەی بزر کردبێ؟

هەمووان بە نەخێر وەڵامیان دایەوە: ببوورە نەمیچمان بزر کردووە، نە دەزانین کەسێك هەبێ شتی بزرکردبێ و بەدوایا بگەڕێت.

تەنانەت کەسانێك هەبوون بەکڵۆجێ گومانیان دەبرد، وایاندەزانی ئەو کابرایە ڕەنگە دە دینار، بیستدینار، سی دینارێکی دیتبێتەوە، دەیانوت: کاکە لەو زروفە ناخۆش و ئەو ترسەی لەسەرمانە، کەی ئێستا وەختی ئەو پرسیارەیە، بڕۆ بۆ خۆت بیخۆ و نۆشیکە، ئەوە باشترە لەوەی بکەویە سەروسۆرغی کابرا و پارەکەی بۆ بگێڕییەوە.

مرۆڤ ئەگەر ترسی خوای لەدڵدابوو، چاوی لەوە نیە یەك فلسی قەڵب چەند بێ نرخە ئەو فلسە بخوات چونکە بەردەوام بیردەکاتەوە، دەزانێ خوا بەسەرییەوە ڕەقیبە و چاودێری کردەوەکانی دەکات[4]

---

[4] - ساڵی ١٩٨١ پۆلی پێنجی سەرەتایی بووم، ڕۆژێکیان لە کۆڵانی گەڕەکی (سەربەستی) پێکەوە من و کامەران و عادل لەدەرەوە گەمەمان دەکرد، ئاگام لەهیچ نییە، نازانم چ پلانێکم بۆ داندراوە، ئەوەندەم زانی، کاك عادلی مەلا عوبێد هەندێ قوڕی هێنا، کردییە سێ بەشەوە، بەشێکی بۆ خۆیی و دوو بەشەکەی تر، بەشێکی دایە من و ئەویتری دایە کاك( کامەران عەبدوڵڵای تورکمانباغی) وتی: دەی با هەریەکە دوور لەویتر بزانم کامەمان بەکەیفی خۆی شتێکی جوان دروست دەکات؟ هەریەکەمان چووینە لایەکەوە، من پارچە قوڕەکەم بەدەستەکانم توند کردەوە، خەریکی ئەوەبووم گوێدرێژێکی لێ دروست بکەم، شتێکی ڕەق ئاسا لەناو قوڕەکەبوو، لێکمکردەوە، سەیرم کرد ئەوە دەفلسی ئاسنی تێدایە، بەقەد ئەو دنیایە خۆشحاڵبووم کە دەفلسم دۆزییەوە، بەپەلە پارەکەم خستە باخەڵم و حەزم دەکرد هەرچی زووە کۆتایی بەو گەمەیەبێت و بڕۆینەوە وابێ لەدوای ئەوان یەکسەر پارەکە ببەمە بازاڕ و بۆ خۆم شتی پێ بکڕم و بیخۆم، کە وتیان: دەی تەواو بوون، من خێرا گوێدرێژەکەم پێنیشاندان و ئاگام لەوە نییە ئەوە هەردووکیان تەگبیریان لێمکردووە تاقیم بکەنەوە بزانن دەست پاکم یان نا؟ کاك کامەران وتی: شاخەوان بڕۆینەوە؟ وتم: بەڵێ بابڕۆینەوە .بەدڵخۆشییەوە پێمهەڵێنا بەرەو بازاڕ بڕۆم، ئەوەندە دوور نەکەوتمەوە، کاك عادل بانگی کردم، منیش کە ئاوڕم دایەوەو وتم: چییە؟ چیت دەوێ؟ وتی: وەرە بێزەحمەت پارەکەمان بدەوە..ئەوجا لەخۆم گەیشتم، بەنابەدڵی دەفلسەکەم بۆی گەڕاندەوە، لەو ڕۆژەوە ئەوە بۆمن بووە پەند کە لەسەر جادە و شوێنان چاوم بەپارە بکەوتایە وامدەزانی ئەوە بۆ تاقیکردنەوەی من فڕێدراوە، خۆم لێی لا دەدا و هەڵمنەدەگرتەوە..ئەگەر

ئەو جانتا قورسە پڕ پارەیە لەو هەلأتنەدا بووە بار بەسەرییەوە،چووە ئێران لەگەڵ خۆی برد، ماوەیەك لەوێ مایەوە، لەگەڵ دەسپێکی گفتوگۆکانی نێوان بەرەی کوردستانی و حکومەتی ناوەند، وەکو ئەو خەڵکەی دیکە ئێرانی بەجێهێشت و گەڕایەوە، کەچی هێشتا لەپرسیار ناکەوێت و ئەو جانتایە بووەتە دێوەزمە و خەمێکی گەورە، نایەوێ یەك دیناری لێ دەربکات و بیخوات.

ساڵ و عەیامێك بەسەر ئەو دۆخە تێپەڕی، ڕژێمی بەعس دام و دەزگاکانی خۆی لە کوردستان کشاندەوە، لەیەکەم هەڵبژاردندا پەرلەمان و حکومەتی کوردستان لەباشور حاڕدرا کە ئەوەندەی نەبرد قات و قڕی باڵی بەسەر ئەو هەرێمە کێشا، گرانی هەموو لایەکی گرتەوە.

کابرای لە خواترس جانتا پارەکەی لە ماڵەوە حەشاردا، وەك هەر خێزانێکی تر سەرەڕای ئەوەی تووشی نەبوونی هاتبوو°، نەیهێشت شەیتان زەفەری پێ ببات.

ئەوەندەی منالەکانی پێیان دەوت: گرانی لەوە زیاتر چییە؟ کیلۆی شەکر بەسەد دینار و کیلۆی ئارد بە هەشت دینار بکڕیت و شتەکانی تریش بەهەمان شێوە، فەرموو ئیدی بەتەمای چی؟ تاکەی چاوەڕوانی ئەوەی خاوەنی ئەو جانتایە دەرکەوێ

---

ئەوە نموونەیەکبێ بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤ بۆ مرۆڤ، ئاخۆ تاقیکردنەوەی چاودێری خوای گەورە بەس نییە تا خۆمان لەدزی و تاوان و کاری خراپە بەدوور بگرین؟!

° – دەگێڕنەوە: کابرایەك هەبوو لەبڕیارێکی پادشا هەڵگەڕایەوە، دەیوت: پەلم بدەن و گۆشاوگۆش سەرم ببڕن باج نادەم.

یاساوڵەکانی پادشا بەربوونە ویزەی، چینە لێدانێکی خۆش لێیاندا، هەر نەهاتە ڕایێ، قۆڵبەستیان کرد و بردیان بەردەم پادشا، وتیان: قوربان ئەو کابرایە لەفەرمانتان یاخی بووە و ئامادە نیە وەکو ئەو خەڵکەی تر باج بدات.

پادشا پێی وت: وەرە بزانم خۆت بەچی دەزانی باج نادەی؟

وتی: قوربان خۆم بەهیچ نازانم، بەلأم نیمە و نایدەم.

پادشا وتی: دەی کەوایە هەر ئێستا سێ مێخەکی بکێشن.

کابرا تەماشایەکی پادشای کرد و زەردەیەکی هاتێ.. پاسەوانەکان بردیان وئەوەندە نەڕۆیشت، پادشا وتی: بیگەڕێننەوە.

کابرایان گەڕاندەوە، پادشا لێی پرسی: من فەرمانمدا بتکوژن کەچی تۆ زەردەیەکت هاتێ، چما مردن لەلای تۆ ئەوەندە ئاسانە؟

کابرا وەلأمی دایەوە، وتی: بەڵێ زۆر ئاسانە، چونکە لەوە ناخۆشتر نیە تۆ میوانێکت بێ و هیچت نەبێ بیدەیتێ.

و بێ جانتاكەی بباتەوە؟ مانەوەی ئەو جەنتایە دوای ئەو هەموو ساڵە نیشانەیە بۆ ئەوەی كە خاوەنەكەی نەماوە، دەبڕۆ هەندێ پارەی لێ دەربكە بۆ ئەوەی زیاتر تووشی هیلاكی و مینەتی و برسێتی نەبین.

ئەویش بەیەك وەڵام پێیانی وت: ئەوە دەڵێن چی؟ من چۆن ناپاكی بەرامبەر ئەمانەتێك دەكەم لەكاتێكدا كێ دەڵێ خوای پەروەردگار ئەو ئەمانەتەی بەمن نەسپاردووە تا كاتی خۆی دادێ ئەو ئەمانەتە بۆ خاوەنەكەی بگەڕێنمەوە؟

گرانی و نەهامەتی كاری لەو خێزانە نەكرد دەست بۆ ئەو پارەیە ببات، كەچی نەبوونی پاڵی پێوەنا بۆ كاروكاسبی ڕێگەیەكی دوور لەو سەری سنووری كوردستانەوە بۆ ئەو سەری سنوور ببڕێت و بچێتە كەركوك، پێش ئەوەی داخڵی كەركوك ببێ، لە بازگەی پێشەوە لێی دەكەونە گومان و لەسەیارەی دادەگرن، دەستگیری دەكەن و ڕاپێچی زیندانی (ئەبوغرێب) دەكەن ، زۆر خەفەت دەخوا، كە بیر لەخۆی دەكاتەوە: ئای خوایەگیان بزانە بۆچی هاتم و تووشی چی بووم؟ هەمیشە لەبیری ئەوەدابوو ئاخۆ دەبێ ئێستا ماڵ و منداڵەكەی لەبەر بێ پارەیی چیبكەن؟ ئەی ئەگەر بزانن من گیراوم چۆن بەجارێ ناڕوخێن و دنیایان هێندەی دیكە لەبەر چاو تاریك دانایەت؟

سروشتی گرتووخانە ئەوەیە كەسەكان یەكتر دەدوێنن، نەخاسمە ئەو كەسەی تازە گیرابێت، ئەو پرسیارانەی لێی بكەن ئەوەیە: بۆ لێرەی؟ لەسەر چی گیرای؟

ئەویش بێ هیچ درۆ و دەلەسەیەك ڕاستی گیرانەكەیان بۆ دەگێڕێتەوە، وردە وردە ئاشنایەتی دروست دەبێت و ئەویش هۆكاری گرتنیان لێ دەپرسێ.

لەو شوێنە كابرایەكی كوردی ناسی، متویان بەیەكەوە گرت، ئەوەی لەدڵیان دابوو بۆ یەكیان هەڵدەڕشت، كابرا كوردەكە وتی: من كە لە ئێران هاتمەوە ئەو دیوی سنوور، لەو وەختەوە لێرە بەندكراوم، ماڵەوەمان نازانن ماوم یان نا، دڵنیام ئێستا لەژیانێكی پڕ لە كولەمەرگی دەژێن لەكاتێكدا پێش ڕاپەڕین زۆر دەوڵەمەند بووم، لەچاوتروكانێك دا هەرچی پارەوپوولێكی هەمبوو، هەر هەموویم لەدەستدا.

كە ئەویش لێی دەپرسێ: چۆن بەجارێ موفلیس بووی؟ قومارت دەكرد؟

وتی: نەخێر لەو كۆڕەوەی بەرەو ئێران ڕامانكرد سەد هەزار دیناری ئەسڵیم پێبوو ، ئەو پارە زۆرەم لەسەر ڕێی خۆم لەجێیەك لەپەنای گاشەبەردێكی زل دانا، دواتر چەندی كردم و كۆشام نەمتوانی بچمەوە سەری، جێگاكە ئەوەندە عاسی و

تێکچڕژابوو، لەبەر چڕوپڕی دارو دەوەن و شاخ و داخێکی ئەوتۆ و ترسی مین لەو ناوچەیە نەمزانی ئەو جانتایەم لەکوێ دانا؟ بەناچاری ڤیروسیام لەو پارەیە کرد کە لە جانتایەکی گەورەی ڕەشم هەڵگرتبوو، هاتمەوە لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەم بەکۆڵێ خەم و خەفەتەوە کەوتینە ڕێ و ئاودیوی ئێران بووین، هەموومان بەکوڵ دەگریاین و فرمێسکمان بۆی دەڕشت، زۆر ناخۆشە ئەوەندە دەوڵەمەندبی و لەچاوتروکانێکدا بێیەوە سەر ساجی عەلی.

کابرای خواناس لەخۆشیان هاواری کرد: چما ئەو پارە زۆرە هی تۆ بوو؟

کە وتی: ئەوە باسی چی دەکەی؟

وەڵامی دایەوە: ئەو جانتایەی تۆ وا لەلای منە و لەو کاتەوە لە لای خۆم پاراستوومە بەو نیەتەی ڕۆژێك دابێت خاوەنەکەی بدۆزمەوە ، بزانە کاری خوا چەند جوانە، من بۆ کارو کاسبی هاتمە کەرکوك ، لەبازگەی پێشەوە منیان گرت، بۆ ئێرەیان هێنام تاوەکو لەم جێگەیە یەکتر بناسین و دوای ئەوەندە ساڵە پارەکەت بۆ بگێڕمەوە.

ئەویش لەخۆشیان فرمێسك لەچاوان دەباری، توند باوەشی پێدا کرد، لەبەرخۆیەوە دەیوت: نازانم ئەوە خەونە یان خەیاڵ؟

ماوەی مانگێك زیاتر مایەوە، قەدەری خوا واهاتەوە پێشەوە لەدوایان ناردو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵی کرد، کە زانیان نیەتی هیچ شتێك نەبووە جگە لەوەی بچێ بۆخۆی لە کەرکوك ئیشێ کارێ کاسبیەك بدۆزێتەوە و بیکات، ئازادیان کرد، پێش دەرچوونی لەو شوێنەدا، ناونیشانی تەواوی ماڵەوەیانی وەرگرت، هەر دوای گەڕانەوەی، دەمودەست جانتا پڕ پارەکەی هێنا و چوو بەو ناونیشانە ماڵی کەس و کاری کابرای دۆزییەوە، چووە ماڵیان، خۆی پێ ناساندن و مژدەی ساغ و سەلامەتی کابرای پێ ڕاگەیاندن هێندە دڵخۆشبوون وەسف ناکرێت، ئەوجا باسی کۆڕەوەکە و دۆزینەوەی جانتاکەی بۆ کردن و وتی: دیارە قسمەتی خوا وابووە من بچمە کەرکوك و بگیرێم و ڕەوانەی سجنی ئەبوغرێبی بەغدا بکرێم تا ئەو کابرایە لەوێ بناسم و باسی خۆیم بۆ بکات بۆ ئەوەی لەو ڕێیەوە ئەو ئەمانەتەتان بۆ بگەڕێنمەوە کە چەند ساڵە من لەلای خۆم هەڵگرتووە.

بەو مژدەیە ئەوەندەی دیکە خۆشحاڵی کردن کە هەرگیز بەخەیاڵیان نەدەهات دوای ئەوەندە ساڵە ئەو پارەیان بۆ بگەڕێتەوە، کاتێك جانتا پارەکەیانی ڕادەست کرد، وەکو

پاداشتێك بۆ ئەو دەست پاكیە ویستیان پارەیەكی باشی بدەنێ، بەڵام پارەكەی لێ وەرنەگرتن و پێیانی وت: ئەوە چییە دەتانەوێ بەوەرگرتنی ئەو پارەیە ئەو پاداشتە گەورەم لەلای خوا لەدەست بدەم؟ من ئەگەر نیەتم پارە بوایە زۆر لەمێژبوو پارەكەم دەخوارد و كەسیش نەیدەزانی، بەڵام خوا چاودێرە بەسەرمانەوە ئەوە تاقیكردنەوەی خوای پەروەردگارە كە دوای بزركردنی ئەو جانتا پارەیە، ئەو ئەمانەتە بەمن بسپێرێت و بزانێ تا چەند دەیپارێزم؟ شوكر لەم نان و ساتەوە هەست بەخۆشیەكی زۆر دەكەم كە ئەو هەموو ماوە دوور و درێژە شەیتان زەفەری پێ نەبردم دەستی بۆ ببەم و هیچی لێ بخۆم.

دوای تاوێ مانەوە، بەكەیفسازییەوە دوای ئەوەی ئەو دوو مژدە خۆشەی پێدان، ڕێ و ڕێ گەڕایەوە ماڵ.

* * *

📖ئەو كەسەی ئەقڵی نەبێت، ئەدەبی نییە. ئەو كەسەی دینی نەبێت، شەرمی نییە.

۞ئیمامی حەسەن۞

# خوا بەسە تا ئاگای لێتبێ!

نەنکم ( فاتم)[6] یادی بەخێر بەسەرهاتێکی بۆ گێڕامەوە وتی:

لەژیانمدا نەهامەتی و کولەمەرگی زۆرم بینیوە، (ئەبوبەکر صالح)ی باپیرت کە بۆ خۆشەویستی خەڵکی ئاوایی پێیان دەوت: (کاکە حەمە) لەلایەن بەعسییەکانەوە لەساڵی حەرەس قەومیەکە[7] ئیعدام کرا، ئێمەش دواجار هاتینە شار و خانوویەکمان لە (کۆیە) گەڕەکی( جەمعیە) کڕی و تیایدا ئۆقرەمان گرت، بەهەر حاڵ:-

ئافرەتێکی هاوکوفی خۆمم ناسی[8] بەتایبەت ئەو ڕۆژانەی بۆ شتکڕین لە بازاڕ دەمبینی، سوبحانەللا تەبیعەتم وایە ئەوەندە گوێ لەقسەی ئەم و ئەو ناگرم و ئەو شتانەیشی گوێبیستیان دەبم نەیانگێڕمەوە، سەیرم بەخۆم دێ نازانم بۆچی دوای ئەو هەموو ساڵە وا ئێستا ئەو بەسەرهاتەم بیر کەوتەوە؟

ڕۆژێکیان ئەو ئافرەتە لەگەڵ کڕینی سەوزە و میوە لەیەك لە دوکانەکانی قەیسەری کۆیە، بەسەرهاتێکی خۆی بۆ گێڕامەوە، وتی: من و پیاوەکەم ژیانێکی خۆش و



نەنە (فاتمە ئەحمەد تەها)لەدایکبووی١٩٣٢/٧/١ ئافرەتێکی بێزەڕ و بێدەنگ بوو، حەزی لەغەیبەتکردنی ئەم وئەو نەبوو، زۆر کەمدوو بوو، هەتا نەتدواندایە، زمانی نەدەگەڕاند، لە١٥/٧/٢٠٠٠کۆچی دوایی کردووە.

[7] –حەرەس قەومی: ئەو هێزە پاتاڵی بەعسییەکان بوو، ساڵی ١٩٦١پەلاماری هەر گوندێکی کوردستانیان بدایە، ئەو شوێنەی تاڵان و بڕۆ دەکرد و ڕەشبگیری تێدا ئەنجام دەدا، کاکە حەمە ئەو کاتە کادیرێکی دیارو بەرچاوی سنوورەکە بوو، کاتێك ڕژێم بەتانك و زرێپۆشەوە بەرەوە گوندی تاڵەبانی گەورە دێن، نێوانی ئەم و جەیشەکە ئەوەندە زۆر نابێت، خێرا بڕنەوەکەی‌شانی فڕێ دەداتە نێو گژوگیای ئەو دەوروبەرە ، بەڵام بەهۆی شڵەژانیەوە لەبیری دەچێ فیشەکدانەکەی بەری کە لەخۆی بەستابوو لێیبکاتەوە و فڕێی بدات، بۆیە لەگەڵ دەستگیرکردنی دەزانن پێشمەرگەیە، یەکسەر گوللەبارانی دەکەن کە دوای خۆی چوار کوڕو چوار کچی بەجێ هێشتووە بەناوەکانی( سەمەد و ڕەزا و زاهیر و کامیل و نایلە و ناجیە و گەلاوێژ و ڕازیە)

[8] – ساڵی١٩٩٧ ئەو بەسەرهاتەی بۆ گێڕامەوە بەڵام ناوی ژنەکەی لەبیر نەمابوو. منیش سۆراخم بۆ ناوەکەی نەکرد.

بەختەوەر دەژیاین ، ئەگەرچی نەدار و نەبوو بووین و منداڵمان نەدەبوو بەڵام بە کاری خوا ڕازی بووین، پیاوەکەم دوای بەسەربردنی تەمەنێك، خۆی ناونووس کرد بچێتە حەج ، کە ناوی هاتەوە، مامەڵەی ئەو سەفەرەی دەست پێ کرد و لەتەك ئەو پارەی کۆی کردبۆوە هێشتا پێویستی بە پارەی زیاتر هەبوو تاوەکو ئەو گەشتە پڕ خێرەی پێ ئەنجام بدات، بەناچاری بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە چووە لای براکەی و هەندێ پارەی بە قەرز لێ وەرگرت.

پێش ڕۆیشتنی بۆ ماڵی خوا، جەولەیەکی خێرای خزم و قەوم و قیلەی کرد بۆ ئەوەی گەردەن ئازاییان لێ بکات، بەڕۆژێ پێش ئەوەی بڕوات پێی وتم: توخوا گەردنم ئازاکە ئەوە دنیایە، دنیاش مەرگ و مردنە نەوەکو نەتبینمەوە و خوا مردنم لەو شوێنە پیرۆزە بەقسمەت بکات، هەتا پێم بکرێ نزای خێرت بۆ دەکەم.

خۆم بۆ نەگیرا دەستم بەگریان کرد، من بگریێ و ئەو بگریێ، تەواوێکی باش بەیەکەوە گریاین.

هەندێ نانم بۆ پێویستی ئەو ڕێیە دوورە برژاند و دەق و نووشتم کردن کە لەگەڵ نەختێ ساوەر و کولیچە و داندۆك لە توورەگەیەکدا بۆیم پێچایەوە، ئێوارێ کتوپڕ دالغەم ڕۆیی، پیاوەکەم بەهەڵپەیەکەوە سەیری کردم و وتی: ژنەکە ئەوە بیر لەچی دەکەیەوە لەکاتێکدا وادەزانی سبەی دەڕۆم و ئاوا زوو نایەمەوە؟

منیش پێموت: تۆ ماوەیەکی زۆرت پێ دەچێ ، من بەنانە ڕەقەشبێ ئیدارە دەکەم ،بەڵام هەست دەکەم هیچی وامان بۆ خواردن لە ماڵ نیە .

ئەویش بەدەم زەردەخەنەیەکەوە: ئافرەت وا مەڵێ، خودا سەر بدات ڕزقیش دەدا و تۆش خوات بەسە تا ئاگای لێتبێ و برسیت نەکا.

بەیانی ماڵئاوایی کرد و منیش بەتەنیا مامەوە، لەو ماوەیە بڕێ پارە کە بۆ خەرجی ڕۆژانەی بەجێ هێشتبوو، هەموویم خەرج کرد، بەڵام لەو ماوەیە شتێکی سەیر ڕوویدا هەرگیز خەیاڵم بۆی نەدەچوو.

ڕۆژێکیان لەماڵەوە ئەوەندەی سەرم هێناو برد شتێ نەبوو لێینێم ، لەپارەو پوولیش هیچم نەبوو شتی پێ بکڕم ، گەلێ خەفەتم خوارد، لەبەر خۆمەوە دەموت: ئەوجا چیبکەم؟ تەنانەت لەڕووم نەدەهات شت لەو دەرو دراوسێیانە بەقەرز وەربگرم، لەم ئان و ساتە کابرایەك لەدەرەوە هات و هاواری بوو: دەی وەرنەوە پارە بە نیسك، پارە

بە نۆك، وەرنەوە ئارد دەكڕین، برنج دەكڕین، هەموو شت دەكڕین. وەكو تووتی ئاسا ئەو قسانەی دەبارە و سەد بارە دەكردەوە.

كاتی خۆی گۆبەرەیەكی تەنەكەم لەبازاڕ كڕیبوو، بیرم بۆی ڕۆیی، ئەگەر ئەو كابرایە بەكەم پارەیەك لێم بكڕێ خراپ نییە بۆ خۆم نانی ئەوڕۆی پێ دابین بكەم و بۆ بەیانی خوا كەریمە.

بەپەلە ئەو گۆبەرە تەنەكەی هەڵمگرتبوو، هێنام چوومە دەرەوە، خۆم گەیاندە كابرا و پێموت: قوربان ئەوە بەچەند دەكڕی؟

گۆبەرەكەی لەدەست وەرگرتم، نەختێ سەیری كرد و گەڕاندیەوە، وتی: ببوورە پارەی ئەوەندە زێڕەم پێ نیە، دوای ئەوە بەچی بزانم ئەو زێڕە چەند مسقاڵە؟

سەیرم بە قسەكەی هات، پێموت: ئاخر قوربان ئەو گۆیەرە زێڕ نیە، تەنەكەیە.

كابرا چاو ئەبڵەق بوو، بەتەوسەوە وتی: چیە دەتەوێ پێمڕابوێری؟ خوشكێ ئەوە زێڕە و عەیار بیست و یەكە، ئەوەتانێ شوێنی مۆرەكەی بەسەرەوەیە.

كە لێیم وەرگرتەوە لەدەروونەوە بەخۆم وت: من ئەو شتەم لەو دوكانەی ناو بازاڕ بە تەنەكە كڕیوە كە هەموو شتەكانی بە تەنەكە دەفرۆشێ.

سەرسام بووم، خەیاڵم دوور ڕۆیی، بیرم كردەوە كە شەش حەوت ساڵ پێش ئەمڕۆ ڕۆژێكیان ئەو ژنەی دراوسێمان كە ئەو گۆبەرە تەنەكەی بۆ شاییەك لێ وەرگرتم بیبات و پاشان بۆمی بگەڕێنێتەوە، ناكا لێی تێكچووبێ زێڕی خۆی لەجیاتی ئەو تەنەكەیە بۆ هێنابێتمەوە، واباشە بچمە لای، چووم لە دەرگای ماڵیانمدا و دەرگای كردەوە، دوای چاك و چۆنی، كە وتی: وەرە ژوورەوە، فەرموو فەرموو یاخوا بەخێربێی!

وتم: ساحێب فەرمووبی و خێرانداربی، ئەوەی ڕاستیبێ هاتووم ئەو گۆبەرەی شەش حەوت ساڵ پێش ئێستا لێت وەرگرتم كە هی من زێڕ نەبوو، تەنەكە بوو كەچی تۆ بەزێڕ گەڕانتەوە، خوا هەڵناگرێ ئەو نامەقیەت بەرامبەر بكەم بچم بەحەلاڵی بیفرۆشم و پارەكەی بخۆم، فەرموو ئەوە زێڕەكەت.

كە وتی: چۆۆۆۆن؟

بەسەرهاتی خۆم و ئەو گۆبەرە تەنەكەم بۆی گێڕایەوە كە هیچم لەماڵ نەبوو بیخۆم بەناچاری پەنام بردە بەر ئەو تەنەكەیە تا بە كەم پارەیەكی بفرۆشم و شتێكی پێ بكڕم و بیخۆم، كابرا وتی: ئەوە زێڕە، تەنەكە نییە.

ژنەکە بەو خەبەرە تاسا، وتی: من کاتی خۆی ئەو گۆبەرەم لیّ خواستی وامزانی هەر بەڕاستی زێڕە، جوان بەخۆمەوە کرد و بەشداری ئەو شاییەم پێکرد کە هاتە پێشیّ، لەویّ لەبەر قەرەباڵغی و جەنجاڵی خەڵکەکە، نەمزانی چۆن ئەو گۆبەرەم لیّ بەربۆوە؟ کیّ بردی؟ نازانم، بۆیە ئەو ڕۆژە دوای گەڕانەوەمان، من گەلیّ خەفەتم خوارد، پیاوەکەم لەگوڵ کاڵتری پیّ نەوتم، وتی: گیانەکەم دڵ لەدڵ مەدە، سبەی دەچمە بازاڕ و گۆبەرەیەکی وەکو ئەو گۆبەرەت بۆ دەکڕم و بڕۆ بۆی ببەوە، ئەوەبوو ڕۆژی پاشتر بەیەکەوە چووینە بازاڕ و لاماندایە دوکانی زێڕنگرێك و ئەو زێڕەمان کڕی و حەزم نەکرد پێتبڵێم زێڕەکەم لیّ بەربۆتەوە و بزر بووە، ئەوەبوو بەبێدەنگی هاتمەماڵتان و زێڕەکەم پێتدا و گەڕامەوە.

منیش پێموت: بڕوا دەکەی هەر ئەو کاتە چۆن لێتم وەرگرت و هەڵمگرت، نەچوومەوە سەری چونکە وا گومانم دەبرد ئەگەر ئەو خزمانە بمبینن تەنەکەم لەخۆم خستووە گاڵتەم پیّ بکەن. فەرموو ئەوەش زێڕەکەت.

ژنەکە وتی: من هەرگیز لەخەیاڵم نەبووە ئەو گۆبەرەی تۆ کە بە منت دابوو تەنەکەبیّ. دەستی بۆ گوارەکانی بەر گوێی برد و لێیکردەوە، ئەلقەیەك و چوار بازنی زێڕیشی لەدەست دابوو ئەوانیشی لەدەست کردەوە، وتی: فەرموو بەرامبەر بەو گۆبەرە بەگەردەن ئازایی دەبیّ ئەوانەم لیّ وەربگری وەئەگینا لێتی وەرناگرم.

چەندی خۆم هێناو برد، بیّ سوود بوو، ناچاری کردم بەرامبەر بەو گۆبەرە ئەوانەی لیّ وەربگرم، بەمەیش هێندە سوپاسگوزاری خوای گەورەم کرد کە من بەتەمای چی بووم، تووشی چی هاتم؟ ئەوەبوو زێڕەکانم بردە بازاڕ و هەموویم فرۆشت تا پیاوەکەم لەحەج هاتەوە هەر لەو پارەیەم خوارد و تەواو نەدەبوو، تەنانەت هەندیّ پارەش مایەوە، ئەو پارەی پیاوەکەم بۆ حەج قەرزی کردبوو، هەر لەو پارەیە هەموو قەرزەکەشیم پێی دایەوە.

* * *

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ( پەروەردگار تەماشای لەش و لار و شێوازتان ناکات بەڵکو تەماشای دڵەکانتان دەکات) (رواه مسلم)

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾﴾ البقرة: ٢١٦

# ✍ کەس نازانێ خێر و شەڕ بەچییەوەیە؟

📖 ژنێکی گەڕاوە بەسەرهاتی خۆی بۆ خوشکەکەم گێڕایەوە، وتی:

✎ شەش حەوت ساڵ بەردەوام دوای نوێژەکان، دەستم بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە، نزام دەکرد، لەخوا دەپاڕامەوە بمکاتە نسیبی کوڕە ئامۆزاکەم کە گەنجێکی تازە هەڵچووی کەڵەگەت بوو کە بێ ئەوەی ڕەوشت و دینی لەبەرچاو بگرم، کوێرانە تامەزرۆی جوانی ببووم، جوانیەکەی سەرسامی کردبووم گێژدەیبم کە لەنێوانماندا هیچ نامە و نامەکاری و پەیوەندییەك نەبوو، دوور و نزیك هەستم بەهیچ خورپە و چرپەیەکی دڵی نەدەکرد ئاماژەبێ کە خۆشمیدەوێت، کەچی منی شێت و شووری هاروهاجیش پێنج فەرزە لەسەر بەرماڵ[9] نوێژو نزام بۆی دەکرد، لەخوا دەپاڕامەوە دڵی نەرم ببێت و بێتە خوازبێنیم و بمهێنێ.

کاتێ هەواڵم پێگەیی کچێکی نەدی و نەناسی مارە کردووە بەتەمایە لەو هەفتەیە بیگوازێتەوە، خەریك بوو دڵم بوەستێ، مردنی خۆم زۆر لەو هەواڵە پێخۆشتر بوو، چووم دەرگام لەسەرخۆم کڵۆمدا[10] ، بەدزییەوە دامە پرمەی گریانێکی بەجۆش و خرۆش، بەکوڵ گریام و کام جنێوی پیسە پێم دا! کام دوعای خراپە لێیم کرد، کار بەوە گەیشت لە خوا یاخی بووم و لێی هەڵگەڕامەوە، هەڵگەڕانەوە لەوە زیاتر چییە؟ لەچکم لەسەر داکەند و فڕێمدا، بەناشوکرییەوە سەرم بەرز کردەوە: خوایە گیان ئاخر چیم کردبوو؟ بۆچی نزاکانمت گیرا نەکرد؟ خۆ من ئەوەندە تەکلیفەم هەبوو ئەویشت جێ بەجێ نەکرد، ئیتر بەینی من و تۆ تەواو ، چیتر نە لێت دەپاڕێمەوە! نەداوای هیچت لێ دەکەم! وازم لەنوێژو ڕۆژوو هێنا.

---

[9] – بەرماڵ: دووگرد.

[10] – کڵۆمدا: شیش دا، قەپات کرد، داخست.

دایکم هێشتا بەم کەین و بەینەی نەدەزانی، ڕۆژێکیان بەشێنەیی هاتە لام، دەستی بەسەرم داهێنا، لەخانەی سوعبەتەوە: کچم دەڵێی بوویتەتە مریشك و لەهێلکە کەوتووی؟ کیشەت چییە؟ ماوەیەکە دەتبینم نوێژ ناکەی؟ شتێك بووەو نایزانم؟ دەی مگەر شتێك هەیە من دایکتم، دەی قسەم بۆ بکە.

منیش بێ پەروا ئەوەی لەدڵم بوو، ئەوەی لەبن بەرە بوو هەموویم بۆ هەڵڕشت، وتم: دایەگیان من ئەوەندە ساڵە نوێژ دەکەم، بەنهێنی، بەچاوی پڕ فرمێسکەوە دەپاڕامەوە ئەو ئامۆزایەم پەنسیب بکات، کەچی ئەو ژنی هێنا و منیش ئەوها مامەوە، کەواتە هیچم بەهیچ نەکرد، ئیدی چیم داوەتە نوێژ و پاڕانەوە و پەرستش؟ تەواو، چیتر سەر بەفەرزی خوا دا ناگرم.

دایکم بەنەرم و نیانی بۆم خنایەوە: هەی پرچ ڕشکن، یانی تۆ ئەوەندە ساڵە تەنها بۆ ئەوە نوێژ دەکەی بۆ ئەوەی ئامۆزاکەت بتهێنێ؟

وتم: بەڵێ من بۆ ئەوە نوێژم دەکرد ئەو کوڕە بمهێنێ، کە دوعاشم کرد و قبوڵ نەبوو تەواو چیتر نوێژ نەکەم مادام لێی پاڕامەوە، بەهانامەوە نەهات.

دایکم بۆ ئاڵوگۆڕ و سەودا سەری ئەو قسانە، گەلێ پێکەنی، سەرزەنشتی کردم لەپڕوپووچی ئەو بیرۆکە و کەللە سەرسەختەی شەیتان بێمە خوارەوە، وتی: کچم ناشوکر مەبە، کەس نازانێ خێر و شەڕ لەچی دایە؟ هەر خوا بەندەکانی خۆی دەناسێ، دەگێڕنەوە: ( پادشایەك لەگەڵ ڕاوێژکارەکەی چووە ڕاوەشکار، ڕۆیشتن، تەواوێ دوور کەوتنەوە، لە شوێنێ وەستان، پادشا وتی: ڕاوێژکار سەرخەوێ دەشکێنم هەست دەکەم چاوم قورس بووە و بۆم هەڵنایێت، ئاگایەکت لەو دەوروبەرەبێ کەی خەبەرم بۆوە، درێژە بەڕاوەکەمان دەدەین.

لەجێوە ڕاکشا، ئەوەندەی نەبرد خەو بۆ خۆی بردەوە، ڕاوێژکار وەکو پاسەوان بەدیار سەریەوە وەستا، کونە مارێك لەو دەوروبەرە هەبوو، دوای قەدەرێ مارێکی لێ دەرچوو، فیشقاندی ویستی بەرەو پادشا بڕواو پێیەوە بدات، ڕاوێژکار شمشێری لەکالان هەڵکێشاو داهاتەوە لەسەری بدات بیکوژێ، مارەکە لەترسان چووەوە کونەکەی.

پادشا لە جیڕە جیڕی شمشمێرەکە خەبەری بۆوە، کە خۆی بەو شێوەیە بینی:ڕاوێژکار چما خەوی منت بەدەرفەت زانی تاوەکو بمکوژی؟

راوێژکارەکە نەختێ سەری لێ بادا، کە باسی خۆیی و مارەکەی بۆ گێڕایەوە، پادشا متەقی نەکرد و تەکانی دایە بەرخۆی، ڕاست بۆوە، کەوتنەوە ڕێ، ڕۆیشتن، کاتێ پادشا کەروێشکێکی بینی ، لەجێوە لێی دارساو ڕاوی کرد، ئەوجا دەستی بۆ چەقۆکەی بەر پشتی درێژ کرد و دەریکرد، ملی کەروێشکەکەی بەدەستە چەپی گرت، بەدەستی ڕاستەی چەقۆکەی بەمل داهێنا، چونکە چەقۆکە زۆر تیژ بوو، بێ ئاگا پەنجەی دۆشاومژەی لەناوەڕاستەوە کەرت کرد.

ئەویش لەجیاتی دڵدانەوە، پێی وت: لەخوای بەزیادبێ، ئیشەڵڵا خێری تێدایە.

پادشا بەتووڕەیییەوە لەتاو ئێش و ژانی دەستی، پێیوت: هەی دەبەنگ، ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی؟

ئەویش بە تەوحەوە گوێی بۆ ڕاگرت و بەهەڵپەیەکەوە: قوربان لەخوای گەورە بترازێ، کەس نازانێ خێر و شەڕ لەچی دایە! کێ دەڵێ بڕینی ئەو پەنجەی تۆ خێری تێدا نییە و ئێمە نایزانین؟

پادشا بەهەڵچوونەوە تێیڕاخوڕی: خێری چی و تەڕەماشی چی، دەی با بڕۆینەوە!

گەڕانەوە کۆشك و پادشا پێیوت: وەرە بۆ هەموو ئەو شتانەی ئەمڕۆ داوای لێبوردن بکە.

راوێژکار بەدەم زەردەخەنەیەکی گەشەوە: من هیچ قسەیەکی خراپم نەکردوە تاوەکو داوای لێبوردن بکەم.

پێیوت: ئاخر داوای لێبوردن نەکەی سجنت دەکەم، تۆ دەزانی ئەمڕۆ چ کارێکت کرد؟

وتی: قوربان بڕیار لەدەستی تۆیە دەتوانی فەرمان بدەی بمکوژن، ئەوەش هەر خێری تێدایە.

ئەویش فەرمانیکرد بەندی بکەن، ڕاوێژکاریان بەند کرد.

ڕۆژێکیان پادشا بەتەنها چووە ڕاو، هەر ڕۆیشت کاتێکی زانی کەوتە بۆسەی هۆزێکەوە کە داب و نەریتێکی تایبەت بەخۆیان هەبوو ساڵانە کۆدەبوونەوە یەکێکیان لە خەڵکی هۆزەکەیان دەکردە قوربانی و سەریان دەبڕی، کە ئەویان بەقۆڵبەستراوی هێنا، وتیان: مرۆڤ هەر مرۆڤە، با بۆ ئەمساڵ ئەو پیاوە بکەینە قوربانی.

دەوریان دا، کابرایەکی کەتەی چوارشانە بەخۆ و تەورێکەوە بەدەوری پادشا دەهات و دەسووڕایەوە، تەماشای دەکرد، کت و پڕ هاواری لێ هەستا: دەی خێرا ئەو کابرایە

بەڕەڵا بکەن، ئەو کابرایە پەنجەیەکی بڕاوەتەوە بەکەڵکی قوربانی نایەت.
ئەوانیش ئازادیان کرد، پادشا لەخۆشیان بەغاردان گەڕایەوە کۆشك و یەکسەر چووە بەندیخانە و بەکابرای ڕاوێژکاری وت: هاااا، هێشتان لەسەر قسەکانی خۆتی؟
وەڵامی دایەوە: قوربان قسەیەکی خراپم نەکردووە، ئیدی بۆ داوای لێبوردن بکەم؟
پادشا ڕوومەتی ماچ کرد و وتی: من منەتباری تۆم و دەزانم کوڕێك باش و گوێڕایەڵ و لەخواترسبیٚ، ناپاکیم دەرهەق ناکا.
ڕاوێــژکار بــەدەم زەردەخەنەیەکــەوە پێیــوت: قوربــان چــیم وت؟زۆر شــت هەیــە تــۆ بەخراپی دەزانی کەچی بەچاکە بۆت دەگەڕێتەوە، بەپێچەوانەوە هەمان شت ڕاستە، ئەو بەندکردنــەی تــۆ بــۆ مــن خێــری تێــدابوو، فــەرموو ئەگــەر مــن لەگــەڵ تــۆ بوومایــە و منیشیان بگرتایە، ئەوە تۆ چونکە پەنجەت بڕاوە و پەنجەی منیش بیٚ عەیبە، ئەوان لە تۆ خۆش دەبوون و منیان دەکردە قوربانی) .
گاڵتــەم بەئــەقڵی دایکــم دەهــات ئەوەنــدە ســاویلکە بــوو دەیویســت بــە یــەك دوو قســە قەناعــەتم پــیٚ بێنیٚ لــەو بڕیــارە پاشــگەز ببمــەوە، ســەرم بــۆی لەقانــد، بــەڵام بەقســەیم نەکرد.
ئامۆزاکەم هەشت نۆ مانگ لەگەڵ ژنە تازەکەی نەحەوایەوە، وەك دەیانگێڕایەوە دانوویان بەیەکەوە نەدەکولا، هەمیشە دەمەقاڵیٚ و شەڕوشۆیان بوو، دەمیان لەیەك سپی ببۆوە، ئەنئاخری بووە شکات و شکایەتکاری، دادگا دوای سیٚ چوار دانیشتنی بیٚ ئاکام، دواجار بڕیاری جیابوونەوەیانی دا.
بەم هەواڵە ئومێدم بۆ گەڕایەوە کە بڵێم: خوای پەروەردگار نزاکانی قبوڵ کردم، ئامۆزاکەم هاتە پێش، خوازبێنی کردم، بۆ هەفتەی ئەولاتر گواستمیەوە..لەو ڕۆژەوە ژیانێکی تازەم لەگەڵی دەست پیٚ کرد، ئەفسووس پیاوێکی سەرەڕۆ و کەللە ڕەق ، قسەی کەسی بەهەند هەڵنەدەگرت، ئارەقی دەخواردەوە، قوماری دەکرد، نیوەی شەو بە سەرخۆشی دەهاتەوە، لەنێوانماندا هیچ سۆز و هەستێکی حەلیم نەبوو، زۆر جار لە خۆڕا دۆ و دۆشاوی تێکەڵ دەکرد و کام جنێو پیس و ناشیرینە بەخۆم و کەس و کاری دەدام، هەتا بۆم لوا دانم بەخۆما گرت، لەئاستیدا خۆم بێدەنگ کرد و کرم چنی

که ناخی خۆم دەخواردەوە، ئەویش بەو قسە نەکردنەی من دەتەقی[11]، هەرچی جارێك بەجواب بهاتمایە، دەبووە فەرتەنە و پەلاماری دەدام، دەتوت: جنۆکە دەستی لێ وەشاندووە و شاگردی شەیتانە، شەڕێکی دەروونی وای لەگەڵ بەرپا کردبووم بێ ئەوەی خەتاباریم.

ئەوەندەی کەس و کاری هەردولا هاتنە بەینەوە، ماوەیەك باش دەبوو، دواتر تێهەڵدەچۆوە، وام لێهاتبوو هەفتەیەك لەلای بووم، دوو هەفتە دەتۆرام و دەچوومەوە ماڵی باوکم، جام پڕ بوو لێی دەڕژێ، کە زانیم ژیان بەو ڕەزالەتە سەر ناگرێ، چونکە منداڵمان نەبوو، قەناعەتی ئەوەم بۆ دروست بوو خۆم بەتەڵاقدان بدەم و خۆم تەلاقدا، بەمەش ئیسراحەتم کرد.

---

[11] – دەگێڕنەوە (ئامە) و (ئۆمەر) هەبوو، ژن و مێردی یەك بوون، (ئامە) زۆر سلسار و بێشەرم و چەقاوە سوو بوو، هەمیشە لەگەڵ ئۆمەری پیاوی دەمەقاڵێ و شەڕی بوو، دانوولەیان بەیەکەوە نەدەکولا، خەڵکی ئاوایی ئەوەندەی سەرزەنشتیان بکەن و پێیان بڵێن: ئێمە لەوەتەی ئێوە دەناسین ئەوە حاڵتانەو شەرمتان بەخۆ نیە بوونەتە خاوەنی برێ منالْ ئەوجا عار ناینن.

(ئۆمەر) دەیوت: من چیبکەم ئامە لەماڵەوە ئەقڵی شتێك نەگرێ، دۆو دۆشاو تێکەڵ دەکات، ئەوجا چاوم دەداتێ هەر دەم هەڵبپچڕم و قسەیەك بکەم، دەمی دەبێتەوە کە ئەوەی بێتە سەر دەمی نایگێڕێتەوە.

کابرایەکی شێتەرۆکە هەبوو ، زۆرجار قسەی وای دەکرد واتدەزانی بیرمەندە، ئێوارەیەکیان چووە لای ئۆمەر و پێی وت: ئەگەر دەتەوێ ئامە بکوژی، تەگبیرت بۆ دەکەم وەرە بەقسەم بکە ژنەکەت چەندە قسەی کرد جوابی مەدەوە، سەگ چەند بوەڕێ دواجار هەر دەبێ لە حەپە حەپی خۆی بکەوێ.

ئۆمەر بەڵێنی پێ دا بەگوێی بکات و بەگوێی کرد.

ڕۆژێکیان لەسەر شتێکی بچووك، ئامە دەمی بۆوە دەستی پێ کردو نەیبڕییەوە، ئەوەندەی چاوی دەدایە ئۆمەر و تالیقی لێدەدا و قسەی پێ دەگوت، ئۆمەر قسەی نەکرد، ئامە کە دەمی شل بوو، بەناچاری بێدەنگ بوو.

ئۆمەر لەخۆشیان هەر ئەو وەختە خۆی گەیاندە لای کابرای شێتەرۆکە و پێیوت: دەزانی ئامەم کوشت؟

ئەویش ئەوەی لەبیرچووبۆوە چ ئامۆژگارییەکەی کردووە، بۆیە بە تووڕەییەوە پێی وت: بابە ئەو بەزمە خۆشە هەی فەرمەسۆنی بێ دین، چۆن دەستت چووێ ژنی خۆت بکوژی؟ لەخوا نەترسای ئەو تاوانەت ئەنجامدا؟

ئۆمەر بەدەم قاقای پێکەنینەوە: ئاخر ئەوهام نەکوشتووە.

کە پرسی: ئەی چۆنت کوشت؟ کوشتن هەر کوشتنە چ بەچەقۆ بیکوژی یان بیخنکێ یا بیسوتێنی.

ئۆمەر وتی: هەی گێلۆکە ئەی تۆ ئامۆژگاریت نەکردم جوابی نەدەمەوە، جوابم نەدایەوە ، بەبێ دەنگی کوشتم.

دوای دوو ساڵ مانەوە، بۆ جاری دووەم شووم بەکابرایەکی نەدی و نەناس کردەوە ئێستا خاوەنی بڕێ منداڵم، بەڵام دڵخۆشم دەبینم پیاوەکەم کەسێکی ڕەوشت بەرزو خواناسی پیاوانەیە، لەگەڵم چاکە، ڕێزی بنەماڵەکەم دەگرێت ، زۆر پەشیمان بوومەوە لەو ناشوکرییەی پێشتر بەرامبەر خوای پەروەردگار کردم، دووبارە دەستم کردۆتەوە بەنوێژ کردن، ئێستاش سەرم بچێ، نوێژم ناچێ.

* * *

﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ ﴾ القمر: ٤٩

مرۆڤ هەر ئیشێکی هاتە پێش و بەرەو پیری هەر ئیشێکەوە چوو، دەبێ لەمێشکی خۆیدا وای دابنێ دەچێتە ڕاوە ماسی، لێرەدا نازانێ ئاخۆ لەو ڕاوەماسیە تەڕ دەبێت یان نا؟ ئەوەش نازانێ ئاخۆ ماسی گەورە دەگرێ یان بچووك؟ یان ئەوەتە هەر بیرای بڕ ماسی ناگرێ؟

🕮 ئازاد مەسیفی بۆی گێڕامەوە وتی:

✎ تەقسیماتی خوای پەروەردگار بێ حیکمەت نیە، هەموو شتەکانی جوان و بێ هەڵەو پەڵەن کە موناقەشە و چەند و چوو هەڵناگرێ: ئەوەتانێ دوو برا دەناسم هەردوکیان چەند سەر بزنێکیان ڕاگرتووە، بزنی یەکێکیان هەرچی جارێك بزێ، کارێك و دوو کاری دەبێ، بزنی برایەکەیشی هەر بەر دەهاوێ و تاقە کارێکی نابێت.

🕮 حاجی ئەنوەر شارەزووریی بۆی گێڕامەوە، وتی:

✎ساڵێکیان مەڕێکم کڕی بیکەمە دابەستە بەو نیەتەی کەی قەڵەو بوو بیکوژمەوە، گۆشتەکەی هێندێکی لێ بکەمە خێر و ئەوەی دیکەیش لەماڵەوە بۆ خۆمان بخۆین.

ئامۆزایەکم هەیە مەڕدارە، ڕۆژێکیان بەسەردان هاتە ماڵمان ، کە گوێی لە باعە باعی مەڕەکە بوو، پرسیاری کرد، منیش پێموت ئەوە مەڕە و بۆ شتێکی ئاوهام ڕاگرتووە.

ئامۆزاکەم وتی: خانووەکەتان بچووکەو جێی ڕاگرتنی مەڕومالآتی نییە، ئەگەر حەزت لێیە من ئەو مەڕە دەبەم و تێکەڵ بەمەڕەکانمی دەکەم، کەی پێتخۆش بوو وەرە بیبەوە.

مەڕەکەمی لەگەڵ خۆی برد، تێکەڵ بە دوو سەد و پەنجا سەر مەڕی خۆی کرد، ڕۆژێکیان چوومە سەردانی و شەو لەلای لەو دەشتە مامەوە، ئەو شەوە لەبێ بەختی

من گورگ پەلاماری ڕانەکەیدا، من و ئامۆزاکەم کەوتینە پاسکردنی مەڕەکان و ڕاونانی گورگەکە، سەیرەکەی لەوەدابوو لەناو ئەو هەموو مەڕە تەنها پەلاماری مەڕەکەی منی دابوو مرداری کردبۆوە، ئەوە تەقسیماتی خوای پەروەردگارە، وەئەگینە خێرە لەو هەمووە مەڕە تەنها پەلاماری مەڕی من دەدات و تەنها مەڕی من دەخوات؟

🕮 **کاک تاهیر سێبەردانی گێڕایەوە وتی:**

✎ پاک و بێگەردی بۆ خوای پەروەردگارە، من سێ پوورم هەیە یەکێکیان حەوت کچ و کوڕێکی هەبوو، کوڕە تاقانەکەی لەگرانیەکەی ساڵی ١٩٩٣چووبووە ئەو هەرەتانەی ڕەبیە و شوێنە قەدەغەکراوەکانی ڕژێم، گوللە هاوەنی هێنابوو سیم و فافۆنی ناوی دەربێنێ و بیباتە بازاڕ بیفرۆشێتەوە، ئەفسووس کە دەستکاری گوللەهاوەنی کرد، پێی تەقییەوە، دەم و دەست کوشتی.. پوورەکەی دیکەم حەوت کوڕ و کچێکی تاقانەی هەبوو سوبحانەڵلاَ لەناو هەموویاندا تەنها ئەو کچەی تووشی نەخۆشی تەلاسیما ببوو، دوای تەمەنێک کە نزیکی چواردە ساڵ ژیا، سەرەنجام گیانی سپارد، پوورەکەی ترم هەر لەبنەوە نەزۆکە و منداڵی نابێ..دایکیشم جیاواز لەو سێ خوشکەی، کۆمەڵێ کوڕ و کچی هەیە، ئەوەیە تەقسیماتی خوا.

* * *



قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾

الإسراء: ٨٢

## ✍بەرەکەتی عومرە لە سەر منداڵە کوردێك ڕەنگدەداتەوە



(مستەفا یەحیا محەمەد) لەدایك بووی ساڵی( ٢٠٠٧)ز، لە شارەدێی (قوشتەپە)ی سەر بەپارێزگای هەولێر لەگەڵ دایك و باوكی دەژێت و پۆلی دووەمی بنەڕەتیە، ئەم منداڵە چاوگەشە بەهۆكارێكی نادیارەوە تووشی هەناسەتەنگی و كۆخە كۆخ بوو، هەشت نۆ دكتۆری پسپۆڕیان پێی كرد لە پزیشكە بەناوبانگەكانی تورك و عەرەب و بیانی و ئەوانەی بەفەرمی لەهەولێر نۆڕینگەیان كردۆتەوە، بە حیساب ئەوانە كەسانی پسپۆڕ و خودان ئەزموون و خاوەنی دەیان بڕوانامە و بۆردی جیهانین ، لەولایەنەوە سەرەڕای گرتنی دەیەها ئەشیعە و ئەنجامدانی دەیان پشكنین تا بزانن كێشە و گرفتی ئەم منداڵە ڕۆح سووكە چیە؟ وەڵامەكان هەموویان یەك شت بوو كە ئەو منداڵە هیچ كێشەیەكی ئەوتۆی نیە و هەموو ئەشیعەكان ئاماژە بەوە دەدەن كە قوڕگی تووشی هەوكردن بووە و چارەسەریشی تەنها و تەنها ئەوەیە ژوورێكی تایبەتی بۆ دابین بكرێت كە بەهیچ كلۆجێ لەو ژوورە نەیەتە دەرەوە بۆ ئەوەی پارێزاوبێ و تۆز و تەم و هەوای دەرەوەی لێ نەدات، تەنانەت مام یەحیای باوكی مستەفا بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەو داخوازییە و بێ ئومێدبوون لە چارەسەری بنەڕەتی نەخۆشیەكە، سەرزەنشتیان كرد كایەكڵ و یاریگەلێكی باشی بۆ بكڕێ كە لەو ژوورەدا خۆی پێوە خەریك و سەرقاڵ بكا و نەیەتە دەرەوە، ئەویش لەماڵەوە ژوورێكی تایبەتی بۆ ڕێك دەخات و دەچێتە بازاڕ بایی پێنج شەش وەرەقە دۆلار لەعابەی بۆ دەكڕێ.

مامۆستا حاجی (شاكر تەها ئیبراهیم مزوری) خاوەنی كۆمپانیای حەج و عەمرە، لە

زمانی ئەوەوە بۆمان دەگێڕنەوە چۆن ئەو منداڵە دەبەنە مەككە و موعجیزە ئاسا بەهۆی ئەو سەفەرە پڕ لە نوور و بەرەكەتەدا خوای گەورە شیفای بۆ دەنێرێت.

✍ حاجی شاكر تەها[12] دەڵێت:

✎ مستەفا و دایك و باوكی لەگەڵ ئەو قافڵەی ئێمە بەرەو ماڵی خوا بەڕێ كەوتین، كاك یەحیا بەو نیەتە منداڵەكەی هێنا، دەیوت: من بەتەواوی لەچارەسەری ئەو منداڵە بێ ئومێدبووم، ئەو هەمووە دكتۆرەم پێی كرد و بێ ئاكام هیچ ئەنجامێكی دڵخۆشكەرم چنگ نەكەوت و پارەیەكی زۆریشم لێی خەرج كرد، خوایەگیان لێت دەپاڕێمەوە بەگەورە و عەزەمەتی خۆت، بەتەمای تۆ ئەو سەفەرە پیرۆزەی پێ دەكەم و دەیهێنم بەڵكو شیفای بۆ بنێری، خوایەگیان شفای بدە.

مانگی ٢٠١٤/٣لەڕێی فڕۆكەخانەی هەولێری نێودەوڵەتیەوە بەرەو سعودیە بەڕێ كەوتین بەڵكو لەتەك بەجێگەیاندنی سەفەری عومرەدا، خوای پەروەردگار شیفای مستەفا بدات، ڕۆژانە پەرستشەكانمان بەجێ دەگەیاند، من چونكە عەرەبییەكەم باش بوو لە مەككەی پیرۆز دەرفەتێك هاتە پێشەوە منداڵەكەم بردە نەخۆشخانەی ئەهلی (عەلەوی مەغریبی)و چوومە لای دكتۆرێك كە عەبدوڵلای ناوبوو، بەهەمان ئەو جیهازانەی لەمەڕ خۆمان ئەشیعە و فەحس و فحوساتی بۆ كرد، لە وەرگرتنەوەی ئەنجامەكاندا بەعەرەبی پێی وتم: ئەو منداڵە تەنێكی نامۆ (جسمێكی غەریب) لەناو جیهازی هەناسەدانیدایە، ئەوە پسپۆری من نییە وەئەگینا نەشتەرگەرییەكەم بۆی ئەنجام دەدا.

ناوی دكتۆرێكی پێدام (هیشام)ی ناو بوو لە نەخۆشخانەی (نور)ی حكومی كاری دەكرد، مستەفام بردە لای، بەدەم پێدانی پشكنینەكانەوە حار و مەسەلەی ئەو



[12] - حاجی( شاكر تەها مزوری) كەسایەتیەكی دیاری مزوورییە، لە شارەدێی بەحركە دادەنیشێت، خێزاندارە و سەرپەرشتیاری پەروەردەییە.

منداڵەم لەنووکەوە بۆی گێڕایەوە، ئەویش بۆ زیاتر دڵنیابوون چونکە خوای گەورە ڕەزای لەسەربوو شیفای بۆ بنێرێ کە سەیری ئەشیعە و سۆنارەکانی کرد و بۆ دڵنیایی زیاتر هەمان شتی بۆ دووبارە کردەوە، سەرەنجام بەدەم زەردەخەنەیەکی گەشەوە وتی: ئەو منداڵە تۆوی گوڵەبەڕۆژە و کودی لەنزیك سیەکانیەوە لەجیهازی هەناسەدانیدایە، شەممە وەرنەوە نەشتەرگەری بۆ دەکەین.

منیش پێم وت: ئاخر دکتۆر گیان ئێمە کوردین، لە حەج و عومرەداین و لێرە سەفەرین.

دکتۆرەکە بەناوهێنانی کورد زۆر ڕێزی گرتین و وتی: دەی کە مادام حاڵەتەکەتان ئاوایە هەر ئەمشەو وەرنەوە سەعات ١٢ی شەو نەشتەرگەرییەکەی بۆ ئەنجام دەدەین.

سوپاس بۆخوا نەشتەرگەریەکەی بەسەرکەوتوویی بۆ ئەنجامدا، دایکی مستەفا لەگەڵی داخیل بوو، ئەو منداڵە چۆن چاك بۆوە، لەوکاتەوە نە دەزانێ هەناسەسواری چیە و نە کۆخە کۆخیەتی.. هەر بۆ زاخاوی مێشك ئەو یەك دوو ڕۆژەی دایکی مستەفا لە نەخۆشخانە لەلای مایەوە، یەك وشەی عەرەبی نەدەزانی، هەر کاتێ موزەمید یان دکتۆرێك بهاتایەتە دیدەنی مستەفا، مۆبایلێکمان لەلای بەجێ هێشتبوو،یەکسەر تەلەفۆنی بۆ دەکردم و مۆبایلەکەی خۆی دەدانێ، لەلای خۆمەوە ببوومە وەرگێڕ، قسەیانم لەگەڵ دەکرد.[١٣]

* * *

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ( هەر کەسێک ببێت بەڕێنیشاندەر و دەلیلی خێر و چاکە ئەوا هەمان پاداشتی خاوەنەکەی بۆ دەنووسرێت ) (أخرجه مسلم)

[١٣] - ئا: شاخەوان عەلی- گ: چرای ڕووناکی- ژ:٧١، س٢٠١٤، ل٢٩

## ❁سۆفیگەری و هەستی شەشەم ....❁

ئەگەر ئێمە لەو تاقیکردنەوانە وردبینەوە کە لەسەر گیانلەبەراندا دەیکەن وەك ئەوەی کاتێ بێچووەکانی پشیلەیەکی دایکانەیان لەدووری ئەودا دەکوشت، ئەو واتا: پشیلەکە ڕادەچڵەکی و دەشڵەژا و هاواری لێ هەڵدەستا. مرۆڤ پەیوەندیەکی ڕوحی بۆ دەدۆزرایەوە لە لای ئەم پشیلەیە (ئەمەیە کە چۆن ئەو هەستەی کاری دەکرد دوور لەبیستن و دیتن؟ بە چ جۆرێك هەست و کاردانەوەی کوشتنی بێچووەکانی دەگوازرایەوە بۆ لای ئەم پشیلە دایکانەیە؟ ئایا جۆرە هەستێکی شەشەم و چاوی سێهەم و پاراسایکۆلۆجیەتێکی لێ بەدی ناکرێ؟) ئەگەر ئەمە لە جیهانی گیانداران بەم جۆرە پەروەردە بووبێ دەبێ لەلای مرۆڤ چۆن ڕەنگی دابێتەوە کاتێ مرۆڤ لەنێوان خەوتن و هۆشیاریدا جاری وا هەیە هەست بەڕووداوەکان دەکات لەنێوان خۆیی و ئەو کەسانەی لێی نزیك و خۆشەویستن.

چاوی سێهەم کە بەو هەستەیان دەگوت کە لە دوورەوەی سەدان کیلۆمەترەوە هەستی بە ڕووداوەکان دەکرد، یان بەهەمان شێوە ناوی هەستی شەشەم بوو، لەسەردەمێك لە سەردەمەکاندا.

ڕوسەکان و ئەمریکیەکان لەکاتی جەنگی سارددا (سیخوڕی) وایان پەروەردە دەکرد کە بەهۆی زانستەکانی پاراسایکۆلۆجیەتەوە زانیاری و نهێنیەکانی سەربازی یەکتر لەیەك بدزن و سوودی لێ وەربگرن، ئەوان زۆر بە گرینگی مەسەلەکەیان وەرگرتبوو دەیانویست پەرە بەم بەهرە و دیاردەیە بدەن کە لەگەڵ ناخی مرۆڤدا دەژی، بەڵام زۆر کەم لەلای هەندێك و لەلای هەندێکی دیکە بەخەستی و هەستپێکراوی ڕەنگی دەدایەوە[14]

بڕادەرێکم زۆر جاران خۆی لەهەموو زانستیەك هەڵدەقوتێ بەوەی کە هەڵەت لێ دەگرێ بەڵام لەڕاستیدا دەیەوێ زانیاریت لێ وەربگرێ، وتی: ئەم هەست و دیاردانە

---

[14] - زانست سەلماندویەتی، کە لە هەر مرۆڤێ هێزێکی دەروونی هەیە کە لە دوو ڕەگەز پێکدێ، ڕەگەزێکی خولقاندن کە لەگەڵ لەدایکبوونیەوە دێت و دەبێ تێیدابێ، ڕەگەزێکی تر بەهەوڵ و کۆشش و مەشقکردن نەش و نما دەکات.

( جیاوازی نێوان ئەمانە و وەلیەکان، جیاوازی ئیمان و پەیڕەوکردنە، کەشفی وەلیەکان بەسادەیی دەبێ و بێ زۆر لەخۆ کردنە، بەڵام کەشفی ئەمانە پێویستی بە مەشقکردنێکی درێژ هەیە).

تازەن.

وتم: نەخێر هەر لەکۆنەوە مرۆڤ باسی کردووە کە لە فرنەوسی دوای مردندا مرۆڤ ئەم هەستەی بەهێز دەبێت و کاتێ بیر لەیەك دەکەنەوە هەست بەیەك دەکەن و یەکتر بانگ دەکەنە شوێنێك و یەکتر دەبینن.. کەواتە لە بەهەشتی خوادا پێویستیان بە تەلەفۆن و مۆبایل نییە ئەم هەستە لەنێو هزر و مێشکیاندا کار دەکات[15]

ئەویش سەری لەقاند وەك ناڕازی بوونێك و ڕەتکردنەوەیەك وتم: کاکە کە ئەو بلووره خڕە شووشەییە کە لە ئەفسانەکانی ئاریاندا خۆشەویستی خۆتی لەنێوانیاندا دەبینی..ئایا خەونێکی هاتووە دیی وەك تەلەفزیۆن و ئەنتەرنێت و فەزایی نیە؟ ئایا مۆبایل ئەگەر لەقوڵایی ناخی ئەقڵی مرۆڤدا نەبوایە بەم جۆرە دروست دەکرا؟[16]

هەر خۆم پێموت: نەخێر کەواتە ئەم هەموو داهێنانە بەتەل و بێتەلانە خەونێکی پاراسایکۆلۆجیانە و پەرەپێدان و ئامێر بەکارهێنان نییە بۆ ئەوەی بتوانی پەیوەندی بەیەکەوە بکات و هەزاران فورسەخ بکاتە یەك مەتری بەرامبەر بەیەك لەکاتی پێویستی بەیەکتردا؟

برادەرەکەم بێدەنگ بوو..بەڵام من بێدەنگ نەبووم و وتم: کاتی خۆشی ئەم پیاو چاکانەی مێژوو باسیان دەکات کە هەستیان بەڕووداو دەکرد یان هەستیان بەو ڕووداوانەی چەندین شار و دێهات کە لێیان دوور بوو دەکرد یان هەستیان بە ڕووداوە ئایندەییەکان دەکرد کە لەلای خەڵك پیرۆز و گرینگ بوون جۆرێ نەبووە لـــە هەستی

---

[15] – ئەدیسۆن فیزیکی ئەمریکی و داهێنەری کارەبا و کامێرا و قەوان بوو کە لێیان پرسی ئایا تۆ بیروبۆچوون بەرامبەر بە بوونی خوا چۆنە؟ لەوەڵامدا وتی: من بڕوام بەبوونی خوا هەیە؟
کە لێیان پرسی: ئەی بۆچی نایبینری؟ وتی: من کارەبام دروست کردوە و زۆر بەباشی ئەو دەناسم بەڵام ناخۆ کارەباکە من دەناسێت و هەست بەبوونم دەکات؟ وتیان: نەخێر. وتی: هەموو دروستکراوێك لەچاو دروستکەرەکەیدا هەروایە.

[16] - لەشەوی (٢٧)ی ڕەجەب، ساڵ و نیوێك پێش کۆچکردن، پێغەمبەر (ﷺ) سواری (بوراق) بوو، شەوڕۆی کرد لە (مەککەی پیرۆزەوە) تا گەیشتە (المسجد الاقصى) لە (فەلەستین) ئینجا لەوێوە سەرکەوت بۆ ئاسمانەکان و لە ئاسمانی حەوتەم (البيت المعمور)ی بینی ئینجا بۆ (سدرة المنتهى) بەرز کراوە، ئینجا بە خزمەت خوا شاد بوو، خوای گەورەی بینی، بەڵام چۆنیەتی دیتنی نەزانراوە، هەر لەو شەوەدا گەڕاوە بۆ (مەککە)، کەچی ئێستا مۆبایل و گواستنەوەی دیمەنەکان بەدەنگ و ڕەنگ لەم سەری دنیا بۆ ئەو سەر، بەڵگەیە بۆ سەلماندنی شەوڕۆی فەخری کائینات کە ئەوسا و ئێستاش خەڵکانێك هەن نکۆڵی لێ دەکەن.

شەشەمێکی بەهێز و پاراسایکۆلۆجیەتێکی گەشاوە.[17]

**لە کتێبی: شێخ عبدالقادر گەیلانی / ئیمامی زاهید و پێشەنگ- وەرگێڕانی: دکتۆر ئیبراهیم ئەحمەد شوان- چاپی یەکەم۲۰۰۳- هەولێر/ کتێبخانەی تەفسیر. ئاماژەی بەچەند بەسەرهاتێکی شێخ (عبدالقادر گەیلانی) کردووە،کە لەخوارەوە گوڵمێکی وەکو خۆی دەینووسینەوە:**

❑ **یەکەم: لە کتێبی (قلائد الجواهر)ی محەمەد کوڕی یەحیای تادفی هاتووە: ( ابو الفرج کوڕی حەمامی گوتوویەتی: زۆر شتم لەبارەی شێخ عەبدولقادرەوە دەبیست و بەڕاستم نەدەزانی، بۆیە حەزم لەبینینی بوو، ڕۆژێ وا ڕێکەوت چوومە (باب الازج) بۆ کارێکی خۆم، کە گەڕامەوە بەپێش قوتابخانەکەی شێخدا ڕەتبووم، لەو کاتە بانگدێرەکە قامەتی نوێژی دەکرد، منیش بەو قامەتە ئەوەی لەدڵم بوو بەبیرم هاتەوە و گوتم: نوێژی عەسر دەکەم و سەلام لە شێخ دەکەم، لەبیرم نەمابوو کە دەستنوێژم نیە، نوێژی عەسری بۆ کردین، هەر کە لە نوێژ و پاڕانەوە بوویەوە، هاتە لام و گوتی: ئەی کوڕی خۆم گەر بۆ مەبەستی جێبەجێکردنی پێویستییەکت هاتووی بۆت پێکدێ، بەلاَم خەفڵەتی بەتەواوی دای گرتووی، بێ دەستنوێژ نوێژت کرد و لەبیرت چوو. ابوالفرج گوتی: سەرم لەحاڵی سوڕما و هۆشی شێواندم.. لەو کاتەوە شوێنی کەوتم و کەوتمە داوی خۆشەویستی و خزمەتکردنی.**

❑ **دووەم: شێخ عبدالله محەممەد کوڕی ابی الغنائم الحسینی گوتوویەتی: لە ڕۆژێکی مانگی حەرامی خوا لەساڵی پێنج سەد و پەنجا و نۆی کۆچی، نزیکەی سێ سەد کەس هاتبوونە سەردانی تەکیەکەی شێخ عوبدولقادر و لەلای کۆڵەگەکانی هەیوانێ دانیشتبوون، شێخ لەماڵێ دەرچوو و هاواری کردە خەڵکەکە: خێرا وەرنە لام، خێرا وەرنە لام، بەخێرایی هاتنە لای، تا هیچ کەسێ لە هەیوانەکە نەما، یەکسەر بانەکە کەوت و خەڵکەکە ڕزگاریان بوو.**

❑ **سێیەم: ئەحمەدی کوڕی زەفەر کوڕی هەبیرە گوتی: لەباپیرم پرسیار کرد کە سەردانی شێخ عەبدولقادر بکەم، هەندێ زێڕی دامێ بیدەمێ، هەر کە لەمینبەر دابەزی سەلامم لێکرد و شەرمم کرد لە ناو ئەو حەشاماتە زێڕەکەی بدەمێ، شێخ گوتی: ئەو**

---

[17] -چاوی سێهەم یان هەستی شەشەم و پاراسایکۆلۆجی -ن: عەبدولخالق سەرسام- گ: پاراسایکۆلۆجی- ژ ۸-س۲۰۰۷- ل۱۱

زێڕەی پێتە هەڵی بگرە و سەلام لە وەزیری باپیرت بکە و پێی بڵێ: عوبدولقادر پێویستی نیە بەوەی ناردووتە، بیگەڕێنەوە بۆ ئەوانەی پێویستیان پێی هەیە.

## له بەسەرهاتەکانی کۆمەڵگەی کوردی:

✍بەسەرهاتی یەکەم:

### کچەکەم دەیزانی ئەو ڕۆژە دەمرێ، تەلەفۆنەکانی مام و خاڵم هەقیقەتەکەیان پشتڕاست کردەوە

✎ سەرەتای ساڵی ٢٠١٣ بوو، کچێکی مامۆستا (حەمەد)ی هاوڕێم بەهۆی ڕووداوێکەوە گیانی لەدەستدا، بەشداری بەخاکسپاردن و پرسەکەیم کرد.

دوای تێپەڕبوونی ماوەیێ چوومەوە سەردانی و خەم و پەژارە و دڵتەنگی خۆمم بۆی دووپات کردەوە.

کاتێ پرسیاری ئەو بەسەرهاتەم لێی کرد، مامۆستا حەمەد خۆی بۆ نەگیرا، فرمێسك لەچاوانیدا فوارەی بەست و بەدەم قوڕگی گریانەوە وتی:

ڕۆژی هەینی بوو، خزمێکمان ژنی دەهێنا وماڵەوەمانی داوەت کردبوو، کچەکەم پۆلی چواری ئامادەیی بوو، کچێکی زیرەك و ڕوح سووك، زۆرم خۆش دەویست، ئەو ڕۆژە بێ ئەوەی ڕووی لێ بنێم، لەجێوە دەستی گەیاندە سۆندە و فلچە و کەوتە شووشتنی سەیارەکە و دەرەوە و ناوەوەی خاوێن کردەوە، من لەبەردەم هەیوانەکە وەستابووم، پڕتاو سەری هەڵبڕی، بەتەسەوە سەیری کردم کە یەکەمجارم بوو بەو شێوەی ببینم، بەدەنگێکی زۆر سەیر پرسی: بابە گیان تەمەنم چەندە؟

کە لێیم پرسی: بۆ ئەو پرسیارە دەکەی کچم ؟

وتی: هەر حەز دەکەم بزانم.

پێموت: تەمەنت پازدە ساڵە.

کە وتی: ئەی کەی دەبمە شازدە ساڵ؟

وتم: پاش دوو مانگ و چەند ڕۆژێ تەمەنت دەبێتە شازدە ساڵ.

سەری داگرت، لەقسەکانم ورد بۆوە، کە سەری هەڵبڕی، وتی: بابە گیان من ناگەمە ئەو کاتە، من دەمرم.

وتم: کچم ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی؟

وتی: بابەگیان بەخوای بەڕاستمە، دەمرم.

خورپەیەکم بەدڵ داهات، تەلەفۆنێکم لەم سەروبەندە بۆ هات مامم بوو، دوای چاك و چۆنی و ئەحواڵپرسین، وتی: کوڕی خۆم لە بەیانیەوە بەداڵغەی ئێوەوە ماوم، نازانم بۆچی ئەوەندەی دەکەم لەبیر خۆمتان ببەمەوە، نامتوانی، بەناچاری وتم: دەبا تەلەفۆنێکیان بۆبکەم، بزانم هیچ نەبووە؟ خۆ کەس نەخۆش نیە؟

بەپێکەنینەوە: مامەگیان شوکر عەیبمان نیە و کەسیش نەخۆش نیە.

ئەویش وتی: سوپاس بۆ خوا.

* دەی مادام وایە وەکیلی سەلامبە، خواحافیز.

+ خوات لەگەڵ، تۆش وەکیلی سەلامبە.

ئەوەندەی نەبرد، ئەوجارەیان خاڵم تەلەفۆنی کرد و هەمان پرسیاری دووبارە کردەوە، هەر بەو شێوە وەلامیم دایەوە: خاڵەگیان شوکر عەیبمان نیە و کەسیش نەخۆش نیە.

لەناخەوە ورووژام، هەستم کرد ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی نائاساییە و شتێك دەقەومێ، ئەو شتە چیە؟ نازانم.

نانی نیوەڕۆمان خوارد، پێش بانگی عەسر خۆمان گۆڕی، سواری سەیارە بووین و بەرەو یانەی (کرێکاران) ی گەڕەکی ئیسکان ڕۆیشتن، جادە چۆڵ بوو، کە گەیشتینە بەردەم یانەکە، سەیارەم لادایە سەر شۆستەکە و ڕامگرت و دابەزین، ئەفسووس دوو گەنجی سەرەڕۆ بەخۆو سەیارەوە کش و ماتی جادەکە بەدەرفەت دەزانن، پێشبڕکێ دەکەن و یەکێکیان هێندە تیژڕەو دێ، سەیتەرەی خۆی لەدەست دەدا، بەسەر شۆستەکە دەکەوێ و خۆی بە کچەکەم دادەدات و جوانەمەرگی دەکات.

ئێستاش هەمیشە قسەکانی ئەو ڕۆژەی کچەکەم بەبیر دێتەوە کاتێك پێی وتم: بابەگیان من ناگەمە ئەو کاتە، من دەمرم... قسەکەی تەواو بوو.

*   *   *

**بەسەرهاتی دووەم:**

**چەندی کردم، دەمویست قسەیەك بکەم، قسەم بۆ نەدەهات**



**(فەرهەنگ عەلی) لەدایکبووی( ١٩٨٥) ە، بەسەرهاتێکی خۆی گێڕایەوە وتی:**

ڕۆژێکیان من و (ڕێکان) ی برام لە جادەی سەد مەتری بە سەیارەیەکی (بی ئێم) جۆری: سلڤەر بەرەو گەڕەکی هەڤالآن دەگەڕاینەوە کە ماڵمان لەو گەڕەکە بوو، لەلای شارەوانی نزیك لەنگە پێش ئەوەی سووڕانەوە بەرەو جادەی بیست مەتری بە چەند خولەکێك ئەوەم هاتە پێش چاو بێ ئەوەی هیچ ببینم ئەوەبوو لەسووڕاوەنەدا ماتۆڕسکیلێ خۆی بەسەیارەکەمان دەکێشێ، بەجۆرێ دەمویست قسە بکەم کەچی زمانی ئەوەم نەگەڕا ئەو قسەیە بە (ڕێکان)ی برام بڵێم.. کاتێ سەیارەکە سووڕایەوە، ڕێك لەو لاوە ماتۆڕسکیلێ پەیدابوو زۆر بەخێرایی دەهات، یەکسەر خۆی بە سەیارەکەمان دادا و لەو پێکدادانە تەنها نەختێ سەیارەکەمان عەدم بوو، شوکر بۆ خوا کابرای خاوەن ماتۆڕسکیل سەلامەت بوو، هیچی لێ نەهات.

کە ئەو قسانەم بۆ ڕێکانی برام گێڕایەوە، تاسا، بەتەوسەوە وتی: ئەی بۆ قسەت نەدەکرد؟

وتم: چەندی کردم، دەمویست قسە بکەم، قسەم بۆ نەدەهات.

* * *

**من و خەڵکی (ئەسینا) نەزانین من دەزانم نەزانم، بەڵام خەڵکی ئەسینا ئەوەندە زانا نین کە بزانن نەزانن.**

**فەیلەسوفی یۆنانی(سوقرات)**

## دایـــــــــــــــــك[18]

خۆشەویستەکەم دایە
بەهەشت لەژێر پێت دایە
پرشنگی ڕووت، ڕووناکییە
لەجوانیدا وێنەت نییە
لەتاریکی ئارامبەخشی
گڕو تینم پێ دەبەخشی
ناخەویت و پاسەوانی
بۆ من وەك سەربازی ونی
کە بەشادیم دڵخۆش دەبی
لەنەخۆشیم دڵتەنگ دەبی
ئامێزی گەرمت دەریایە
میهرەبانیت لەبن نایە
شیری تۆ هەوێنی پاکە
ڕێنیشاندەری ڕێی چاکە
بزەت بۆ من شیلەی هەنگە
تابلۆیەکی ڕەنگاو ڕەنگە
کاتێ سەیری چاوت دەکەم
هەموو شتێ لەبیر دەکەم
دڵسۆزی تۆ، وەك ئاوێنە
لەڕەفتارم خۆت ببینە
تاکوو ماوم بەڵێن دەدەم
دڵی مەزنت بەهیچ نەدەم
شانازییە وەفا داربم............تا مردن خاکی بەرپێت بم
خۆشەویستەکەم دایە............بەهەشت لەژێر پێت دایە

[18] - شیعری: شاخەوان عەلی- دیوانی وەفایەك بۆ تۆ.

قَالَ تَعَالَى:

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

﴿ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الإسراء: ٢٣

**دایك: شوناس و ناسنامه‌ی مرۆڤایه‌تیه، هه‌ڵگری به‌رزترین بڕوانامه‌ی سۆز و میهری كۆمه‌ڵگایه، كه‌سێكه پێش له‌دایكبوونی جگه‌رگۆشه‌كه‌ی ـ ٩ ـ مانگ له سكیدا هه‌ڵیده‌گرێ، به‌رگه‌ی هه‌موو ئه‌و ئێش و ژان و ئازارانه ده‌گرێ كه دوای له‌دایكبوونیشی خه‌و و خۆراك له‌خۆی حه‌رام بكات و شه‌و و نیوه شه‌و، كات و ناكات شه‌ونخوونی به‌دیاریه‌وه بكێشێ.**

**دایك: كه‌سێكبێ شیر بۆ منداڵه‌كه‌ی بگرێته‌وه، پێش ئه‌وه‌ی شیره گه‌رمه‌كه به‌منداڵه‌كه‌ی بدات له‌سه‌ر ده‌ستی خۆی دابنێت و به‌ده‌میه‌وه بنێ، گه‌رمیه‌كه له‌سه‌ر خۆی تاقی بكاته‌وه، پێی خۆشبێ لێوه‌كانی خۆی بسووتێ نه‌وه‌كو ده‌م و دووی منداڵه‌كه‌ی، ده‌بێ شایه‌نی چ مه‌دالیایه‌كی شه‌ڕه‌ف و شانازی بێت؟**

**📖 (ئه‌بو هوره‌یره)(ڕه‌زای خوای لێبێ) ده‌ڵێ: پیاوێك هاته خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) وتی: كێ له‌هه‌موو كه‌س شایسته‌تره من چاكه‌كاربم له‌گه‌ڵیدا؟ فه‌رمووی: دایكت. وتی: پاشان كێی تر؟ فه‌رموی: پاشان دایكت. وتی: پاشان كێی تر؟ فه‌رمووی: پاشان دایكت. وتی: پاشان كێی تر؟ فه‌رمووی: پاشان باوكت[19]**

**خزمه‌تكردنی دایك و باوك وه‌كو تێكۆشانه له پێناوی خوای په‌روه‌ردگار، ئه‌وه‌تا:**

**📖 له (عبدالله)ی كوڕی (عمرو) كوڕی (عاص)(ڕه‌زای خوای لێبێ) وتی: پیاوێك هات بۆ خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) وتی: په‌یمانی كۆچكردن و تێكۆشانت ده‌ده‌مێ و مه‌به‌ستیشم پاداشتی په‌روه‌ردگاره، پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمووی: ( ئایا دایك و باوكت كه‌سیان زیندووه؟) وتی: به‌ڵێ هه‌ردوكیان زیندوون، فه‌رمووی: ( پاداشتت ده‌وێ لای په‌روه‌ردگار؟) وتی: به‌ڵێ، فه‌رمووی: ( كه‌واته بگه‌ڕێره‌وه بۆلای دایك و باوكت و چاك**

---

[19] - عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: جاء رجل الى رسول الله(ﷺ) فقال: من احق الناس بحسن صحابتي؟ قال: امك. قال: ثم من؟ قال: ثم امك. قال: ثم من؟ قال: ثم امك. قال: ثم من؟ قال: ثم ابوك).(بخاري/ الادب/٥٦٢٦)

خزمەتیان بکەو بەباشی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکە[20]

✍بەسەرهاتی یەکەم:

**ئەو کوڕەی دایکی خۆی دەرما نخوارد کرد!**

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( گەورەترین گوناح ئەوەیە یەکێك نەفرەت لە دایك و باوکی خۆی بکات) یارانیش پرسیاریانکرد ئاخۆ چۆن مرۆڤ نەفرەت لەدایك و باوکی خۆی دەکات؟ پێغەمبەری خواش(ﷺ) لەوەڵامدا فەرمووی:( جنێو و قسەی ناشیرین بەباوکی یەکێك دەڵێت و ئەویش وەڵامی دەداتەوە و جنێوەکانی ڕوو بە ڕوو دەکاتەوە، یان جنێو بەدایکی یەکێك دەدات و ئەویش هەمان جنێو ئاڕاستەی دەکاتەوە) (متفق علیه)

🕮 مامۆستا (ساکار بەرزنجی)[21] بۆمان دەگێڕێتەوە:

✎ پیاوێ هەبوو (مام وەلی) ناو بوو لەشاری هەولێر دەژیا، قاوەچی ماڵە ئاغاکانی ناو قەڵات و خوارەوە بوو، خێزانەکەی ناوی (جەواهێرخان) بوو، مام وەلی شەش حەوت ساڵ بوو ژنی هێنابوو، منداڵیان نەدەبوو، دوایی کوڕێکیان بوو ناویاننا (سەرکار).

---

[20] - عن عبدالله بن عمرو بن العاص(رضي الله عنه) قال: اقبل رجل الى نبي الله(ﷺ)، فقال: ابیاعك على الهجرة و الجهاد، ابنتغي الاجر من الله. قال: (فهل من والديك احد حي؟) قال: نعم، بل كلاهما. قال: فتبتغي الاجر من الله. قال: نعم، قال: (فارجع الى والديك فأحسن صحبتهما).( بخاري/ الجهاد/٣٨٤٢)



[21] مامۆستا (ساکار بەرزنجی) ناوی تەواوی (شێخ جەلال سەید حەسەن سەید مەعروف) ە، ساڵی ١٩٣٩لەگوندی (بیرە عارەبان) ی سەر بەقوشتەپە لەدایك بووە، ساڵی ١٩٦٤ لە دائیرەی تەلەفۆنات بە (مەئمور بەداله) دامەزراوە و بەهۆی ڕۆحی شۆڕشگێڕییەوە گەلێ هەوراز و نشێو و دەربەدەری بینیوە. ساڵی ٢٠٠٧ چووەتە ماڵی خوا و بووەتە حاجی، وەکو نووسەرێکی بەسەلیقە، سێ کتێبی بەچاپ گەیاندووە و کتێبی دیکەی ئامادەی چاپن، لەو کتێبانە: یەکەم: سزا و تاوان/١٩٨٥- چیرۆك. دووەم: دیوانی ساکار بەرزنجی/٢٠١٣ شیعر. سێیەم: سەرگوزشتەکانی تەمەنێك/٢٠١٤- بەسەرهات و ڕووداوەکانی کۆمەڵگەی کوردەوارییە.

ماوەیەکی پێ چوو مام وەلی تووشی نەخۆشی سیل هات، ئەو نەخۆشیە بێ چارەسەر بوو، خەڵکەکەیش بۆ چارەسەری توانای ئەوەیان نەبوو بچنە دەرەوەی ولأت، بۆیە ئەوەندەی پێ نەچوو وەفاتی کرد، جەواهێرخان لەسەر کوڕەکەی دانیشت، چەند داخوازی هات، ڕەتی دەکردەوە، دەیوت: شوو ناکەم و تەمای شووکردنەوەم نییە.

دەستی کرد بە نانکەری و خزمەتکاری ماڵان، بەو دەردەسەریە کوڕەکەی پێگەیاند، کوڕە گەورە بوو کاتی ژنهێنانی هات، دایکی بەکاری خۆ و خێری خێرخوازان ژنی بۆ هێنا، سەرکار هەر لەو ماوەیە لەشارەوانی هەولێر دامەزرا، وەکو باوکی تا چەند ساڵێ منداڵیان نەدەبوو، تاوەکو ڕۆژێکیان خێزانەکەی هەستی کرد باری دەروونی نائاساییە، لەچەند جار ڕشانەوە و قێز و بێزکردنەوەی لە هەندێ خواردن، نیشانەی زگپڕی ڕاگەیاند.

سەرکار بەو هەواڵە کەیفساز بوو، لەڕۆژەوە بەخۆیی و دایکی خزمەتی ئەو ژنەیان کرد، تا ژانی گەورەی لێهات و دوو منداڵی جمکیان بوو، ناویاننان (بێزار) و ( هەژار).
ئەفسوس هێندەی پێنەچوو ناکۆکی کەوتە بەینی بووك و خەسوو، ئەگەرچی خەتاکە لەخێزانی سەرکار بوو لەخۆڕا هەنجەتی پێ دەگرت، ڕۆژ نەبوو ئەو پیاوە لەدەوام نەیەتەوە، ئەو نەچێتە بن کلێشەیەوە، زەمی خەسووەکەی لەلادا نەکات.

سەرکار تەواو بێزار ببوو، حەزیشی نەدەکرد دڵی ژنەکەی برەنجێنێ، لەبەر خۆوە بیری دەکردەوە، دەیوت: واباشە ئەو دایکە پیرەم دەرمانخوارد بکەم؟ بەژنەکەی وت: گیانەکەم کەمێ ئارام بگرە، ها بزانە چارەی ئەو خەسوەتم کرد و لەکۆڵ دنیام کردەوە.
خێزانەکەی هەموو سەرە هەفتەیەك ئەو قسانەی بەبیر دەهێنایەوە، دەیوت: هاااا، چیت کردەوە بێزار بووم؟ چیتر باری دەروونی خۆمم پێ ناگیرێ، هەڵدەچم و بەڕوویا دەتەقمەوە.

نەجارێك و دوان و دە، هەر نەیبڕییەوە قەناعەتی پێهێنا بەگژ دایکی دا بچێ و پێی بڵێ: ئەگەر خۆت چاك دەکەی باشە، دەنە دەبێ لەو ماڵە بچییە دەرەوە.

سەرەڕای ئەو خۆشەویستیە زۆرەی نێوانیان، دایکی ناچاربوو تا ئاژاوەی زیاتر ڕوونەدات، بەبێدەنگی باروبنەی تێکنا، ژوورێکی لەو نزیکانە بەکرێ گرت و چووە ناوی، بەڵام هەموو ڕۆژێ دەهاتەوە سەردانی منداڵەکانی سەرکاری دەکرد و گوێی

بەپرتە و بۆڵەی بووکەکەی نەدەدا، ئەویش هەر لە لەوچە لەوچی خۆی نەدەکەوت و لە خراپەکاری و درۆهەڵبەستن بۆی بەردەوام بوو.

تازە دەرمانخانەیەك داندرابوو، پێیان دەوت: دەرمانخانەی مام پۆلیس.. ڕۆژێکیان سەرکار چووە لای، پێیوت: مام پۆلیس سەگێکی هارمان لێ پەیدا بووە ئەگەر هەیە هەندێ ژەهرم بدەرێ بۆی تێکەڵ بەهەویر بکەم و لەکۆڵ دنیای بکەمەوە...ئەویش دەرمانەکەی پێ دا.

بەیانی ڕۆژی دواتر کاتژمێر نۆی بەیانی لەدەوامەوە چووە بازاڕ، دوو شیش کەبابی لەکەبابخانەی شنۆ کڕی و ژەهرەکەی پێداکرد، لە زەرفێکدا بردیەوە ماڵی دایکی و وتی: دایەگیان کەبابم بۆ هێناوی، بۆ نیوەڕۆ چێشت لێ مەنێ.

ئەویش ستایشی کرد: بەقوربانتبم، ئا دەی لەبن ئەو پەڕۆیەم بۆ دانێ، با سارد نەبێتەوە.

ئەویش بەهێواشی کەبابەکەی لەبن پەڕۆکەکەی دانا و گەڕایەوە دایەرەکەی.

کات: دەوروبەری دوازدەی نیوەڕۆ بوو، ژنەکەی هەویری شێلابوو، خەریکی نانکردن بوو، هێشتا زۆری مابوو لێبێتەوە، (بێزار) و (هەژار) وتیان: دایە، دایە برسیمانە.

دایکیان وتی: وادەبینن دەستم گیراوە نەختێ سەبر بگرن وابزانە لێبوومەوە، ئەو وەختە شتێکتان بۆ ئامادە دەکەم

ئەوانیش لەبرسێتی خۆیان، ڕایانکردە لای نەنکیان و پێیانوت: نەنە..نەنە برسیمانە، هیچت لا نیە بمانیدەیتێ؟

ئەویش پەڕۆیەکەی هەڵدایەوە، هەریەکەو شیشێ کەبابی پێدان ، ئەوانیش بەنانەوە خواردیان و چوونەوە ماڵی خۆیان، بەدایکیان وت: دایە خەومان دێ.

ئەویش جێیانی بۆ ڕاخست، کە درێژ بوون، بەتانی پێیان داداو دەستی بەئیشەکانی کردەوە.. کاتێ سەرکار گەڕایەوە، وتی: ژنێ ئەی کوا منداڵەکان؟

* منداڵەکان هەردووکیان نووستوون.

سەرکار لەبەر خۆیەوە وتی: بابچمە لای دایکم، بزانم ماوە؟ مردووە؟

کاتێ چوو تەماشای کرد دایکی هێشتا زیندووە، بەهەڵپەیەکەوە پێیوت: دایە گیان چۆنی؟ چاکی؟ چیە دەڵێی هێشتا کەبابەکەت نەخواردووە؟

دایکی بەدەم پێکەنینەوە پێیوت: کوڕم پێش نیوەڕۆ (هەژار) و (بێزار) هاتنە لام، وتیان: نەنە برسیمانە، منیش کەبابەکەی تۆم دانێ و ئەوانیش عافیەتیان کرد.

سەرکار ڕەنگی تێکچوو، پشتی لەدایکی کرد و بەغاردان ڕۆیشتەوە ماڵێ، کە لچکی بەتانی سەر منداڵەکانی هەڵدایەوە، سەیری کرد هیچیان هەناسە نادەن و هەردووکیان مردوون، ئیتر ما لەسەری خۆی بدات، ژنەکەیشی هات و هەمانی شتی دووبارە کردەوە، خەڵکی ئەو دەروبەرەیان لێ کۆبۆوە، ئەو دەیوت: چیبووە؟ ئەو دەیوت: چ قەوماوە؟

کە چاویان بەتەرمی هەر دوو منداڵەکە کەوت، وتیان: دەی مەوەستن خێرا بیانبەنە خەستەخانە با پشکنینیان بۆ بکەن بزانن بۆچی وایان لێهاتووە؟

خەستەخانەیەکی بچووک هەبوو، بەڕاکردن منداڵەکانیان ڕفاند و بردیان، کاتێ فەحسیان بۆ کرا، دکتۆرەکە وتی: ئەم دوو منداڵە ژەهرخوارد کراون.

داوای ڕاپۆرتی پزیشکی و ڕاپۆرتی پۆلیس کرا، پۆلیس کە بەو وەزعەی زانی، بەسەرکاریان وت: گومانت لە کێ یە؟

سەرکار وتی: گومانم لەکەس نیە.

کە هەمان پرسیاریان لەخێزانەکەی کرد، وتی: منداڵەکانم چووبوونە ماڵی خەسووم، ئەویش لەفەی کەبابی پێ دابوون، گومانم هەیە خەسووم بەدەستی ئەنقەست ئەو کارەی کردبێ.

لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دایکی سەرکار کرد، ئەویش بێ پەروا وتی:کوڕەکەم کەبابی بۆ هێنابووم، منداڵەکانی هاتنە لام، وتیان: برسیمانە، منیش کەبابەکەم لێ بەش کردن و خواردیان، پاشان وتیان: نەنە خەومان دێ، منیش ناردمنەوە ماڵی خۆیان، لەوە زیاتر ئاگام لەهیچ نییە.

هەر لەو لێکۆڵینەوەیە بە سەرکاریان وت: ئەی تۆ ئەو کەبابەت لەکوێ کڕیوە؟

وتی: لە کەبابخانەی عەبدوڵڵا شنۆیم کڕیوە.

دەستەی لێکۆڵینەوە بۆ تاقیکردنەوە چوون هەندێ لە هەویری کەبابەکەیان هێنا، تەماشایان کرد هیچ عەیبی نییە، بەڵام چونکە ژنەکەی سەرکار ئیفادەی دابوو، وتبووی: خەسووم وای لێکردوون...دایکی سەرکاریان گرت.

هەفتەیەکی پێ چوو، سەرکار هەستی کرد بەرانبەر دایکی تاوانێکی گەورەی ئەنجام

داوە و بەدەستی خۆی جەرگی خۆی سوتاند، شەو و ڕۆژ لەو بیرە بوو، هەتا دڵی نەرمبوو، خۆی ڕادەستی دادگا کرد و لەبەردەم دادوەر دانی بەڕاستییەکان دانا، وتی: جەنابی حاکم دایکم گوناهی نییە، من تاوانبارم.

کەبەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، دادوەر دایکی ئازاد کرد و لەجێی ئەودا سەرکاری بۆ پازدە ساڵ زیندانی کرد.

دایکی ئەوەندەی خەفەتخوارد، زۆر نەژیا، بەزگیدا و مرد، خێزانی سەرکاریش کە زانی پیاوەکەی پازدە ساڵ حوکمدراوە، چووە دادگا و داوای جیابونەوەی لێ کرد، ئەویش بەناچاری تەلاقیدا و خێزانەکەی دوای چوار پێنج مانگ دووبارە مێردی کردەوە، مێردی تازەی پیرە دایکێك و دوو خوشکی هەبوو، هەمان کارو ڕەفتاری بەرانبەر بە ئەمانیش دەنواند، بەلاَم ئەو مێردەی ئەوەندە گوێی لێ نەدەگرت و زوو زوو دارکاری دەکرد، تا وایلێهات ژنە بێزار بوو تەنەکە نەوتێکی بەخۆیدا کرد و خۆی سوتاند.

سەرکاریش دوای حەوت ساڵ تووشی گەڕو گولی هات، پێستی سوور دەبۆوە، حەجمانی نەدەما هەتا بەیانی دەستی بەهات و هاوار دەکرد، ئیدی ئەویش بەو دەرد و ئازارەوە ماوەیەك ژیا و هەر لە بەندینخانە بۆ هەتا هەتایە سەری نایەوە.

وەختێ سەرکاریان شاردەوە، ئەو مەلایەی تەلقینی دا، ڕووی کردە خەڵکەکە و وتی: خەڵکینە من لەحەیاتی مەلایەتیمدا گوێم لەو فەرموودەیە بووە ئەگەر منداڵێك زۆڵ و بیژی بوو، وەفای بۆ کەس تەنانەت بۆ دایکی خۆیشی نابێت.(مەبەست لێی سەرکار بوو).

* * *

لەوەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ:

❁یەکەم: دایك لە خێزان لەپێشترە، دەکرێ هاوسەنگی نێوانیان بپارێزین( نەشیش بسووتێ، نە کەباب).

❁دووەم: ناکرێ بۆ کاری خراپە بەگوێیان بکەین لەو کارانەی سەر دەکێشن بۆ دووبەرەکی و ڕق و کینە و جیابوونەوە.

❁سێیەم: چونکە دایك پەروەردەی کردووین، نواندنی هەر بێ ڕێزییەك، نواندنی بێڕێزییە بەرامبەر خوا و پێغەمبەرەکەی، کەواتە هەر خراپەکارییەك بەرامبەر دایك ئەوە

ئێمەین دەبێ باجەکەی بدەین.

✍✍بەسەرهاتی دووەم:

**لەگەڵ دایك و باوكت چۆنبی، منداڵەكانت لەگەڵتدا ئەوها دەبن!!**

📖 **بەسەرهاتێکی کۆنە، هەموومان گوێبیستی بوویتین:-**

✏ باوکێك هەبوو گەلێ خزمەتی کوڕەکەی کرد، کوڕەکەی گەورە بوو، ژنی بۆ هێنا بووە خاوەنی بڕێ منداڵ، باوکیشی چووە ساڵەوە تاقەتی ئیش و کاری نەما، تووشی نەخۆشی بوو، کوڕەکەی وایدەیزانی باوکی پشیلەی حەوت ڕوحە وا بەئاسانی نامرێ، ڕۆژێکیان لەبەر خۆیەوە دەیوت: باوکم تەمەنێکی باشی بەڕێ کردووە، ئەوەندە ناهێنێ مەسرەفی لێ بکەم، ئێستا کاتی ئەوەیە ماڵئاوایی لە ژیان بکات، هیچ شت لەوە باشتر نادۆزمەوە بیبەمە سەر ئەو چیا بەرزەو فڕێی بدەمە خوارەوە.

هەستا خستیە گووشێکەوە[22] بردیە سەر چیا سەرکەشەکەو تاوێ وەستا.. باوکی بە کزۆڵیەوە پێی وت: کوڕەکەم ئەوە خەریکی چی؟

بەدەم هەناسەیەکی ساردەوە پێیوت: من تاقەتی بەخێوکردنتم نیە، لەوە باشترم دەست نەکەوت جگە لەوەی بتهێنمە سەر ئەو چیایە و فڕێت بدەمە خوارەوە هەم تۆ ئیسراحەت بکەیت و هەم منیش ئەوەندە خەفەتت لێ نەخۆم.

باوکی بەدەم فرمێسك ڕشتنەوە: کەواتە چاوەڕێی چی ؟ دەی لەکۆڵ خۆتم بکەمەوە، لەوەشدا ناهەقت ناگرم.

کوڕەکەش بە تەسەوە پێی وت: مەبەستت لەو قسەیە چییە؟

وەڵامی دایەوە: مەبەستم ئەوەیە دەبێ باجی تاوانەکانی ڕابردووم بدەم، چونکە کاتی خۆی لێرە باوکی خۆمم فڕێدایە خوارەوە، دەبێ منیش فڕێ بدرێم، دەی فڕێم بدە و لە کۆڵ خۆتم بکەوە..

کوڕەکەی لەو قسەکانە وردبۆوە، تێگەیشت ئەگەر ئەویش بەو شێوەیە لەگەڵ باوکی بجووڵێتەوە، ئاقیبەتی باش نابێت و هەمان شتی دێتەوە پێش، بۆیە داوای لێبووردنی لە باوکی کرد و بردیەوە ماڵ، تا دوا ساتەکانی تەمەنی، خزمەتی باوکی کرد[23]

---

[22] - گووش: گونیە.

[23] - دەگێڕنەوە: پادشایەك هەبوو بە وەزیرەکانی وت: بڕۆن کام مرۆڤ لەم وڵاتە لەهەمووان ئاقڵترە بۆمی بێنن. کەوتنە گەڕان و سووڕان ، گەنجێکیان دۆزیەوە، بردیانە لای ، پادشا چەند پرسیارێکی لێ کرد، ئەویش بەجوانی وەڵامی دایەوە. ئەویش بەو وەڵامانە دڵخۆش بوو کردیە ڕاوێژکاری خۆی، ماوەیەك ڕابوورد

❁هەمووومان ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) دەزانین کە لەسەردەمی جاهیلیەت ئافرەتێك بەهۆی بەندکردنی پشیلەیەکەوە نەنانی دەداتێ، نەئاو و نەبەرەڵای دەکات تا پشیلەکە دەمرێ، خوای پەروەردگار دەیخاتە دۆزخەوە.

❁لە شاری هەولێر شوفێرێك هەبوو ڕۆژێکیان بەسەیارەوە ڕێی دەکرد، لەدوورەوە سەگێکی بەرچاو کەوت پێیەکانی پێشەوەی لەسەر جادە قیرەکە درێژ کردووە بێ ئەوەی ڕێی لەکەس گرتبێ، بەهەوای هەوەس لەبەر خۆیەوە وتی: تایەی سەیارەکەی بەسەردا دەشکێنمەوە بزانم قەت قاچەکانی ناشکێنم! تیژڕەو هات لێی نزیك بۆوە، سووکانی شکاندەوە سەر و تایەی پێشەوەی بەسەر قاچەکانی سەگەکە دادا، سەگەکە کەوتە پەلەقاژێ و هەردوو قاچی وردو خاش کرد، بەو نواندنە دڵخۆش بوو وەك ئەوەی پاڵەوانەتیەکی گەورەی ئەنجام دابێ.

ڕۆژان ڕۆژیان لەدوایە، ڕۆژێکیان بەهەمان شوێن گوزەر دەکات، ڕێك لەو شوێنەی قاچی سەگەکەی لێ شکاندبوو، تایەی تەقی، بەناچاری وەستا و لەسەیارەکەی دابەزی، جەگی ناو سندووقی دەرکرد، خستیە ژێر سەیارەکە بۆ ئەوەی تایەکەی سەری دەربکات و تایە سپێرەکەی لەجێ دانێ. لەپڕ جگەکە خزا، هەردوو دەستی کەوتە ژێر سەیارەکەو بەمەیش دوای فریاکەوتن و گەیاندنی بۆ نەخۆشخانە، دکتۆرەکان بڕیاریاندا دەبێ دەستی ببڕنەوە ( دەستیان بڕیەوە)

* * *

---

ئەوجارەیان بە وەزیرەکانی وت: ئەوە ئاقڵترین مرۆڤتان دییەوە، ئێستاش بڕۆن بێ ئەقڵترین مرۆڤم بۆ بدۆزنەوە.

وەزیرەکان هەمدیس کەوتنە گەڕان و سووڕان تاوەکو بێ ئەقڵترین کابرایان دۆزییەوە و هێنایان بەردەمی پادشا.

پادشا سەری لێ باداو وتی: من دەمێکە لەناخەوە بڕیارمداوە چ کەسێك ئەقڵدارە خەڵاتی بکەم و ئەوەیشی بێ ئەقڵترین کەسە لەسێدارەی بدەم، دەی خێرا ئەو بێ ئەقڵەم بۆ ببەستنەوە و هەر لەپێش چاومدا هەڵیواسن.

ڕاوێژکار وتی: قوربان نابێ تۆ ئەم کارە ئەنجام بدەی.

پادشا وتی: بۆچی؟ ئەوە من ئەنجامی دەدەم، بزانم چی ڕوو دەدات!

ڕاوێژکار وتی: قوربان ئەو کابرا بێ ئەقڵەی باسی دەکەی کە لەهەموو کەسێك بێ ئەقڵترە، ئەو کەسە باوکی منە، ئەو منی جوان پێگەیاندووە و چی لەدەست هاتبێ درێغی بۆ نەکردووم، بەڵام چی لە باپیرم بکەم کە باوکمی بەو شێوەیە پەروەردە کردووە؟

✍ لەوەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ:

۞یەکەم: مرۆڤ چی بکا، ئەوەی دێتەوە پێش.

۞دووەم: دەکرێ لە خوێندنەوەی ڕابردوومان پەند وەربگرین تا هەمان شت دووبارە نەکەینەوە.

۞سێیەم: ڕازیبوونی خوا لە ڕازی بوونی باوك و دایکدایە، بۆیە پێویستە بەهەموو شێوەك چاکەکاربین لەگەڵیان.

۞چوارەم: مەرج نیە کەسێك هەڵەی کرد، کەسێکی دیکە هەڵەکەی دووبارەبکاتەوە، وەکو کوڕو باوکەو ئاقڵ و کەودەنەکە.

✍✍✍بەسەرهاتی سێ یەم:

**تووڕەیی دایك گەورەیە، هەر دوعایەك بیکات قبووڵە**

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( دوعا لەخۆتان و منداڵ و تیاچوونی ماڵ و سامانتان مەکەن نەبادا بکەوێتە ئەو ساتەوە کە خوای گەورە دوعای تیا وەردەگرێ و قبوڵی دەکات) ( اخرجه ابوداود)

📖پوورە ( حەلیمی مارف) بۆ دایکمی گێڕایەوە، وتی:

✍دوای مردنی پیاوەکەم لەشەڕی هەشت ساڵەی (ئێراق) - (ئێران)، تەنها ئەو کوڕە تاقانەم هەبوو، بەهەزار دەردەسەری و بەردەستی ماڵان پێمگەیاند، گەورەم کرد، کە کاتی خۆی هات ژنێکم بەدڵی خۆی بۆ هێنا، چ ژن؟ عفریتێك بوو چەنەباز، زۆر بلێ، خۆی لەهەموو شتێکی ئەو ماڵە هەڵدەقورتاند، دەتوت لە شەیتانەوە دەرس دراوە، بێ ئەوەی پێی بڵێم: بەری دوو چاوت بڕۆیە، دەی لێرە هەستە، لێرە دانیشە و پێت بەخواری داناوە، هەر لەو گۆڕە دوو چاوی پێم هەڵنەدەهات، لەهەفتەی یەکەمەوە کوڕەکەمی گاڵ دەدا لێمی هەڵگەڕێنێتەوە، بەڵام هەر زوو سنوورێکم بۆ ئەو بێڕێزییەی دانا، بەشێنەیی بەکوڕەکەمم وت:"بابەکەم مەمنوونت دەبم بڕۆ قۆڵی ژنەکەت بگرە و خانوویەك بۆ خۆت بدۆزەوە بچووە ناوی، بەمەش با ئەو ڕێزە بمێنێ کە تا ئێستا لەبەینی من و تۆدا هەبووە"

ئەویش خوا هەڵناگرێ زۆری پێ ناخۆشبوو بەڵام ناچار بوو یان دەبوو ئەو هەڵبژێرێ یان من؟ ماڵی خۆی کرد و چووە ئەو دوورە، ژنەکەی هەر بەوەندە لێی نەگەڕا، ئەوەندەی گوشار خستە سەری، وایلێکرد لەو شارە نەمێنێت و ماڵی بۆ کەرکوك بار بکات.

منێکی کۆڵەوار ئەوەندە شارەزای ئەملا و ئەولا نیم، کوڕەکەم لەنێو دوو مانگ جارێ بەدزی ژنەکەی دەهاتە هەولێر و سەری لێ دەدام.

ورده ورده بەهۆی مەشغەڵەتی ژیانەوە، سەردانەکانی کەم کردەوە، وای لێهات ساڵی جارێ سەردانی دەکردم، کەچی هێشتا خۆشحاڵبووم بەوەی کوڕەکەم سۆز و بەزەیی لەناخدا ماوە و بەیەکجاری پشتی تێنەکردووم. ئاگاداری ئەوە بووم کە سێ کوڕ و دوو کچی هەیە، بەڵام نەمدەزانی منداڵەکانی چۆنن و شێوەیان چۆنە؟ ماوەیەك بەبێ ویستی خۆم غەریبی منداڵەکانیم دەکرد، حەزم لێبوو بیانبینم بزانن من نەنکیانم و ئەوانیش نەوەمن، تەلەفۆنم بۆی کرد: کوڕەکەم چۆنی؟ ئەوە لەکوێی؟

* لەماڵەوەم دایەگیان، من باشم، ئەی تۆ ؟

\+ شوکر عەیبم نیە، ئەوە بەچیەوە خەریکی؟

* بڵێم چی؟ ئیشێك هەبێ دەیکەم، وەئەگینە لەماڵەوە دەرناچم.

\+ سبەی لەماڵەوەی؟

* بەڵێ بەڵێ، لە ماڵەوەم.

\+ ئەی ماڵتان لەکوێیە؟

ناونیشانێکی وردی پێدام، منیش پێموت: بەیانی هەر خوا موقەدەر نەدا، دێمە ماڵتان.

وتی: ئاخر ئەزیەتە و پێویست بەو ماندووبوونە ناکات خۆم لەو ڕۆژانە دێمە سەردانیت.

که وتم: هەر دەبێ بێم و چاوم بەمناڵەکانت بکەوێت....چیتر قسەی نەکرد.

ڕۆژی پاشتر بەیانیەکەی خۆم گەیاندە گەراج و چوومە کەرکوك، بەو ناونیشانەی لێیم وەرگرت، تەکسیەکم بەکرێ گرت منی گەیاندە ئەو نزیکانە، چەند جارێ لەسەر یەك تەلەفۆنم بۆ کوڕەکەم کرد، زەنگەکەی بۆ دەڕۆیشت بەڵام هەڵی نەدەگرت، بەپرسیار لێرە و لەوێ چەند کۆڵانێکم کرد، دواجار گەنجێك ئیشارەتی بە خانووەکەیاندا: پووری ئەوە ماڵیانە و ئێمە دراوسێیانین.

هەنگاوم هەڵگرت، لەپێش دەرگاکەیان وەستام و لەدەرگامدا، ئەوەندەی نەبرد مناڵێکی پێنج شەش ساڵی قاپییەکەی خستە سەر گازەرای پشت و وتی: ئەوە دەرۆزەکەری؟

که وتم: تۆ کێی؟ دایکت و باوکت ناویان چیە؟

ناوی هەردووکیانی هێنا و وتی: ئەوجا بەتۆ چی؟

کە وتم: من نەنکتم، نەنەم.

منداڵەکە خۆی لەگوره نەبرد، بەهەڵپەیەکەوە وتی: ئەی بۆچی دایك و باکم بەئێمە دەڵێن ئێوە نە نەنکتان نەماوە؟

هۆپێکم لەخۆم زانی: ئەی باوکت لەماڵەوەیە؟

* بەڵێ، بچم بانگی بکەم؟

+ پێویست ناکا، من خۆم دێمە ژوورەوە.

دەستەکانی لێ درێژکردم: ئاخر پێمان وتراوە چاومان بەکەسێکی نەناس کەوت یان دەرۆزەکەر، دەرگەی بەڕوودا نەکەینەوە.

+ دەبڕۆ بەباوکت بڵێ دایکت لەهەولێرەوە هاتووە دەیەوێ بتبینێ.

* باشە وادەچم پێی دەڵێم.

چووە ژوورەوە، ئەوەندەی نەبرد هاتەوە بەئاستەم سەری دەرێنا: بیوورە باوکم لە دەرەوەیە، دایکیشم دەڵێ: باوکتان دایکی نەماوە.

ئەوەندەی وت و دەرگاکەی بەڕوو داخستم، لێم بووە مەراق کە نەچمەوە تا چاوم پێیان نەکەوێ، لەپێش دەرگاکە هەڵقونجام بەو نیەتەی ئەگەر چووبێتە دەرەوە، بێشك درەنگ و زوو دێتەوە، کەوتمە چاوەڕوانی، نیوەڕۆ داهات نەهاتەوە، ئێوارە داهات تا درەنگی شەو ، هیچ هەواڵێکی نەبوو، بەناچاری چونکە کەسم لەو گەڕەکە نەدەناسی و کاتەکەیشی هاوین بوو پێم خۆش نەبوو لەدەرگای هیچ ماڵێك بدەم، ئەو شەوەم لەپێش ماڵیان بەسەر برد، بەیانی لەگەڵ جیڕە جیڕی کردنەوەی قاپیەکەیان خەبەرم بۆوە، سەرم هەڵبڕی بینیم ئەوە یەکێك دێتە دەرەوە، کە تەماشام کرد ئەوە کوڕەکەمە، گەلێ دەهری بووم، هەستامە سەرپێ، بەرکەوە پێموت: توو ویژدانت ئەوە پیاوەتی بوو لەگەڵت کردم؟ چما وات لێهات جوابی تەلەفۆنم نەدەیتەوە؟

دەمی وەك تەڵەی تەقیوی لێهات، وتی: چما لەو کاتەوە هەر لێرەی؟

تاگرتم تفێکم کردە چاوی و وتم: هەی ناکەس بەچە، ئەوە بەدەمی خۆت دانت بەوە دانا کە من لەبەیانیەوە لێرەم، کەچی بۆ ئەوەی نەمبینی و بمبەیە ماڵەوە خۆت لەکونجی ژوورەوە بەند کردووە، من هیچ ناڵێم ئەوەندە نەبێ لەو خوایە دەپاڕێمەوە تۆڵەی منت لێ بکاتەوە.

پێم هەڵێنا بگەڕێمەوە هەولێر لەناو سەیارە بووم، جەرەسێکم بۆ هات زانیم تەلەفۆنی

کوڕەکەمە، لەڕقان هەڵمنەگرت، کە دووبارە بۆوە دیسان هەڵمنەگرت، کە سێیەمین جار هەڵمگرت، بەتووڕەییەوە هاوارم کردێ: تۆ کەی دەبیە پیاو؟ بەس بەشەرنی، تۆ......قسەکەم تەواو نەکرد، دەنگەکە کەسێکی تر بوو، وتی: پورێ کەی وەختی ئەم قسانەیە، خاوەنی ئەم تەلەفۆنە سەیارە لێی داوە و مردووە..

گەڕامەوە کە تازە بەتازە تەرمەکەیان هێنایەوە، ژنەکەی منی بینی شێت و هار بوو، تێمڕووبوو: هەموو ئەو شتانە بەوای تۆوە بوو، دەی لێرەت نەبینمەوە.

منیش بەچاوقایمی خۆم، بۆ دواجار چوومە سەر تەرمی کوڕەکەم و ئەملا و ئەولایم ماچکرد، بەدەم گریان و خەم و خەفەتەوە چوومەوە ماڵ.

ئێستاش دوای تەمەنێك ئاه بۆ ئەوە هەڵدەکێشم دەڵێم: خۆزگە نەچوومایەتە لای، ڕاستە ئەجەل بەدەست خوایە، بەلاّم کێ دەڵێ بەوای منەوە وای لێ نەهات؟

*　　*　　*

لەوەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ:

یەکەم: ئەزیەتدانی دایك و باوك یەکێکە لەتاوانە گەورەکان دەبێ خۆمانی لێ بپارێزین.

دووەم: دەبێ دایك و باوك ئاگاداری خۆیانبن دوعاو نزای خراپ لە منداڵ و ڕۆڵەکانیان نەکەن چونکە بە دەقی فەرموودە گیرا دەبێت.

سێیەم: هەر کاتێ زوڵم و خراپەمان لەگەڵ دایك و باوکمان کرد، دەبێ ئەوا باش بزانین کە خوای گەورە لەسەردونیا تۆڵەمان لێدەکاتەوە.

چوارەم: ئەم بەسەرهاتە پێمان دەڵێت: نابێ سیلەی ڕەحم بپچڕێنین لەگەڵ دایك و باوك و ڕووی ڕاستەقینەی ڕوداو و بەسەرهاتەکان بشارینەوەو نەنك لەسۆزی نەوەکەی و نەوەکان لەسۆزی نەنکیان بەدووربگرین.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( هەر کەس هەمیشە دەم بەدوعا و زیکری لێخۆش بوون بێت ئەوا پەروەردگار لەهەموو نارەحەتیەك ڕزگاری دەکات و، غەم و پەژارەکانی دەڕەوێنێتەوە و، لەلایەکیشەوە ڕزق و ڕۆزی بۆ دەنێرێت کەوا خۆی چاوەڕێی نەکردبێت) ( رواه ابوداود)

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَأۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾ الأعراف: ٣٤

# ئەجەل هات ناگەڕێتەوە...

**پێغەمبەری (ﷺ) دەفەرموێ: ( سێ شت شوێن مردوو دەکەوێت، دوانیان دەگەڕێتەوە و یەکێکیان دەمێنێتەوە، خزم و کەس وکار و ماڵەکەی دەگەڕێنەوە، کردەوەکەی دەمێنێتەوە)[٢٤]**

**هەموومان لەجێوە دەتاسێین کاتێك هەواڵمان پێ دەدەن:فلان کەس پێری، دوێنێ، ئەمڕۆ، تاوێ پێش ئێستا، ئەم شەو کت و پڕ گیانی دەرچوو، لەکاتێکدا واماندەبینی هێشتا تەمەنێکی زۆری بەبەرەوە ماوە، کاتی ئەوەی نەهاتووە جاری ماڵئاوایی بکات ، کەچی مرد.**

**لەبەردەم ڕازیبوون بەو شتانەی مرۆڤ بەسەری دێ وەکو بەلاَ و ئافاتی ڕۆژگار و مردنی کەسێکی نزیك ، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ( فاصبر صبرا جميلا) المعارج/٥ واتە هەر کاتێك ئارامگرتنی مرۆڤ ئارامگرتنێکی جوان بوو شایستەی ئەوەیە پاداشتێکی بێشوماری بدرێتەوە، هەروەکو لە فەرمودەی صەحیحدا هاتووە:**

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:( هەر کات ڕۆڵەی بەندەیەك مرد خوای گەورە بە فریشتەکانی دەفەرموێت: ڕۆحی ڕۆڵەی بەندەکەمتان کێشا؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، پەروەردگار دەفەرموێت: گیانی خۆشەویستی هەناوتان کێشا؟ فریشتەکانیش دەڵێن: بەڵێ، ئنجا پەروەردگار دەفەرموێت: ئەی بەندەکەم چی وت؟ دەفەرموون: سوپاس و شوکری کرد و گەڕایەوە بۆ لای تۆ، ئنجا خوای گەورە دەفەرموێت: ( ماڵێك لە بەهەشتدا بۆ بەندەکەم دروست بکەن و ناوی بنێن ماڵی سوپاسگوزاری) ( اخرجه الترمذي وقال حديث حسن)**

**لە شاری کۆیە (مامۆستا مەلا عەلی) هەبوو تا ئەو ڕۆژەی وەفاتی کرد، خوو و خدەی بەوەوە گرتبوو هەر قسەیەکی بکردبایە، سەری زمان و بنی زمانی ئەوەبوو:هەر**

---

[٢٤] - عن انس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): ( يتبع الميت ثلاثة، فيرجع اثنان و يبقى واحد: يتبعه اهله و ماله و عمله، فيرجع اهله و ماله، ويبقى عمله).( بخاري/ الرقاق/ ٦١٤٩).

مردنی تیدا نەبێت.

بۆ نموونە دەیوت: هەر مردنی تێدا نەبێت سبەی بەتەمام بچمە فلان گوند.. هەر مردنی تێدا نەبێت نیەتم وایە سبەی سەردانیەکی ئەو خزمە بکەم.

ڕۆژێکیان تووشی برادەرێکی خۆی بوو، برادەرەکەی لێی پرسی: مامۆستا خێرە بەو شێوەیە خۆت گۆڕیوە؟

ئەویش وەڵامی دەداتەوە: بەتەمای هیچ نیم. هەندێ ئیش و کارم لە پێشە، هەر مردنی تێدا نەبێت بەتەمای سەفەری هەولێرم و هەر مردنی تێدا نەبێت بۆ ئێوارە دەگەڕێمەوە.

ئەویش بەدەم قاقای پێکەنینەوە پێی وت: مامۆستا ئەوە چیە ئەوەندە باسی مردن دەکەی؟ ئەوها مەمانترسێنە ئێمە هێشتا گەنجین و زۆرمان بەبەرەوە ماوە تاوەکو بمرین.

مەلا عەلی پێیوت: کاکە ئەو قسانە باش نیە، مردن لە گەردنی مرۆڤ لەپێشترە[25]

---

[25] – کاك( ڕێبوارصلاح) بەسەرهاتی خزمێکی خۆیانی لە (گڵکەند) بۆ گێڕامەوە، وتی:
میمکزایەکم هەبوو ماوەی چەند ساڵێك بوو لەسەر دەمەقاڵێیەکی بچووك لەگەڵ مامی دووشك بوون (قسەیان لەگەڵ یەك نەدەکرد) دوای ئەوەی چەند کەسێك لەخزمان کۆدەبنەوە، ئاشتیان دەکەنەوە، ئەو میمکزایەم وەك نیازپاکی و دەستپێشخەری خۆی داوا لەمامی کرد بۆ بەیانی بەماڵ و منداڵەوە داوەتی ماڵەوەی بن، ئەویش داواکەی قەبوڵ دەکات. میمکزاکەم ئەو ڕۆژە زۆر خۆشحاڵ بوو، کە هاتە لام وەك هەواڵێکی دڵخۆشکەر پێی وتم: سبەی داوەتی ماڵی مامم کردووە بەتەمام لە ئێستاوە کەرەستەی خواردن و ئەوەی پێویستە بۆ ئەو داوەتە بچمە بازاڕ بیکڕم.
ئەفسووس ئەجەل دەرفەتی پێ نەدا داوەتیان بکات و لەسەر یەك سفرە دوای ئەوەندە ساڵەی قسە نەکردن لەگەڵ ماڵی مامی جارێکی تر کۆببێتەوە، ئەو شەوە بە کەیفسازییەوە خەوت، بەیانی کاتێك خێزانەکەی چەند جارێ بانگی دەکات هیچ وەڵامێك نیە و ناجووڵێتەوە، دەداتە قیژە و هات و هاوار، دیاربوو لەشەوێوە چۆن چووبووە سەر جێیەکەی و چاوەکانی لێکنابوو، بۆ هەتا هەتایە چاوەکانی نەکردەوە.
ڕووداوەکانی ئەجەل ئەوەندە زۆرو زەبەندن هەژمار ناکرێ، ئەو بەسەرهاتانەی لەنزیکەوە بینیومن، لەوانە:
* کابرایەکی موزەمید لەگەڕەکی (٧ی حەسارۆك) لەهەولێر دوای چەند ساڵ پێکەوەنانی پارە و کڕینی پارچە زەویەك کە خانوویەکی بەدڵی خۆی لەسەر دروست بکات، لەناو خانووەکەدا بزمارێکی ژەنگاوی بەپێی دادەچێ، ئەوەندە نەژیا، وەفاتی کرد و خانووە خۆشەکەی دوای خۆی نەبینی.
* لەگەڕەکی (برایەتی) هەولێر کابرایەکی دەوڵەمەند خانوویەکی زۆر خۆش و ڕازاوەی هەبوو وەکو دەگێڕنەوە: بایی سی چل دەفتەر بوو، بەڵام چونکە لە دیکۆڕەکەی بێزار ببوو، حەزی کرد خانوویەکی لەوە خۆشتری لەسەر دروست بکاتەوە، لەبنەوە خانووەکەی تێکدا، وەلێ بەقسمەتی ئەوە نەگەیشت خانووە نوێیەکەی ببینێ، بەیانیەکیان پڕتاو جەڵتە لێ دا، تاوەکو گەیاندیانە نەخۆشخانە، لەنیوەی ڕێ وەفاتی کرد.

مەلا عەلی خۆی گێڕایەوە، وتی: ئەو ڕۆژە سەفەری هەولێرم کرد، دەرەنگی ئێواریٚ گەڕامەوە کۆیە، خەبەریان پێ دام ئەو برادەرەم بەبیٚ ئەوەی عەلەمی لێبێت و نەخۆشبیٚ، کت و پڕ مردووە.

ئەجەل نۆبەتگرتنی مرۆکانە بۆ خۆ ئامادەباشی لە ژیانێکی کاتی بەرەو ژیانی نەمر و هەتا هەتایی، لەکاتێکدا هیچ وەزیر و گزیر و پادشا و گەدا و هەژارێك ناتوانیٚ سەرەبڕی لەو سەفەرە بکات یان خۆی لیٚ بشارێتەوە. هەموو مردنیٚ کە ڕۆژانە دەیبینین و دەیبیستن زەنگێکە بەگوێمان دەدریٚ بۆ ئەوەی ئامۆژگاری لیٚ وەربگرین و بزانین مردن هەقە و بیناسین، کەچی خۆمانی بۆ ئامادە ناکەین. سەرگوزشتەکان بەردەوامیان هەیە، مشتیٚ لەو بەسەرهاتانە:-

✍بەسەرهاتی یەکەم:

**هەر سیٚ خوشکەکەی خنکا، خۆیشی دوای خنکان و مانەوەی بۆ چارەگێك لەژێر ئاودا، زیندو بۆوە**

﴿ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ ﴾ الإسراء: ١٤

✍٦/٢١ ڕۆژێکی نائاسایی خانەوادەی مام (عەلی بۆگدی) بوو، لەماوەی چەند چرکەیەکدا کە منداڵێکی تەمەن یازدە ساڵەکەی نقومی ژێر ئاو دەکەویٚ و هەر سیٚ خوشکە گەورەکەی دەکەونە خۆ لەخنکانی ڕزگار بکەن، براکەیان دوای مانەوەی چارەگێك زیاتر بەخنکاوی لەژێر ئاو دا، نەمردو ئەوانیش هەرسێکیان مردن. کاك ( عەبدوللاَ عەلی ئەحمەد)[٢٦] بەم جۆرە بەسەرهاتی برا و خوشکەکانی بۆ گێڕامەوە، وتی:

تەمەنم دە ساڵان بوو، ١٩٩٦/٦/٢١ کاتژمێر ٢ی پاش نیوەڕۆ ، ماڵەوەمان لە تووتن لێکردنەوە تەواو بوون، دەستیان هەڵگرت ئیسراحەت بکەن و پشوویەك بدەن، باوکم

---

* لەگەڕەکی (هەڵاڵان )ی هەولێر کابرایەك خانوویەکی دروست دەکرد، بەشەو لەبغی دیوارەکەی ئاو دەدا، ئێوارەیەکیان یەك لەماڵە دراوسێکانی لێی هاتنە جواب، بەتووڕەییەوە پێیان وت: ئەوە شەرمت بەخۆ نیە شەوقی ئەو بلاجکتۆرە ڕوو لەماڵمان دەکەی؟

قسەیەك لەم و قسەیەك لەو، دراوسێکەیان دەچێتە ماڵەوە کلاشینکۆفێك دێنیٚ و بەچەند فیشەکێك لەجێوەی سارد دەکاتەوە.

[٢٦] – کاك (عبدالله علی احمد) خەڵکی گوندی( بۆگد)ی سەر بەناحیەی ( ئاشتی) یە، لە٧/ ٥/ ١٩٨٦ لەدایك بووە.

لەسەرەوەی (چاڵگان)[٢٧] بوو، من و (سەرکەوت) ی برام کە بەتەمەن یەك ساڵ لە من گەورەتره، لەتەنکایی دەم زێی (بۆگد) بەیەکەوە بە پەتێك تەبەدۆرمان[٢٨] لەخۆ بەستابوو، چووینە ناو زێیەکە، مەلەوانێمان دەکرد، کت و پڕ پەتی تەبەدۆرەکانی (سەرکەوت)ی برام لەیەك پچڕان، چونکە مەلەوانزانێکی وا نەبوو، لەدووری سێ چوار مەترەوە، کەوتە هات و هاوار: بگەنە فریام، خنکام.

بەدەم هاوار و فیغانەوە دەکەوتە ژێر ئاوەکە و سەر ئاو دەکەوتەوە، تیژی ئاوەکە منی بۆ خوارەوە برد، کە لە خوارەوە لەئاوەکە دەرچووم، تەواو شڵەژام، تاسابووم، دەمم بەش بۆوە، خوشکەکانم ( شنۆ) و (نەورۆز) و (نارنج) کە تەمەنیان لەبیست ساڵ بەسەرەوە بوو، سەرەتا نەورۆزی خوشکم بەدەم گریانەوە خۆی بەئاوەکە داداو لێی چووە پێش، دەستی سەرکەوتی گرت لەئاوەکەی دەربێنێ، سەرکەوت خۆی پێوە گرت، نەورۆز نەیتوانی ڕزگاری بکات کە پێیەکانی خزا کەوتە ژێر ئاوەکەو خنکا، بەدوادا نەورۆز هات ئەویش هەمان شتی بەسەر هات و نارنجیش کە خۆی بەئاوەکە دادا، ئەویش نەیتوانی قوتاری بکات و نەهێڵێ بخنکێ، ئەویش نقوم بوو. سەرکەوتیش کەوتە ژێر ئاوەکە و نقوم بوو.

دایکم کە ئەو دیمەنەی بینی، بەلەخۆدان هات و لەجێوە بەربۆوە چەکی دەست و پێی شکا، باوکم و کابرایەکی دراوسێمان تەقەیان بەئاسمانی ئەو دەوروبەرە کرد وەك ئامارژەیەك بەخەڵکی ئەو نزیکەی ڕابگەیەنن شتێکی گەورە قەوماوە، ئەوەندەی نەبرد خەڵکێکی زۆر خڕ بۆوە، چەند کەسێکی مەلەوانزان خۆیان بەئاوەکە دادا و کەوتنە گەڕان و سووڕان بەناو ئاوەکە، توانیان تەرمی هەرسێ خوشکەکەم بدۆزنەوە و لەئاوەکەی دەربێنن، بەڵام چەندی هەوڵیاندا هەناسەیان بۆ بگەڕێننەوە، هیچیان پێ نەکرا.

سەرکەوتی برام دوای چارەگێ زیاتر کە لەژێر ئاوەکە مابۆوە، لەشوێنێکی نزیکی ئاوەکە دارێکی زل و ناقۆڵای لێ ڕوا بوو، ئاوەکەی تیژ و گێژەن بوو، سەرکەوتی برامی فڕێ دایە سەرەوە، بەمەش کاتێك دەریانکرد و ڕایانکشاند، بەدەست فشاریان

[٢٧] – چاڵگان: ئەو شوێنەیە کە بەهۆی غەسالەوە بەمەبەستی دەرهێنانی قوم و چەگل چاڵ دەبێت و ئاوی زێی تێدا کۆ دەبێتەوە.

[٢٨] – تەپەدرۆ: تەبەدۆر، ( فلینە)یشی پێ دەڵێن.

خستە سەر زگ و سینگی داهێنا بزانن مردووە یان نا؟ هەندێ ناو لەدەمیەوە دەرچوو، هەناسەی بۆ گەڕایەوە، ئێستاش دوای تەمەنێك لە (تەق تەق) ژیان بەسەر دەبات و خاوەن خێزانە.

✍✍بەسەرهاتی دووەم:

## ئەجەل هات هەموو دنیا هەستێ ناگەڕێتەوە

﴿ مَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأَتٍۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ۝ ﴾ العنكبوت: ٥

🕮 **كاك (شاخەوان صدیق)** [29] **بۆی گێڕامەوە وتی:**

✎ ڕۆژێکیان لە سولحێکی عەشایەری لای خۆمان دانیشتبووم، گوێم هەڵخست، کابرایەکی دنیا دیتەی بەتەمەنی نێو مەجلیسەکە بەسەرهاتێکی واقعی ئەو سنوورەی گێڕایەوە هەموومانی بێدەنگ کرد، وتی:

براینە ئەگەر بای ئەجەل هەڵیکرد هەموو دونیا هەستێ ناگەڕێتەوە، کەس ناتوانێت بەری پێ بگرێ، سەرەتای ئەم ساڵ [30] لەسەر زێی بچووك [31] خێزانێك بۆ گەشت و گوزار و هەواگۆڕکێ و کەیف و خۆشی خۆیان لەبەردەم کەناری ئەو ڕووبارە دادەنیشن و بەقسە و باسەوە نقومی دنیایەکی پڕ ئەرخەوانی دەبن، بەکڵۆجێ خافڵبوون، لەبێ ئاگایی خۆیاندا منداڵێکی تەمەن دوو سێ ساڵەیان کەوتە ئاوەکە،



[29] - كاك شاخەوان صدیق لەدایکبووی ساڵی ١٩٧٧ی گوندی (شیواشۆك)ە و خێزاندارە، لەشارۆچکەی (تەق تەق) دادەنیشێت.

[30] - سەرەتاکانی ساڵی(٢٠١٤)

[31] - زێی بچووك : چیاکانی قەندیل و لاجان بەسەرچاوە سەرەکیەکانی ئەم زێیە و لقەکانی دادەنرێت، لەچەند لقێکی بچووك پێکهاتووە لە نزیك گوندی ماشان دێتە خاکی هەرێمی کوردستانەوە، بەشێوەیەکی سەرەکی لە یەکگرتنەوەی چەمی تبت و چەمی ماوەت( قەڵاچوڵان) پێك دێت. زێی بچووك دەشتەکانی پشدەر و قەڵادزێ دەبڕێ و بەدەربەندی دوکان تێدەپەڕێ، لەوێدا بەست و بەنداوی لەسەر دروست کراوە، ڕێڕەوی ڕووبارەکە بەرەو باشووری ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە بە شارەدێی (تەق تەق) و (پردێ) تێدەپەڕێ تا لەدووری٢٠کم لەباشووری شەرقاتەوە دەڕژێتە ڕووباری دیجلە.

ئاوێکی قووڵ کە ئەپیاوەکە و ئەژنەکە هیچیان مەلەوانیان نەدەزانی و نەیاندەزانی پەنا ببەنە بەر کێ و ڕوو لەکوێ بکەن؟

ژنەکە دایە قاژو قیژە، بەدەنگ هەڵبڕینەوە هاواری دەکرد: تکایە بگەنە هانامان منداڵەکەمان خنکا، توخوا یارمەتیمان بدەن، فریامان بکەون.

دوو گەنج لەو کاتە کەمێك لەخوار ئەوانەوە خەریکی مەلەوانێ بوون، کە گوێیان لەو دەنگ و دۆیە بوو، بەپەلە لە ڕووبارەکە دەرچوون و بۆ سەرەوە هەڵکشان، خۆیان گەیاندە ڕاست منداڵەکە و خۆیان بە ئاوەکە دادا، یەك لەو دوو گەنجە بەپەلە منداڵەکەی ڕزگاری کرد.

ژن و پیاوەکە بە ڕزگاربوونی منداڵەکەیان خۆشحاڵ و شادمان بوون، سوپاسی گەنجەکەیان کرد.

گەنجەکان خۆیان گۆڕی بڕۆنەوە، باوکی منداڵەکە ڕووی تێکردن و وتی: قەت دنیا هەستێ ئەم ئێوارەیە میوانی منن، ناهێڵم بەهیچ لایەك بچن.

یەك لە گەنجەکان وتی: ئاوەدانبێ، لەماڵەوە چاوەڕێمان دەکەن.

باوکی منداڵەکە وتی: دنیا قاتی نەبووە ئەوە تەلەفۆن، فەرموو تەلەفۆن بۆ ماڵەوە بکەن و پێیان بڵێن دوای نانخواردن دێینەوە.

ئەوانیش بەتەلەفۆن ماڵەوەیان ئاگادار کردەوە..لەوێ نانیان خوارد، چایان خواردەوە، کاتێك خواحافیزیان کردو ویستیان بەو سەیارەی پێی هاتبوون سوار ببن و بگەڕێنەوە، ئەو گەنجەی منداڵەکەی لەخنکان ڕزگار کردبوو، بەگی لێ دا، بێ ئاگا نەیزانی هەمان ئەو منداڵەی کەوتە ئاوەکە وا لە پشتەوەی سەیارەکە وەستاوە، ڕێك بەسەر منداڵەکە کەوت و کوشتی.

گەنجەکە هەستی بەشەرمەزارییەکی زۆر کرد، گەلێ خەفەتی خوارد کە تاوانێکی ئاوا گەورەی ئەنجام داوە، تاوانێك حەزی پێ نەدەکرد و ویستی لەسەر نەبوو.

باوکی منداڵەکە بەدەم بزەییەکەوە پێی وت تکاتان لێ دەکەم خۆتان دڵتەنگ مەکەن وابزانن هیچ نەبووە، بڕۆن خواتان لەگەڵ من هیچم لەگەڵتان نیە، دیارە قسمەتی ئەو منداڵە لەم ژیانە هەر ئەوەندەیە، تەمەنەکەی لەئەزەلەوە بۆ دانراوە کە دەبێ ئەوەندە بژێ، بۆ تەواو بوونی تەمەنەکەیشی تۆ بێی بەهانایەوە لەخنکان ڕزگاری بکەیت و دڵمان خۆش بکەی و هەر لەسەر دەستی تۆش کۆتایی بەژیانی بێت.

هەردوو گەنجەکە بەخەمباری و دڵی تەنگەوە ئەو شوێنەیان بەجێهێشت و گەڕانەوە.

هەروەها مامۆستا (فخردین صدرالدین حمد)[32] بەسەرهاتێکی هاوشێوەی سەرەوەی بۆ گێڕامەوە، وتی:

سالّی (١٩٨٨) کابرایەك خنکابوو، بەزێی بچووك داهات، هاتە خوارەوە تا گەیشتە ڕاست گوندی (کانی بی)[33]

چەند گەنجێکی گوندی خەریکی مەلەکردن دەبن، کە چاویان بەتەرمێك دەکەوێت بەو ئاوەدا دێتە خوارێ، بەپەلە دەیگرنەوە و لەئاوەکەی دەردێنن. دەست دەکەنە سەر سینگی و فشاری دەخەنە سەر، کابرا بەهۆش خۆی دێتەوە، بەسەرسوڕمانەوە لێیان دەپرسێ: ئێرە کوێیە؟ بۆچی من لێرەم؟ کێ منی هێناوەتە ئێرە؟

بەهۆی قرچە قرچی گەرمای هاوینەوە، گەنجەکان هەڵیدەگرن و دەیبەن لەژێر کەوڕێکی دادەنێن بۆ ئەوەی نەختێك بحەسێتەوە و خۆرە گەرمەکەی لێ نەدات، یەك لەگەنجەکان لێی دەپرسێت: کاکە خەڵکی کوێی؟

لە وەڵامدا پێیان دەڵێ: خەڵکی دوکانم.

ئەوانیش پێی دەڵێن: شوکر وا هۆشت هاتەوە بەر و لەخنکان ڕزگارت بوو، ئەوجا ئێمە دەڕۆین.

گەنجەکان ئەوەندە دوور نەکەوتنەوە، کەوڕەکە بەسەر کابراکە داتەپی و کوشتی، ئێستایش ئەم بەسەرهاتە بۆ ئەجەل لەو گوندە بەنموونە دەگێڕنەوە.[34]



[32] - مامۆستا (فخرالدین صدرالدین حەمەد) لەدایکبووی ١٩٧٥/٧/١، خێزاندارە و کەسێکی بیرمەند و ئەکادیمی هاوچەرخە و مامۆستایە لە قوتابخانەی( سەربەستی بنەڕەتی نێواران)

[33] - گوندی کانی بی سەر بە شارەدێی (ئاشتی) یە.

[34] - تۆپی پێ یەکێکە لە خۆشترین و بەچێژترین یاری وەرزشی کە لەجیهاندا زۆرترین جەماوەری هەیە بەڵام بەردەوام ئێش و ئازار و ڕووداوی دڵتەزێنی لێ کەوتۆتەوە وەکو( شەڕو پێکدادانی هاندەران- کەوتن و ڕووخانی پلیکانەی دانیشتن و مردنی کت و پڕی یاریزان لەگەرمەی یاری و...هتد).

## بەسەرهاتی سێیەم:

### چۆن پرسەکەیان بووە دوو پرسە؟

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (پەروەردگار وادەی مردنی هیچ کەسێك دواناخات کاتێك ئەجەلی هات، زیادبوونی تەمەنیش بەهۆی وەچەی باش و ساڵحەوەیە کە پەروەردگار دەیبەخشێت بە بەندە و، وەچەکان دوعای خێری بۆ دەکەن لەدوای خۆی**

---

لەگرنگترین ئەو رووداوانەی بوونەتە هۆی لەدەستدانی چەندین یاریزان و هاندەر و وەرزش دۆست لە مێژووی کارەساتە بەناوبانگەکانی وەرزش، لەوانە:

**کارەساتی یەکەم:**

لە٦ی شوباتی ١٩٥٨ یانەی مانجستەر یونایتدی ئینگلیزی ، بەبۆنەی سەرکەوتنی بۆ قۆناغی پێش کۆتایی گەڕی یانەکانی ئەوروپا کە بە ٣ گۆڵ لەگەڵ یانەی ئەستێرەی سوری بەلگراد (پاڵەوانی یۆگسلافیا) بەرامبەر بوو، چونکە ئەم یانەیە (مانجستەر یونایتد) لەیاری یەکەمیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو بە گۆڵێکی بێ بەرامبەر و سەرکەوت بۆ ئەو قۆناغە، بۆیە لەکاتی گەڕانەوەیان لە یۆگسلافیاوە بەرەو بەریتانیا، لەناو فڕۆکەکەدا خەریکی ئاهەنگ گێڕان دەبن، فڕۆکەکە لەشاری میونیخی ئەڵمانی دەوەستێ بۆ وەرگرتنی بەنزین، بەڵام لەکاتی هەڵسانی لەو فڕۆکەخانە، لە کەش و ئاو و هەوایەکی ناخۆش و بەفراویدا فڕۆکەکە لە کۆنترۆڵی فڕۆکەوانەکە دەردەچێت و خۆی بە یەکێك لە کۆشکەکانی فڕۆکەخانەکە دەکێشێت و دەکەوێتە خوارەوە، بەمەیش ٢١ کەسیان گیان لەدەست دەدەن لەوانە ٣ کەسی دەستەی بەڕێوەبەری یانەکە و ٨ ڕۆژنامەنووس و ٨ یاریزان.

**کارەساتی دووەم:**

لە ٩ی کانوونی یەکەمی١٩٨٧ لە وڵاتی پیرۆ کاتێك یانەی(پانزالیما) کە یەکێکە لەیانە بەناوبانگەکانی پیرۆ پاش ئەنجامدانی یاریەکەی لەکاتی گەڕانەوە بۆ شاری(لیما) لەڕێگادا فڕۆکەکە دەکەوێتە خوارەوە و هەموو سەرنشینەکان ناوی گیان لەدەست دەدەن کە فڕۆکەکە ٤٣ کەسی تێدابوو، لەنێویاندا ١٧یاریزان و٨کەس لەدەستەی بەڕێوەبەری یانەکە و ٣ناوبژیوان و چەند هاندەرێکی یانەکە.

**کارەساتی سێ یەم:**

لە ٢٨ ی نیسانی١٩٩٣ کاتێك هەڵبژاردەی زامبیا لە دورگەی(مۆریشیۆش) یاری لەگەڵ هەڵبژاردەی(مۆریشیۆس) ئەنجام دەدا و بەفڕۆکەکەیان لەگەڕانەوە بەرەو سەنگاڵ بەڕێ دەکەون تاوەکو یاری لەگەڵ هەڵبژاردەکەیان ئەنجام بدەن لەمیانی پاڵاوتنی جامی جیهانی دا، فڕۆکەکە لە(لیبیرڤیل) بۆ وەرگرتنی بەنزین دەنیشێتەوە، پاش هەڵسانی بە ١٠خولەك لەفڕین فڕۆکەکە دەکەوێتە ئاوی دەریای ئەتڵەسی و هەموو سەرنشینەکانی ناوی گیان لەدەست دەدەن کە پێکهاتبوو لە ١٦یاریزانی هەڵبژاردەکە و ٢ کەس لەدەستەی بەڕێوەبەری هەڵبژاردەی زامبیا و سەرۆکی یەکێتی تۆپی پێی ئەو وڵاتە و ژمارەیەك ڕۆژنامەنووس.

و ئەو دوعایەش شوێنی دەکەوێت بۆ نێو گۆڕەکەی ئەمەیە زیادبوونی تەمەن))(اخرجە ابن ابي حاتم)

✍ وەکو سەرپەرشتارێکی کارگێڕی پەروەردەیی، مانگی ٢ی ٢٠١٤لە شارەدێی (شەمامك) سەردانی قوتابخانەی(پیرداوی بنەڕەتی)م کرد، لە جیاتی بەسەرکردنەوەی پۆلەکان و دیتنی مامۆستایان بەمەبەستی ئاگاداربوون لەئاستی زانستی قوتابیان و ڕادەی پابەندبوونی مامۆستایان بە ڕێنماییەکان، سەردانی پۆلی سێیەمم کرد دیمەنێك لەناخەوە هەست و نەست و ویژدانی هەژاندم کاتێ لەسەر یەك لە ڕەحلەکان بەپڕی ڕەحلەکە گوڵیان دانابوو بەبێ ئەوەی کەس لەسەر ئەو ڕەحلەیە دانیشێ، بەتەوسەوە پرسیاری ئەو تاجە گوڵینەم کرد.

مامۆستاکە هەڵیدایێ: ئەوە شوێنی دانیشتنی (شالآو) بوو، لەگەڵ ماڵەوە چووبووە سەر قەبران و بەو سەیارەی پێی ڕۆیشتبوو کاتێك لەسەر قەبران سایەقەکە دەداتە بەگ و دەکشێتەوە، بێ ئاگا بەسەر ئەو قوتابییە دەکەوێ و جوانەمەرگی دەکات.

زۆر دڵم بۆی سوتا، ئاهێکی قووڵم هەڵکێشا، کەچوومە ئیدارە و پرسیاری ئەو ڕووداوەم لە مامۆستا (صلاح الدین)[٣٥] بەڕێوەبەری قوتابخانەکە کرد، بەمەڵپەیەکەوە وتی:



پەپوولەی کۆچکردوو ( شالآو شێروان خورشید) لە ٢٠٠٥/٢/٥لەیەك لە گوندەکانی سەر بەم دەڤەرە لەدایك بووە، بەخاوخێزانەوە لێرە دەگیرسێنەوە، شالآو قوتابییەکی ژیر و زیرەك و لەسەرخۆ بوو، ئەفسووس مەرگ هاتە سەر ڕێی لەکاتێکدا لە٢٠١٤/١/٢٧ باپیری کە کەسایەتیەکی دیارو خاوەن دیوەخان و پیاوی تەنگانە کۆچی

---



[٣٥] - مامۆستا (شێخ صلاح الدین محمدامین حەسەن) لەدایکبووی ١٩٥٧/٧/١ لەهەولێر دادەنیشێت، خێزاندارە و لەشارەدێی شەمامك بەڕێوەبەری قوتابخانەی پیرداودی بنەڕەتیە.

دوایـی دەکـات، پـاش تـەواو بـوونی پرسـەکەی، وەکـو داب و نـەریتی کـوردەواری، لـە٢٠١٤/١/٣٠ لەچـوارەمین ڕۆژ لەگـەڵ تـەواوی خانەوادەکـەی سـەردانی گـۆڕی بـاپیری لەگۆڕستانی پیرداود دەکات، لەکاتی دابەزینی لەو ئۆتۆمبێلەی پێی هاتبوو، مەرگ مەودای نەدا کەوتە ژێر هەمان ئەو سەیارەی پێی ڕۆیشتبوو، گیانی سپارد، ئەوەش بۆ مامۆستا و قوتابیانی قوتابخانەکەمان ڕۆژێکی ناخۆش بوو تووشی شۆکی کردین، قوتابیانی پۆلەکەی بۆ دەربڕینی هەست و پەژارەیان بۆ ئەو ڕووداوە، چەپکە گوڵی وەفاداری و ڕێز لەجێی ئەو پەپولەیە دادەنێن

❁ ❁ ❁

**بۆ زانیاریت:**

سەرنج بدە...

خودای پەروەردگار کاتێك باسی حوشترمان بۆ دەکات، ڕێنموونیمان دەکات کە لەو گیانەوەرە ورد ببینەوە بزانین چۆن دروست کراوە؟ وەکو دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾﴾ الغاشية: ١٧

بەپێی ئەو بەدواداچوون و لێکۆڵینەوانەی لەسەر ئەم گیانلەبەرە کراوە، گەیشتوونەتە ئەو ڕاسـتییەی کـە حوشـتر گیانەوەرێکـە بـۆ مـرۆڤ وەك دەزگایـەکی خێرخـواز وایـە، پـان و پۆڕییەکەی: سێ مەتر درێژ و دوو مەتر بەرزە و نزیکەی چل ساڵ دەژێ و بەخێرایی بیست و چوار کیلۆمەتر لە سەعاتێك دەبڕێ بەکڵۆجێ خوای پەروەردگار دەم و پێی داوەتێ، پێیەکانی لە لمی بیابانەکان ناچەقێ و درك و داڵیش ئازاری لێوەکانی نادات و لەماوەی دە خولەکدا نزیکەی سەد لیتر ئاو هەڵدەقوڕێنێ و توانای ئەوەی هەیە تاوەکو یەك مانگ بەبێ ئاو بژێ.

خێرخوازی ئەم گیانەوەرە لەوەدایە:

**یەکەم:** لە ژینگەیەکی سەخت و دژواردا لە بیابانە وشکەکان گوزەر دەکات، بۆ سواربوونی مرۆڤ بەکاردێت و هەر کەل و پەل و ئەرك و بارێکی قورسی پێ بسپێرن، بەبێ ماندووبوون جێبەجێیان دەکات.

**دووەم:** لەگەرمای هاویندا مرۆڤ لەژێر سێبەرەکەی دادەنیشێ و دەخەوێ و دەحەسێتەوە.

**سێیەم:** مرۆڤ سەری دەبڕدرێ و بۆ خواردن سوود لەگۆشتەکەی وەردەگرێ.

**چوارەم:** شیرەکەی بۆ خواردنەوە بەسوودە و مووەکەی بۆ کەل و پەل و عەبا و جانتا و چادر و پێڵاو بەکاردێ.

**پێنجەم:** ئەو ئاوەی لەناو زگی حوشتر خەزن کراوە، ئاوێکی موعەقەم و پاککراوەیە، لەتەنگانە و نەبوونی ئاودا لەناچاری دەکوژرێتەوە و ئاوەکەی ناو زگی دەخورێتەوە.

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾﴾ الفتح: ٢٧

## خەون چ كاریگەرییەكی بەسەرمانەوە هەیە؟

(ابـی مسـلمە) دەڵـێ: مـن خـەوی وام دەبینـی نەخۆشـی دەخسـتم تـا گەیشـتم بـە (ابوقتـادە) ئـەویش وتـی: منیش خـەوم دەبینـی نەخۆشـی دەخسـتم هـەتا بیسـتم لـە پێغەمبـەر(ﷺ) دەیفـەرموو: ( بەڕاسـتی خـەوی چاك لەخواوەیـە، هـەر كـەس لـە ئێـوە خەوێكی بینـی پێیخۆشبوو باسـی نەكات لای كەسـێ نـەبێ كە خۆشـی دەوێ، ئەگەر شتێكی بینی بەلایەوە ناخۆش بوو با سێ جار تف بكات بەلای چەپیدا و پەنابگرێت بەخوا لەخراپەی شەیتان و خراپەی ئەو خەوە، بۆ كەسیشـی نەگێڕێتـەوە، ئیتر ئەو خەوە زیانی بۆی نابێت[٣٦]

لەفەرموودەیەكی دیكەدا: ( هەر كات دواڕۆژ نزیك بوویـەوە نزیكە خـەوی موسڵمان بـەدرۆ دەرنەچـێ، ئـەوەتانێ كـە زۆرتـرین خـەوی بەڕاسـت دەگـەڕێ ڕاستگۆترینتانە، خـەوی موسـڵمان بەشـێكە لـە چل و پێـنج بەشـی پێغەمبەرایـەتی، خـەو سـێ جـۆرە، خەوی چاك مژدەی خواییە، خەوی خەفەتئامێز لە شەیتانەوەیە، خـەوێكیش داڵغـەی دەروونی ئەو كەسە خۆیەتی، ئەگەر یەكێ لەئێوە خەوی ناخۆشی بینـی با هەسـتێ و نوێژ بكات و بۆ خەڵكی نەگێڕێتەوە)[٣٧]

---

[٣٦] - عن ابي سلمة قال: ان كنت لارى الرؤيا تمرضني، قال: فلقيت ابا قتادة فقال: وانا كنت لارى الرؤيا فتمرضني، حتى سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ( ان الرؤيا الصالحة من الله، فاذا راى احدكم ما يحب فلا يحدث بها الا من يحب. وان راى ما يكره فليتفل عن يساره ثلاثا، وليتعوذ بالله من شر الشيطان و شرها، ولا يحدث بها فانها لن تضره).(بخاري/التعبير/٦٦٢٧).

[٣٧] - عن ابي هريرة(ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال:( اذا اقترب الزمان لم تكد رؤيا المسلم تكذب، واصدقكم رؤيا اصدقكم حديثا، ورؤيا المسلم جزء من خمس و اربعين جزءا من النبوة، والرؤية ثلاثة: فرؤيا الصالحة بشرى من الله، و رؤيا تحزين من الشيطان، و رؤا مما يحدث المرء نفسه، فان راى احدكم ما يكره فليقم فليصل، ولا يحدث بها الناس).(بخاري/ التعبير/٦٦١٤).

خەو لەئیسلامدا پایەیەکی جێی ئیعتیبار و گرنگیی هەیە، بەجۆرێك کە دەبینین لەسورەتی(یوسف) لە قورئاندا هەموو ژیانی(یوسف)( علیه السلام) بریتیە لە گێڕانەوە و تەعبیری خەون، دوایش دوو هاوەڵەکەی یوسف ئەوەی مەیگێڕە و ئەوەش کە چێشتلێنەرە خەونەکانیان ڕاست دەردەچن، بەپێی تەعبیری خەونەکە مەیگێڕەکە لە زیندان ڕزگاری دەبێت و ئەوی دیکەش لە سێدارە دەدرێت. هەروەها پادشاش خەونێك دەبینێ و خەونی ئەویش دێتە دی کە یوسف(علیه السلام) لەسەر بناغەی ئەو خەونە پرۆژەیەکی ئابووریی پانزە ساڵی دادەنێت، حەوت ساڵ هەرزانی و فەرحانی دەبێت و پاشان حەوت ساڵ گرانی، دوایی ساڵی پانزەهەم دەرووی خێر لەخەڵك دەکرێتەوە. پێغەمبەر(ﷺ) خەونی بینی بوو کە لەساڵی شەشەمی کۆچیدا دەچێتە (مەککە) و ناو مزگەوتی حەرامەوە، لەبەر ئەوە خەونەکە لەو ساڵەدا نەهاتەدی، هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تۆ فەرمووت خەونم بینیوە؟ فەرمووی : بەڵێ، بەڵام وتوومە ئەمساڵ دێتە دی؟ وتیان: نەخێر. فەرمووی ئینشائەللا ئەو خەونە هەر دێتە دی. ئەوەبوو ساڵی حەوتەم خەونەکەی هاتە دی. هەروەها ئیبراهیم(علیه السلام) خەونی بینی و لەسەر بناغەی خەون بینینەکەیدا ئیسماعیلی کوڕی هێنایە سەر سەربڕین، دواتر خودای پەروەردگار بەرانێکی کردە بەلاگێڕەوەی ئەو.

زانایانی ئیسلام لەبارەی خەونەوە دەڵێن: دەگونجێ موژدەی تێدابێت و دڵخۆشکەربێت، دەشگونجێ وریاکردنەوە و ترساندنی تێدابێت ئەگەر ڕاست بێت وەك لە (صحیح البخاري) هاتووە: پێغەمبەر(ﷺ) خەونی کردۆتە سێ بەش، دەفەرموێت: خەون هەیە موژدە و دڵخۆشییە و لەخودای پەروەردگارەوەیە، خەون هەیە دڵتەنکەرە و لەشەیتانەوەیە، خەونیش هەیە داڵغە و خەیاڵی ئینسان خۆی دەیبینێ یان پێوەی دەبیندرێ. خەون لەئیسلامدا کە پایەیەکی هەیە، لەگەڵ ئەمەشدا زانایان دەڵێن: حوکمی شەرعی و یاسای شەرعی لە خەون وەرناگیردرێت و دەبێت ئێمە بەدوای شەریعەت بکەوین، بەڵام خەون دەبێتە بەرچاوڕوونیەك[38]

لە کرداری خەون بینیندا مێشك و ڕۆح و خود(نفس) هەرسێکیان هاوبەش دەبن و پرۆسەی خەون بینینەکە ڕادەپەڕێنن، ئەو ڕاستیەش کە زانستی دەروونی و

[38] - وتووێژی هیوا فریادرەس لە گەڵ ماموستا عەلی باپیر، گ: هەڵبوون ، ژ٧--٢٠٠٨

شەریعەتیش پێی لێ دەنێن و بڕوایان پێی هەیە ئەوەیە کە مرۆڤ تاوەکو نەگات بەقۆناغی خەون بینین ناتوانێت خەون ببینێت، واتا بەچەند قۆناغێکدا دەڕوات ئینجا دەگات بەقۆناغی خەون بینین، وە هەر مرۆڤێك کە خەون دەبینێت چەند گۆڕانکارییەکی بەسەردا دێت کە جیاواز دەبێت لەقۆناغی ئاسایی پێش خەون بینینی. بۆ نموونە زانست دەڵێت: لە قۆناغی خەونی قوڵدا مرۆڤ دەتوانێت خەون ببینێت کە دەکاتە قۆناغی پێنجەمی خەون، لەم قۆناغەدا مرۆڤ گلێنەی چاوەکانی بەشێوەیەکی خێراتر دەجوڵێنێت و لێدانی دڵی زیاتر دەبێت، لەکاتی ئاسایی جەستەی مرۆڤ بەشێوەیەکی تەواو خاو دەبێتەوە تاوەکو دەگات بە دواترین شێوەی خاوبوونەوە. بەڵام زانستی ئایینی دەڵێت: مرۆڤ هەر کاتێك دەخەوێت ڕۆحی ڕەوانی لە جەستەی دێنە دەرەوە هەروەکو لەقورئانی پیرۆزیشدا زۆر بە زەقی ئاماژەی بەو دیاردەیە کردووە[39]

هەروەکو (ابن عەباس) سەبارەت بەو ئایەتەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ:( الله یتوفی الانفس حین موتها والتي لم تمت في منامها فیمسك التي قضی علیها الموت و یرسل الاخری الی اجل مسمی ان في ذلك لایات لقوم یتفکرون) الزمر/ ٤٢ دەڵێت: ڕۆحی مردووان لەخەودا بەدیداری یەك دەگەن، خودای پەروەردگار ڕۆحی مردوان دەگرێ و گیانی زیندوان بۆ بەرلاشەیان دەگێڕێتەوە.[40]

---

[39] بەشەکانی خەون بینین و نهێنییەکانی/ شێخ ئاریان عەزیز بەرزنجی– گ: نواڵەی نوێ، ژ١٣، ل١٣، س٢٠٠٤

[40] – (ابن القیم) دەڵێ: بەڵگە ژوانی زیندوان بەمردووان ئەوەیە کە زیندوو، مردوو لەخەوندا دەبینێت و ئەو هەواڵ و پێشبینیانەی دەداتێ کە زیندوو نایانزانێ، جار هەیە شوێنی پارە و زێڕی پێ دەڵێ کە لەفلان شوێنە تەنیا خۆی پێی دەزانێ، یان قەرزی لەسەر بووە و بەڵگە و شاهێدی پێ دەدات)
لەخەودا گیانی مردووان و زیندووان بەدیداری یەك دەگەن، لەڕاست خۆ بەلەشداکردنی مردووان (التجسد)(د: س.دیر میتشل) لە فیلادلفیادا بەسەرهاتێك دەگێڕێتەوە کە لە ڕۆژنامەیەکی ئەمریکیدا بڵاوکرایەوە و ڕۆژنامەی (الفجر الجدید)ی بەغدادی لە ژمارەی ڕۆژی ١٩٦٩/٩/١٨ دەقەکەی لە ئینگلیزیەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، پوختەی بەسەرهاتەکە بەم شێوەیە: زستان بوو ، بەفر کلۆ کلۆ دەباری، دکتۆرەکە دوای دەوام گەڕایەوە ماڵ، شەکەت و ماندوو ، خۆی گۆڕی بچێتە سەر جێیەکەی و بخەوێ، لەناکاو لە زەنگی ماڵەوەیاندا، چوو بزانێ کێیە؟ دەرگای کردەوە کچێکی تەمەن ٧–٨ ساڵەی لەپێش دەرگاکە بینی لەسەرمان دەلەرزی، هەموو لەشی تەڕ ببوو، دەستماڵێکی لەملی ئاڵاندبوو تا لە سەرمای بگێڕێتەوە. کچەکە

زۆربەی زانا و دەروونناسان لەسەر ئەوە کۆکن کە خەون فیسۆلۆژی مێشکە، لەماوەی چەند چرکەیەکدا لەکاتی بێئاگایی ئەو مرۆڤە ڕوو دەدات، خەونەکەش بریتیە لەوەی کە لەڕابردوو ڕوویداوە یاخود لە داهاتوو ڕوو دەدات. ئەوەتانێ تاقیکردنەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە ڕەنگە درێژترین خەون ۱۰ خولەك بێت، ئیمامی سادق پێی وایە: خەونی ڕۆژ لە چەند ڕۆژ دوای دیتنی خەوەکە دێتە دی و خەونی شەویش وەدی هاتنەکەی شەش مانگ و جاری وایە لە ساڵێك زۆرتر دەڕوا تا بیست ساڵ، هەروەکو خەونەکەی پێغەمبەر یوسف(علیە السلام) کە دوای بیست ساڵ ڕوویدا.

کاتێ مرۆڤ دەخەوێ ئەو نەفسە دەردەچێ و بایی ئەوەندە پەیوەندی لەگەڵ لاشە دەمێنێ بەس بژێ، جا کە دەرچوو بەگوێرەی دڵەکەیە لە چ مەقامێك بێت( مەقام و حاڵمان هەیە، مەقام واتە دەرەجەی نزیکی و دووری ئەو مرۆڤە لەلای خودا جل جلالە

---

بەهەڵپەیەکەوە بەگوێی دکتۆری چرپاند: دکتۆرگیان تکا دەکەم وەرە سەردانیەکی دایکم بکە زۆر نەخۆشە و پێویستی بەتۆیە بیبینیت.

دکتۆرەکە بەپەلە خۆی کۆکردەوە، ئەگەرچی کاتەکەی ناکات بوو، بەلاّم بەزەیی پێدا هاتەوە، سەرەڕای ماندوێتی خۆی ناچاربوو ئەو ئەرکە بەجێ بێنێت، بەدەم زەردەخەنەیەکەوە داوای لە منداڵەکە کرد کەمێ لە هۆڵەکە بوەستێ تاوەکو خۆی ئامادە دەکات. ئەوەندەی نەبرد جانتای پزیشکی دەست دایێ و لەگەڵی بەڕێ کەوت، ئەو لەپشتیەوە دەڕۆیشت هەتا گەیشتە ماڵی دایکی منداڵەکە.. کچەکە ئاماژەی بۆ ئەو ژوورە کرد کە دایکی لێیە و نەخۆش کەوتووە. ئەویش چووە ژوورەکە، بینی ژنەکە نەخۆشیەکی توندی گرتووە و تووشی هەوکردنی سیی بووە، بەهەڵپەیەکەوە ڕووی تێکرد: چاکت کرد کچەکەت بەشوێندا ناردم، بەلاّم دەبوو لەبەر ئەو سەرمایە جلی ئەستوورت لەبەری بکردبایە.

ژنەکە کە ئەوەی بیست حەپەسا، چاو ئەبڵەق بوو، بەلاّم لەبەر کەیل و شەکەتی نەخۆشیەکەی بەهێواشی زمانی گەڕاند: دکتۆرگیان ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی، من کچەکەم مانگێک زیاترە مردووە، هەر ئەو کچەم هەبوو، ئێستاش لەم ماڵەدا تەنیام و شەش ڕۆژە لەبن جێیان کەوتووم، فەرموو ئەوەتانێ جلەکانی کچەکەم لەو بۆفیەدا هەڵگرتووە بڕۆ بیانهێنە و بیبینە.

دکتۆرەکە وتی: ئەی باشە هیچ دراوسێیەکتان نییە منداڵی لەم تەمەنەی هەبێت؟

سەری لێ بادا: نەخێر تەنیا پیرەژنێکم دراوسێیە ئەویش تاقە کوڕێکی هەیە و ئاگاداری ئەوە نییە من نەخۆشبم.

دکتۆرەکە چوو لەبۆفیەکەدا سەیری جلەکانی کرد بینی هەمان جل و بەرگی کچەکە بوو کاتێك بۆ بانگکردنی ئەو کردبوویە بەری، ئەو جلانەش وشك بوون..کاتێك دکتۆرەکە ئەم هەواڵەی بە زانایانی ڕۆحی گەیاند و لە لێکدانەوەی خۆیاندا وتیان: گیانی منداڵەکە بەئازاری دایکی نیگەران بووە، بێکەس بووە بۆیە هاتووە بەم ڕەنگ و بۆیە داوای کردووی.

و حاڵیش پەڕینەوەیە لە مەقامێك بۆ مەقامێکی تر) ئەو نەفسەش ئەچێتە ئەو مەقامە لە عالەمی حەق و مەعنا، هەر پەیامێك هەبێ پێی دەگات لەڕێگای خەون و حاڵەتەکانی خەون[٤١]

بۆیە مرۆڤ وەکو چۆن دەخوا و دەخەوێ، ئاواش خەون دەبینێ، زۆربەی جار خەونەکانی مرۆڤ ئاجر و باجر بووە بەوەی بەداڵغەیەکەوە خەوتووە یان باسێك لەمێشکی داوە و بۆ شەوێ هاتۆتە خەوی، بۆ نمونە جار هەیە بەبینینی فیلمێکی ترس و تۆقێنەر، لەئەنجامدا ئەو ترسە بەتوندی دەچێتە نەستیەوە کە بەبیرکردنەوەی زۆر لێی، نەست لەلای خۆی تۆماری دەکات و وەکو فیلمێك شەوانە لەسەر نەستی لێ دەدرێتەوە و دەبێتە خەونێکی ترسناك..خەونیش هەیە ترسی شەیتانە تا مرۆڤ نارەحەت بکات. وەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: خەون سێ بەشە: هەیە مژدەی خوایە، هەیە داڵغە و خەیاڵی دەروونییە، هەیە مۆتەکە و ترسی شەیتانیە[٤٢]

خەونی شەو بەهێزترە لەخەونی ڕۆژ و خەونی سەری شەویش دروست نییە، چونکە هۆکاری ئەو خەونە بیرکردنەوەی زۆر و سستی لە شەو، خەوی نیوە شەویش دروست نییە، چونکە لەو کاتە شەیتان خۆی بەمرۆڤ نیشان دەدات و لەهەموو خەونێك دروست تر و باشتر خەونێکە کە سبەینان کاتی سەرلەبەیانی یان دوای بەیانی دەیبینی، هەر بۆیەش لێکدانەوەی ئەو خەونە دروست و ڕاستە.

کرمانی دەڵێت: هەر کەس کە دەیەوێ بە بورهان و نیشانەی ڕاست لە دروستی خەونی خۆی بگات، دەبێ بە دەستنوێژەوە لەسەر کەلەکەی ڕاست بخەوێ و کاتی خەوتن لەیادی خودا بێت و خواردنیش زۆر نەخوات، چونکە کەسێك خواردنی زۆر بخوات گەدەی پڕو هاڵاوی خواردن بەسەر مێشکی دا زاڵ دەبێت و عەقڵ لەبەر هۆی هاڵاو نائارام دەبێت، هەر بۆیەش خەونی هاڵۆز دەبینێ( نابێ بە زگی برسیش بخەوێت) کەواتە پێویستە کاتی خەوتن نە تێربێت نەبرسی تا ئەو خەونەی دەیبینێت هەم وەڕاست گەڕێت و لەبیریشی نەکات[٤٣]

کەواتە خەون دیاردەیەکی تەندروستییە بۆ پاراستنی هاوسەنگی نێوان عەقڵ و تەندروستی دەروونی لەکاتی خەوتندا..بەلای زانایانەوە خەون دەرگایەکە بۆ

---

[٤١] – مەعریفەی عیرفان بۆ ناسینی زاتی ئینسان– ن: باوکی عبدالرحمن، چ١، س٢٠١١ ، ل٨٢

[٤٢] - قال( ﷺ) ( الرؤيا ثلاثة: فبشرى من الله، و حديث النفس و تخويف من الشيطان) رواه الترمذي –صحيح

[٤٣] – ناسینی ڕاستییەکانی خەون و نیشانەکانی/ و:مەهدی– گ: پێشکەوتن، ژ:١٣٧، ل٣٢،س٢٠٠٥

تێگەیشتنی ئەو شتانەی کە لەناوەوەی عەقڵدا هەیە، بۆیە چەندین توێژینەوە کراوە بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی و تیۆری لەهەمبەر دەرخستنی ئەو خەونانە تاوەکو بزاندرێ هۆکار و چۆنیەتی بینینی خەون لەکاتی نووستندا چییە؟

✍ بەسەرهاتی یەکەم:



**بەسەرهاتی ئەو کابرایەی بەخەونێك دەوڵەمەند بوو**

ئەوەی لێرە گوێبیستی دەبین سەرگوزشتەی کەسێکی تاقەنەی بێ خوشك و برایە، کەسێکی نەدار کە هیچی نییە، بەهۆی خەوێکەوە خوای پەروەردگار دەروویەکی لێ دەکاتەوە دەبێتە یەکێك لەهەرە دەوڵەمەندەکانی دەڤەری دۆڵی سماقوڵی، ئەویش خوالێخۆشبوو(حاجی ئەمین ئەحمەد)ە کە نزیکەی سەد و بیست ساڵ ژیا، لەماوەی تەمەنی دا شەش ژنی هێناوە، لەدوای خۆیدا چوارده کوڕ و پازده کچی لێ بەجێ دەمێنێ و ساڵی ١٩٦٥ کۆچی دوایی دەکات.

**حاجی( مستەفا ئەمین ئەحمەد )[٤٤] ی کوڕی بۆی گێڕامەوە وتی:**

✎ خزمێکمان خەون دەبینێت ئەوە لە ئەشکەوتێکدایە، لەو ئەشکەوتە دوو ئاو دەهاتە خوارەوە، لە کونێکیەوە ئاوێکی زۆر لەسەرخۆ و بە زەعیفی دەردەچوو، کەچی لە کونەکەی دیکەیاندا ئاوێکی زۆری لێ دەهات ، هەر لەو خەوە پرسیاری ئەو دوو ئاوە دەکات و دەپرسێ: ئەوە چییە؟ پێی دەڵێن: ئاوە زۆرەکە هی (ئەمین) و ئەوی تر هی تۆیە.

ئەویش وەکو دەگێڕێتەوە، وتی: منیش ویستم کونی ئاوەکەی خۆم گەورە بکەم، توند دەستیان گرتم و وتیان: هاااااا، نەکەی دەستی لێ بدەی، ئەگەر دەستی لێ بدەی ڕەنگە ئەوەندە ئاوەش نەمێنێت و بەیەکجاری بڕێ.

---

[٤٤] - حاجی مستەفا لەساڵی ١٩٣٠ز لەگوندی سماقوڵی گرتك لەدایك بووە، لەساڵی(٢٠١١)دا کۆچی دوایی کردووە.

بەیانی خەونەکەی بۆ مەلای گوندی دەگێڕێتەوە، مەلاکە پێی دەڵێ: لێکدانەوەی خەونەکەت ئەوەیە تۆ ڕزقت لەسەر پێیە، هەتا دەمری نەژێ و نەمریێ ئەگەر کونە ئاوەکەت گەورە بکردایە و ئاوەکە بوەستایە ئەوە هەتا دەمردی بەقەرز و قۆ ژیانت بەسەر دەبرد، واباشە ناشوکر نەبیت و بەبەشی خوا ڕازیبی، ئەو کابرایەش خوای پەروەردگار دەرووییەکی وای لێ دەکاتەوە، گەورەو دەوڵەمەندی دەکات.

حاجی (ئەمین)ی باوکم بەرەحمەتبێ بۆ خۆی دەیگێڕایەوە، دەیوت: زۆر دەست کورت و هەژار بووم، تەنانەت بۆ ئەو سەردەمە خوشکێکم نەبوو ژن بەژنێی پێ بکەم، خزمێ زگی پێم سوتا کچەکەی لێ مارە کردم و گواستمەوە، کەچی دەوڵەمەندبوونەکەم وەکو موعجیزە وابوو، مانگام دەزا بەجارێ دوو گۆلکی دەبوو، دەغڵ و دانەکەم لەشێنەیی و لەگرانی دەچاند لاچکی گەنمەکەی لەجیاتی گوڵە گەنمێ، دوو گوڵە گەنمی دەگرت.

دەوڵەمەندییەکم گەیشتە ئاستێك بەتەنەکە لیرەی ڕەشادی و مەجیدیم هەبوو، یەکێك بووم لەوانەی دۆستی کاکەزیاد و حەماغا کۆیە بووم.

کاتێك چوومە داخوازی کچی یەك لەمەلازادەکانی کۆیە، حیسابی کرمانجیان بۆ کردم، بەبیانوویەکەوە ویستیان کچەکەم نەدەنێ، بارێکی قورسیان خستە شانم دەست بکێشمەوە، پێیان وتم: ئەگەر ژنێك و سەد لیرە و تفەنگێك و جووتێك گامان دەدەیتێ فەرموو ئەوە کچەکەت دەدەینێ، منیش بەدەم زەردەخەنەیەکەوە پێیانم وت: ئەوە هەر داوا نیە، هەموو ئەو شتانەم بۆیان هێنا و ئەوانیش کچەکەیان لێ مارە کردم.

(حاجی ئەمین)ی باوکم لەتەمەنی هەشتاساڵی ژنی شەشەم دێنێ و سەد و بیست ساڵ دەژێ، تەنانەت نەوەیەکی زۆر لەدوای خۆی بەجێ دێڵێ، بەو دوا دوایە زۆرجار نەوەکانی دەچوونە لای، دەیانووت: باپیرە گیان.. ئەویش دەیوت: من ناتنناسم، تۆ کوڕی کێی؟ ئەوەش ئاماژەیەك بوو بۆ ئەوەی نەوەیەکی زۆری بەرهەم هێنابوو.(خوا ڕەحمی پێ بکات).

* * *

(ئەنیشتاین) دەڵێت: خەون بۆ مرۆڤ هەمووشتێکە، هێزی خەون لە زانیاری ژیان گرنگترە، چونکە ئەو هێزە داهاتووتان دیاری دەکات لەبەر ئەو هۆیە ڕێگە مەدەن خەونەکانتان ماندوو بێت.

✍✍بەسەرهاتی دووەم:

**ئەو پیاوەی خەونی بینی پێیان وت: ٦٠ساڵ دەژێی، ٦٠ ساڵ ژیا**

**کاك (هەڵمەت فاتیح تۆماری) گێڕایەوە، وتی:**

✍ مام (فازل هیدایەت حەمید) لەساڵی ١٩٣٠ لە گوندی (گورگان)ی سەر بەناحیەی شوان (ڕێدار) لەدایك بووە، تووشی نەخۆشی لەرزوتا دێ و لەبەر گرانی نەخۆشیەکەی دەکەوێتە بن جێگە و خەو و خۆراکی نامێنێت، دەق وەکو کەسێکی لێدێت کە هیچ هیوایەکی بە ژیان نەمابێ، ماڵەوە دەستیان لێی شووشتبوو، بەتەمای ئەوە نەبوون چاك بێتەوە، لە ١٩٥١/١٢/٣٠ خەونێکی بینی، فریشتەیەك لەشێوەی مرۆڤ لە خوار پێیەکانیەوە وەستابوو، ئەویش پرسیاری لێ دەکات: ئەرێ تۆ کێی؟ بۆ ناتناسم؟

ئەویش وەڵامی دەداتەوە، پێی دەڵێ: تۆ کاتت تەواو بوو، پێویستە بڕۆی.

فریشتەیەکی دیکەیش بەسەر سەریەوە لەسەر شێوەی مرۆڤ دەبینێت، ئەویان وەڵامی دەداتەوە، پێی دەڵێ: ئەوە هەو نیە، ئەو کابرایە هێشتا ماویەتی.

بەو قسانە ئەو فریشتەی لای خوارەوە دەڕوات، کاتێ ئەو فریشتەی دیار سەری دەیەوێ بڕوا، توند دەستی دەگرێت و پێی دەڵێ: توخوا پێمبڵێ ئێوە کێن؟

ئەویش وەڵامی دەداتەوە پێی دەڵێ: ئێمە فریشتەی خواین.

کە لێی دەپرسێ: باشە من لەم ژیانە چەند دەژێم؟

پێی وتم: ٦٠ ساڵی ڕەبەق.

ئەو قسەیە دەکا و دەڕوات.

مام (فازل) کە لەخەوەکەی بەئاگا هاتەوە، بەسەرهاتەکەی بۆ ماڵەوە باس کرد، لەو ڕۆژەوە وردە وردە لە نەخۆشیەکی چاك دەبۆوە تا نەخۆشیەکەی نەما، کاتێك چووە لای مامۆستایەکی ئاینی گوندەکەیان و خەونەکەی بۆ گێڕایەوە.

لەو ڕۆژەوە چەندین جار تووشی نەخۆشی قورس هات و ئەگەری چاکبوونەوەی زۆر کەم بوو، بەڵام لێی دەردەچوو، چاك دەبۆوە، لە ژیان بەردەوام بوو تا ساڵی ٢٠١١ دووچاری نەخۆشیەك بوویەوە، چەند دکتۆریان پێی کرد، بێ سوود بوو، دوا جار کە حاڵی نەخۆشیەکەی زۆر خراپ دەبێت، دایکی پێی دەڵێ: کوڕم فازل ئیتر بەس نیە؟

ئەوەبوو لە ٢٠١١/١٢/٣٠ کۆچی دوایی دەکات کە بەتەواوی دوای دیتنی خەونەکەی ٦٠ ساڵی ڕەبەقی تەواو کرد.

**✍✍✍ بەسەرهاتی سێیەم:**

**خەون بە پێ زەمان و مەکان دەگۆڕێ...**

خەون ڕاستی و چارەنووسسازە، بەپێی کات و شوێن(زەمان و مەکان) دەگۆڕێ [٤٥]، دەگێڕنەوە کابرایەك خەونی بینی، بەیانی کاتێك لەخەو هەستا، بانگی کوڕەکەی کرد و پێی وت: کوڕی خۆم دەڵێن ( ئیبن سیرین) لە ئێرانە، بچووە لای، لێکدانەوەی ئەو خەونەم بۆ بێنیەوە کە من ئەمشەو بینیم.

کوڕەکەی وتی: خەونی چیت بینی؟

باوکی وتی: لە خەونەدا لەسەر دەریایەك وەستابووم، ئەوەندەم تێنوو بوو، ئەوەندەی ئاوم لەو دەریایە خواردەوە تێر نەدەبووم تا هەموو ئاوەکەم خواردەوە، بۆیە تۆ نابێ ئەو خەونە بۆ کەس بگێڕییەوە تا دەگەیە لای ئەو زانایە.

کوڕەکەی بەڵێنی پێدا لای کەس نەیدرکێنێت، کەوتە ڕێ، قۆناغێکی باشی بڕی، گەیشتە کابرایەك، دوای چاکوچۆنی و ئەهواڵپرسین، کابرا لێی پرسی:

* ئەوە بۆ کوێ دەچی؟

- دەچمە ئێران بۆ لای ئیبن سیرین.

---

[٤٥] - زەمان و مەکان ڕۆڵ دەگێڕێ، دەگێڕنەوە کابرایەك لە زستان خەونی بینی، لە خەوەکەیدا شوێنێکی بەرچاو کەوت ئاگرێکی گەورەی لێ هەڵدەستێ، بەرەو شوێنی ئاگرەکە ڕۆیی، بەیانی کاتێك ئەو خەونەی بۆ زانایەکی ئەو سەردەمە گێڕایەوە، زاناکە پێی وت: ئەو شوێنە دەزانی لەکوێیە کە ئاگرەکەی لێ هەڵدەستا؟

وتی: بەڵێ.

وتی: دەفەرموو وەرە بەرەو ئەو شوێنە بڕۆین.

پاچە و پێمەڕە و خاکەنازیان برد و ڕۆیشتن ، کە شوێنەکەی پێ نیشاندا، ئەویش وتی: ئەی ئەم شوێنەم بۆ هەڵدەوە..ئەویش کەوتنە هەڵدانەوەی شوێنەکە ، کوپەیەك لیرەیان لێی دۆزیەوە.

ماوەیەك ڕابورد، کابرایەکی تر لە چلەی هاوینێ خەونی بینی ئەوە لە دۆڵێکدا ئاگرێکی گەورەی لێ هەڵدەستێ، بەرەو شوێنی ئاگرەکە ڕۆیی، بەیانی بەخۆ و پاچە و پێمەڕە و خاکەناسەوە بەو نیەتە چوو کە ئەو شوێنە هەڵبداتەوە کوپە لیرەی لێ دەربێنێ، تەواوێ زەویەکەی هەڵکۆڵی، کاتێك بەخۆی زانی چواردەورەیان گرت، وتیان: کەسێك لەو ناوە بەکوژراوی دۆزراوەتەوە، ئەوە دەرکەوت تۆ کوشتووتە و بەتەمای ئەوە بووی ئەو زەویەی بۆ هەڵبکەنیت و تەرمەکەی تێدا بشارییەوە.

کابرا شڵەژا، باسی خەونەکەی کابرای ئەو ساڵەی بۆ گێڕانەوە، ئەوجا باسی خەونەکەی خۆی بۆ کردن، کە ئەوەیان بۆ زاناکە گێڕایەوە، زاناکە وتی: خەون بەپێی زەمان و مەکان دەگۆڕێ، فەرموو هەموومان لە زستانی سەرما و سۆڵدا بەرەو ئاگر دەچین، نازانم ئەو کابرایە چۆن بەچلەی هاوین و بەو گەرمایە بەرەو ئاگر دەچێت؟

* بۆ دەچیە لای؟

– باوکم خەونی بینیوە، دەچمە لای تاوەکو خەونەکەی بۆ لێك بداتەوە.

* خەونەکەی چی بوو؟

– لەخەویدا چووبووە کەناری دەریایەك ئەوەندەی ئاوی دەریاکەی دەخواردەوە تێر نەدەبوو تاوەکو هەموو ئاوەکەی خواردەوە.

کابرا وتی: پەککو، ئەوە چۆن ئەو هەمووە ئاوەی خواردەوە نەدڕا؟ چۆن نەتەقی؟

کوڕەکە کابراکەی بەجیٚ هێشت و ڕۆیی تا گەیشتە ئێران، بەپرسیار لێرە و لەویٚ ناونیشانی ئیبن سیرینی وەرگرت و بە خزمەتی گەیشت، وتی: قوربان باوکم خەونی بینی، لەخەویدا چووبووە ڕۆخی دەریایەك ئەوەندەی ئاوی دەریاکەی دەخواردەوە تێر نەدەبوو تا هەموو ئاوی دەریاکەی خواردەوە، هاتووم لێکدانەوەی ئەو خەونەم بۆ بکەی.

ئیبن سیرین پێی وت: خۆ ئەو خەونەت بۆ کەس نەگێڕاوەتەوە؟

سەرەتا نکۆڵی لیٚ کرد: نا، لای کەس باسم نەکردووە.

کە هەمان پرسیاری لیٚ دووبارە کردەوە: ڕاستم پیٚ بڵیٚ خۆ ئەو خەونەت بۆ کەس نەگێڕاوەتەوە؟

وتی: باوکیشم هەمان ئەو قسەی تۆی کرد کە بۆ کەسی نەگێڕمەوە، بەڵام من لەسەر ڕێی خۆم بێئاگا لەو بەڵێنە، خەونەکەم بۆ کابرایەکی نەناس گێڕایەوە.

ئیبن سیرین وتی: کابرا چی وت؟

کوڕەکە وتی: کابرا وتی پەککو، ئەوە چۆن ئەو هەمووە ئاوەی خواردەوە نەدڕا؟ چۆن نەتەقی؟

ئیبن سیرین وتی:نەدەبوو ئەو خەونە بۆ کەس بگێڕیەوە، بەگوێرەی ئەو قسەیەی کابرا کردی: بڕۆ ڕیٚ و ڕیٚ بگەڕێوە بابت مردووە و وا لەسەر تاتەشۆریان داناوە، خۆ ئەگەر بۆ کەست باس نەکردبایە ئەوە بابت هەموو علمی دنیای دەهاتە لا و دەبووە زانایەکی گەورە.

* * *



# بەسەرهاتی ئەو پیاوەی دکتۆر تەنها ٨ ڕۆژی بۆ دانا بژی، کەچی ٢٢ساڵ ژیا!!

❁ مامۆستا عەبدوڵڵا وەسمان حەمە[٤٦] بەسەرهاتێکی باوکی بۆ گێڕامەوە، وتی:

📖سەرەتای ساڵی ١٩٨٣بوو، ڕۆژێکیان لەماڵەوە ماسیمان هەبوو، باوکم[٤٧] ماسی خوارد و هێسکێکی ماسیەکە لەزمانە چکۆڵەی گیر بوو، زۆر ناڕەحەتی کرد، دوای نان و ئاوخواردنەوە بەسەردا هەستی کرد نەختێ باش بووە بەڵام بە تێپەڕبوونی ماوەیەك، وای لێدێ لەگەڵ تفکردندا خوێن لەدەمیەوە دێت، ئەوەش بۆ باوکم ئاماژەیەکی خەتەرناك بوو، ئەگەرچی ئیتقانی تەواوی بەوەبوو ڕەنگە ئەو خوێنە هی ئەو ئێسکە بێت کە لەزمانی گیر بووە

چووە هەولێر سەردانی نۆڕینگەی دکتۆر (ئیحسان خالد نەقشبەندی) کرد تاوەکو بزانێ هۆکاری ئەو خوێنە چیە ؟ ئەویش پشکنینێکی وردی بۆ کرد و دوای دەرکەوتنی ئەنجامی پشکنینەکە، بەباوکمی وت: دەبێ زمانە بچکۆلەت ببڕم، تۆ تووشی سەڕەتان هاتووی.

باوکم خۆی ڕادەست کرد و لە نەشتەرگەریەکدا قیچێ لە گۆشتی پێشەوەی زمانە



٤٦ – لەدایکبووی ساڵی ١٩٧٥، دەرچووی زانکۆی سەلاحەدین، کۆلێژی پەروەردەیە، خاوەنی ٤ منداڵە و لە ئامادەیی تەق تەقی کچان مامۆستای زمانی عەرەبییە. لەشارۆچکەی (تەق تەق) دادەنیشێت.

٤٧ - حاجی وەسمان حەمە دەروێش عەولا، لە١/٧/١٩٣٢ لەدایك بووە، خاوەنی ٣کچ و ٣ کوڕە، لەساڵی ١٩٧٢ چووەتە ماڵی خوا، لە ٣/١/٢٠٠٤ لەتەمەنی شەست و دوو ساڵی کۆچی دوایی کردووە.

بچکۆلەکەی بڕی، بەڵام چارەسەری یەکجاری نەبوو، دوای چەند جار سەردانیکردن، خوێنەکەی هەر نەوەستا، دواجار پێی وت: وابزانم ئەو نەخۆشیە چارەسەری نیە، بەهەرحاڵ پێم باشە بچیە موسڵ یان بەغدا چونکە لەئێراق تەنها لەو دوو شوێنە لێزەر هەیە، بڕۆ لێزەری لێ بدە و خوا کەریمە.

لیژنەی پزیشکیان بۆی دانا و نووسراویان بۆی کرد کە بۆ ماوەی شەش مانگ هاتوچۆی موسڵ بکات، لەو ماوەیە ئەوەندەی لێزەریان لێیدا، خوێنەکەی وەستا، ڕەنگە هەر ئەو لێزەرە پارچە ئێسکەکەی سووتاندبێت.

دکتۆر ئیحسان بەڕاشکاوی بەباوکمی وتبوو: ئەم نەخۆشیەی تۆ ئەوەندە ناخایەنێ، تۆ هەر بژێی لە (٨) ڕۆژ زیاتر ناژێی.

ڕاپۆرتیان بۆی نووسی بچێتە بەغدا، لەوێ لیژنەیەك هەبوو کۆبوونەوە و سەرەتانەکانیان پشتڕاست کردەوە، کە باوکم بەهەمووی دوو مانگ دەبوو لە فەرمانگەی کشتوکاڵی (تەق تەق) دامەزرابوو، بڕیاریاندا بە ١٠٠٪ی مووچەکەی خانەنشین بکرێت و خانەنشینیان کرد.

باوکم بریکاری (هێلکە و مریشك)ی هەبوو کە بەناوی نەسرینی خوشکمەوە دەرکرابوو، بەبێ مۆڵەمەتی شۆفێری شڕە سەیارەیەکی هەبوو لەهەولێرەوە (هێلکە و مریشکی) دێنا، لە(تەق تەق) دەیفرۆشتەوە.

دوای ئەو ڕاپۆرتەی پێیاندا کە لەم ژیانە تەنها هەشت ڕۆژ دەژێ، ڕۆژێکیان چووە هەولێر لە یەك لە ترافیکلایتەکانی نێو شاریدا بەبێ ئەوەی بزانێ ڕەنگی سوور و سەوز چیە؟ لە گڵۆپی سووری دا، هەر خوا ڕەحمی کرد هیچ کارەساتێك نەقەوما، بەمەیش مروری ئەو شوێنە ڕایدەگرێ،کە داوای مۆڵەتی شوفێری لێ دەکات و دەڵێ: مۆڵەتم نیە.

دەستیان بەسەر سەیارەکەی داگرت و خۆشیان تەسلیمی دادگا کرد، حاکم دوای خوێندنەوەی ڕاپۆرتی هاتوچۆ، بڕیاری دا باوکم شەش ڕۆژ تەوقیف و شەش مانگ بەند بکات.

باوکم ڕوو دەکاتە حاکم و پێی دەڵێ: قوربان با شەش ڕۆژەکە بۆ من و شەش مانگەکەش بۆ تۆبێت.

بەو قسانەی هەڵوێستەیەکی بە حاکم دەکات کە لێی بپرسێ: ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی؟

ئه‌ویش له‌جێوه ڕاپۆرتی دكتۆری له‌باخه‌ڵ ده‌رێنا و نیشانی دا، وتی: قوربان من خوێنده‌واریم نییه، به‌لأم به‌پێی ئه‌و ڕاپۆرته، به‌هه‌مووی شه‌ش ڕۆژم له دنیا ماوه، ئێستاش لێره‌و له‌وێ بۆ خۆشی خۆم ده‌گه‌ڕێم.

حاكمه‌كه سه‌یری ڕاپۆرته‌كه‌ی كرد و خوێندییه‌وه، هه‌ستی به دڵته‌نگیه‌كی زۆر كرد، به‌باوكمی وت: ئه‌وه ته‌وقیفه‌كه‌ت له‌سه‌ر هه‌ڵده‌گرم، به‌لأم تۆ توانای ئه‌وه‌ت هه‌یه كه‌م غه‌رامه‌یه‌ك به‌رانبه‌ر به‌و سه‌رپێچیه‌ت بده‌ی؟

له‌وه‌لأمدا پێی وت: چه‌ندی ده‌ڵێی ئاماده‌م.

حاكم به‌زه‌یی پێدا هاته‌وه، به بڕه پاره‌یه‌كی كه‌م غه‌رامه و پێبژێری كرد و سه‌یاره‌كه‌ی بۆ گه‌ڕانده‌وه.

باوكم هه‌موومانی نیگه‌ران كردبوو، خه‌ممان لێی ده‌خوارد، كه‌چی دوای سه‌ردانكردنی چه‌ند پزیشكێك، دڵنیایان كرده‌وه سه‌ڕه‌تانی نیه، به‌مه‌یش مۆڵه‌تی ته‌ندروستیان پێیدا و كه‌بابخانه‌یه‌كی له (ته‌ق ته‌ق) كرده‌وه.

له‌ئه‌نفاله‌كه‌ی ساڵی ١٩٨٨ ژنی دووه‌می هێنا و سێ منداڵیشی له‌و ژنه‌ی بوو، تاوه‌كو دواجار له ٢٠٠٤/١/٣ بۆ هه‌تا هه‌تایه چاوه‌كانی لێكنا.

* * *

باوكم به‌ده‌یه‌ها به‌سه‌رهاتی خۆش خۆشی هه‌بوو، زوو زوو بۆمانی ده‌گێڕایه‌وه، له‌وانه:

✍**به‌سه‌رهاتی یه‌كه‌م:** باوكم له‌پێناو ڕه‌زامه‌ندی خوای په‌روه‌ردگار مه‌یتشۆری ده‌كرد، هه‌ر كه‌سێك بمردبایه، ده‌یشووشت.

له شۆڕشی ئه‌یلوول له ده‌شتی كۆیه دوو پێشمه‌رگه به‌هۆی بۆردومانی فرۆكه‌كانی به‌عسه‌وه شه‌هید بوون، ته‌رمه‌كه‌یان هێنایه (ته‌ق ته‌ق) و له‌لایه‌ن ده‌زگای ئه‌منه‌وه بانگیان كردم و پێیان وتم: بڕۆ ئه‌و دوو ته‌رمه گۆڕه‌شار بده و نه‌ختێك ئاویان پێ دا بكه وابێ بیشارینه‌وه.

باوكم بوێرانه پێی وتن: من چۆن كوڕێكم بمرێت به‌مه‌وێ بیشۆم، ئه‌و دوو مردووه‌ش ئه‌وها ده‌شۆم.

هه‌ر باوكم ده‌یگێڕایه‌وه ده‌یوت: شه‌هیده‌كان ئه‌و شوێنه‌ی خوێنیاب له‌به‌ر ده‌ڕۆیشت، لۆكه‌یه‌كی زۆرم تێپه‌ستان و جوان شووشتیانم، ئه‌وجا پێش كفن و دفن به‌جوانی لێیان وردبوومه‌وه بزانم ده‌موچاویان چۆنه و نیشانه‌یان چیه بۆ ئه‌وه‌ی

ئەگەر دوو ڕۆژی تر کەس و کاریان دەرکەوتن و بەدوای دا هاتن، بەپێی وەسفەکان پێیان بڵێم ئەوانە کێن؟ ئەوەبوو سەیدەکانی گوندی گۆمەشین کاتێك بەوەیان زانی هاتنە لام و منیش قەبرەکەیانم نیشاندان و وەسفی تەرمەکەیانم بۆ کردن، ئەوانیش بەگوێرەی وەسفەکە ناوی شەهیدەکانیان لەسەر کێلەکە نووسی، لەوەوە ئەو گۆڕستانە بووە گۆڕستانی (شەهیدان) کە باوکم یەکەم کەس بوو دوو شەهیدی لەو شوێنە کفن و دفن کرد.

✍✍**بەسەرهاتی دووەم:** باوکم بۆمانی گێڕایەوە، وتی: ماوەیەك بوو وەکو دوکانی سەفەری بە کەرو عارەبەنە شەکرۆکە و وردەواڵەم دەفرۆشت، ڕۆژێکیان چوومە یەك لەو گوندانەی ئەو دەوروبەرە، هێشتا نەگەیشتبوومە گوندی، دوو شوانی زرت و زەبەلاح کە منیان بینی بە خۆ و کوتەکەوە هاتنە پێشم و کوتەکیان لیّ ڕاستکردمەوە لێم بدەن، منیش کابرایەکی ئەوەندە گەورە نەبووم و لەخۆم ڕانەبینی دەست بکەمەوە و دەرەقەتیان بێم، بەپەرۆشەوە پێیانم وت: براینە من چیم کردووە؟ بۆچی دەتانەوێ لێم بدەن؟ فەرموو لەو شەکرۆکە و مەکرۆکانە چەندی حەزتان لێیەتی ببەن و بیخۆن گەردەنتان خۆش و ئازابێ، بەڵام ئەو کارەم لەگەڵ مەکەن من ئەوەندە بەسەحەت نیم بەرگەی کوتەکتان بگرم.

شەکرۆکەیان بەو ناوە وەرگەڕاند، یەك لە شوانەکان وتی: دەی خێرا هەرچی پارە و پوولێکت لەلایە دەری بکە و بمانیدەیێ.

منیش دەمانچەم لەبەر پشت بوو، یەکسەر دەستم خستە باخەڵ و سەفتەیەك پارەم بۆیان دەرهێنا و فڕێمدایە بەر دەمیان، پارە بەو ناوە پەرت و بڵاو بۆوە، فرسەتم وەرگرت، دەمانچەم لەبەر پشت دەرێنا و لێیانم ڕاکێشا، کە چاویان بە دەمانچە کەوت لەترسان کەوتنە تکا و نووزانەوە بەس ئەوەندە لێیان ببوورم. منیش وتم: دەی خێرا هەموو ئەو شەکرۆکانەم بۆ خڕ بکەنەوە و بیکەنەوە شوێنی خۆی.

ئەوانیش خێرا شتەکانیان کردەوە جێی خۆی، هەر بەوە نەوەستام ئەوجا پێیانم وت: دەی ئەو جلەی لەبەرتانە هەر ئێستا دایکەنن و دەبێ بەڕووت و قووتی بچنەوە گوندی.

هێندەی دیکە کەوتنە پاڕانەوە: دەستمان دامێنت توخوا ئەوەی ئێمە کردمان تۆ مەیکە.

چی وایان نەمابوو بۆ ئەوەی شەرم و حەیایان نەتکێ دەست بەگریان بکەن، بەزەییم

پێدا هاتنەوە، ئازادیانم کرد، پەیتا پەیتا چوومە ئەو گوندە و هەموو شتەکانم ساغ کردەوە. وەختی جەم بوو، چوومە ماڵی کوێخای گوندی، کوێخا بانگی خوارمەکانی کرد خواردن بێنن، هەر ئەوەندەم زانی دوو شوانەکە بە خۆ و نانەوە بە ژوور کەوتن، کە چاویان بەمن کەوت ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕا، منیش بۆیان خنامەوە، کوێخا پرسی: بەو خوایە دەم لەو خواردنە نادەم تاوەکو ئەو سرەم پێ نەڵێی؟ منیش لەبەر سوێندەکەی ناچاربووم بەبێ درۆکردن تەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ بگێڕمەوە، کوێخا وتی: خۆزگە لێیانت نەدەبووری و بە ڕووت و قووتی دەیانتناردنەوە.

وتم: بڵێم چی گەلێ نووزانەوە بەزەیم پێدا هاتنەوە، لێیان خۆش بووم.

✍✍✍**بەسەرهاتی سێیەم**: باوکم گێڕایەوە وتی: تازییەك لە گوندی ئۆمەرگومەت هەبوو، سەیارە ئەو وەختە زور کەم بوو، بەپێیان ئەو ڕێیەم کوتایەوە، چوومە پرسەکە و هەر بەپێیان گەڕامەوە، پێش ئەوەی داخیلی (تەق تەق) ببم، چوزانم پێش من پێشمەرگە بەسەر ڕەبیەکی دیار گوندی (گەرمك)یان داوە و گەڕاونەتەوە، کاتێك نزیك بوومەوە ئەو سەربازانەی ئەوێ منیان گرت و وەرگەڕانە سەرم، لێدە و لێدە، نیوە مردیان کردم، ئەوجا منیان ڕاپێچی قەڵاتە کردو بردمیانە بەردەم ئامرەکە، وتیان: گەورەم ئەوە پێشمەرگەیە و بەسەر ڕەبیەی داداوین.

ئامرەکە منی دەناسی، دەیزانی دوکاندارم و بەدەیەها جار لەلام چای خواربۆوە، کە لێی پرسیم: ئەوە لەو شوێنە چیت دەکرد؟ وتم: چووبوومە تازیەی گوندی ئۆمەرگومەت و کە گەڕامەوە ئەوانە لێم هاتنە دەست و لێیاندام.

هەر ئەو کاتە ئازادی کردم و بەنیوە مردی منیان بردەوە ماڵ، کەس بەتەمام نەبوو ، عەلی مام باوەکر وتی: من بەیانی زوو تویێتەکە دێنم و دەتبەمە کەرکوك.

ئەو شەوە خەوم بینی دوو کەس بەبەرگی سپیەوە هاتنە دیار سەرم، کەوتنە داو و دەرمانکردنم.

بەیانی کە هەستام هەستم کرد لەشم خۆش بووە، عەلی مام باوەکر بەخۆو سەیارەوە هاتە ماڵمان تا لەگەڵ خۆیم بباتە کەرکووك، پێموت: چاکبوومەتەوە، عەیبم نیە، ئەوە نییە خێزانم شیری بۆ هێناوم؟ تەماشا بکە بزانە چۆن دەیخۆمەوە؟

لەپێش چاوی کەوتمە شیرخواردنەوە، ئەوجا هەستامەوە وتم: فەرموو سەیرکە بزانە چۆن دەڕۆم ؟لەپێش چاوی کەوتمە هاتوچۆ و ئەویش قەناعەتی هات باشبوومە، باشبوون لەڕێی خەوێکەوە.

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ غافر: ٦٠

## ❁دوعا گرنگە، بۆچی دوعا قبوڵ نابێت؟❁

✍ شەقیقی بەلغی(رەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم بەناو شاری (بەسرە) دەڕۆیشت، خەڵکی لێی کۆبوونەوە پێیان وت: هۆی چیە ئێمە دوعا دەکەین، دوعامان گیرا نابێت لەگەڵ ئەوەشدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:( وقال ربكم ادعوني استجب لكم) ئەویش فەرمووی: با پێتان بڵێم ئێوە بەهۆی – ١٠ – شتەوە دڵتان مردووە، ئیتر چۆن دوعاتان گیرا دەبێت؟!

❁یەکەم: خواتان ناسیوە و مافی خواناسین بەجێ ناهێنن.

❁دووەم: قورئانتان خوێندۆتەوە و کارتان پێی نەکردووە.

❁سێیەم: دەڵێن پێغەمبەرمان خۆش دەوێ و وازتان لە سوننەتەکانی هێناوە.

❁چوارەم: دەڵێن ڕقمان لەشەیتانە و گوێڕایەڵی دەکەن.

❁ پێنجەم:داوای ڕزگاری لە ئاگری دۆزەخ دەکەن و خۆتانی تێ فڕێ دەدەن.

❁شەشەم: داوای بەهەشت دەکەن و هەوڵی بۆ نادەن.

❁حەوتەم: دەڵێن مردن هەقە و خۆی بۆ ئامادە ناکەن.

❁هەشتەم: بەشوێن عەیبی خەڵکی دا دەگەڕێن دەسخەڕۆ بەو هۆیانەوە عەیبی خۆتان واز لێ هێناوە.

❁نۆیەم: مردوو دەبەنە گۆڕستان دەینێژن و پەندی لێ وەرناگرن.

❁دەیەم: نیعمەتی خوا دەخۆن و سوپاسی ناکەن...ئێوە ئەوەندە نمەك نەناسین، بۆ دەبێ گلەیی بکەن؟

✍بەسەرهاتی یەکەم:

دوعا بۆ مردووان دەچێت...

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (اذا مات ابن ادم انقطع عمله الا من ثلاث: صدقة جارية او علم ينتفع به او ولد صالح يدعو له) واتە: مرۆڤ دوای مردنی دادەبڕێ لەدنیادا و هیچ کردارێکی بۆ نامێنێت تەنها لەسیانیان، ئەوانیش: چاکەی نەبڕاوەیە وەك تەرخانکردنی بەرهەمی باغەکەی بۆ خواردنی هەژاران یان خانوویەك بۆ

نیشتەجێبوونی هەژارێك یان كەمدەرامەتێك كە بەردەوام سوودی لێ وەردەگرێت، دووەمیان لە زانست و زانیاری هەركەسێك دوای مردنی بەبێ كەمكردنەوەی پاداشتی چاكەكەی لەدونیا و دواڕۆژ بەردەكەوێت، سێیەمیان: پاڕانەوە و نزای وەچەیەكی سوودمەندن بۆ كەسی مردوو كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ولد صالح یدعو لە) مرۆڤی بێسوود نەبایەخ بەخۆیی و نە بەدایكی و باوكی دەدات، ئەمەش ئاماژەیە بەگرنگیدان بەپەروەردەی ڕاستەقینەی مندالأن تا سوودبەخشبن لەژیان و لەدوای مردنی كە پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی پێكردووە نزا بۆ باوك و دایك و كەسانی دیكە لە خزمان، باشترە لەوەی پاداشتی پەرستشی بۆ بكەی، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) نەیفەرمووە وەچەیەكی چاك، نوێژو ڕۆژوو و چاكەی بۆ بكات[48]

📖 مامۆستا (ئەبوبەكر شوان)[49] بەسەهاتی (لۆبیافرۆش)مان بۆ دەگێڕێتەوە، دەڵێ:

---

[48] – پەروەردەی ئیسلامی بۆ پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی، چ١-٢٠١٣ك-دار لوبنان.



• [49] - مامۆستا ئەبوبەكر ئیسماعیل محەمەد (ئەبوبەكر شوان) ساڵی ١٩٥٤ لە هەولێر لەدایك بوو، خانەی مامۆستایانی تەواو كردووە، ساڵی١٩٩٢ بووەتە سەرپەرشتیاری كارگێڕی پەروەردەیی، سەرنووسەری ڕۆژنامەی پێشكەوتن و سەرپەرشتیاری ڕۆژنامەی برایەتی و خەبات و كادر بووە، ئەندامی دەستەی نووسینی گۆڤاری مامۆستا بووە، ئەندامی دەستەی نووسەرانی كوردە لە هەولێر. چەندین كتێبی بەپێزی داناوە، لەوانە:

١- كۆمەڵەی ئیخوان سەفا( فەلسەفە – مێژوو – ئەدەب )
٢- اللغه العربیه لتعلیم الكبار.
٣- شەوچەرەی دیوەخان ( فۆلكلۆر).
٤- لەژێر ساباتی كوردەواریدا ( فۆلكلۆر).
٥- ڕۆشنبیری گشتی بۆ گەوران.
٦- پەروەردەی ئیسلامی بۆ سەرەتایی (ئایینی).
٧- خوێندنەوەی كوردی ( فێرخوازان).
٨- شێوە و هاوتاكان لەپیرۆزی قورئان (ئایینی).

✍ مام عەلی پیاوێکی لەسەرخۆ و خواپەرست بوو، هەمی ڕۆژێ بۆ کارکردن دەچووە دەرەوە و دەبوایە بەلای گۆڕستانی چراغ تێپەڕێ تا بۆی بکرایە دوعا و نزای بۆ مردوکان دەخوێند و لەخوا دەپاڕایەوە لێیان خۆشبێ، مام عەلی دیوت: ئەوە نەریتێکی هەمیشەیی من بوو، تەنها ئەو ڕۆژانە نەبێت کە نەخۆش دەکەوتم یا شولێکی تایبەتم هەبوایە و بۆم نەلوایە بەو شوێنە گوزەر بکەم.

شەوێکیان لەخەوەمدا بەلای گۆڕستانەکە تێپەڕیم، دوعام بۆ مردوان دەکرد و فاتیحام بۆ دەناردن، تەماشام کرد خەڵکی گۆڕستانەکە هەر یەکە دەفرێکی دەدەست دایە و وردە وردە وا خەریکن ئەوەی من دەیڵێم و دەیخوێنمەوە، تەنها یەك لە مردەکان نەبێ لەژێر سێبەرێك دانیشتووە، منیش لێی چوومە پێش و پێموت: مامەگیان سڵاوی خواتان لێبێ.

+ سڵاوی خوا لەخۆتان.

–مامە ئەو خەڵکە لەو گۆڕستانە چی کۆ دەکەنەوە؟

+ خێر و دوعا و تکای تۆ.

–ئەی باشە بۆچی جەنابتان وەکو ئەو خەڵکە ئەو دوعا و خێراتانە کۆ ناکەنەوە؟

+ کاکی خۆم، ئەو خەڵکە مەبەستم ئەو مردوانە پێویستییان بەو جۆرە دوعایانە هەیە، بەڵام من پێویستیم پێی نییە.

–چۆن پێویستیت پێی نیە، چما ئەوانیتر موحتاجی ئەوەن؟

+ ئاخر هەرکی منم شوکر بۆ خوا کوڕێکم هەیە لە دوعا و خێردا بێ بەشم ناکا.

– یانی ئەو کوڕەت لە ژیان ماوە؟

+ بەڵێ، لەنێو بازاڕدا کار دەکا و لۆبیا دەفرۆشێ.

– ناوی کوڕەکەت چی یە؟

+ ناوی مەجیدە.

مام عەلی وتی: کاکە، کە وەخەبەر هاتم، قاوەڵتی بەیانیم کرد و بەرەو شار بەڕێکەوتم، بەگەڕان و پرسیارکردن مەجیدی کوڕی کابرام لێ بەدیار کەوت، چوومە پێشی.

---

ئەم کتێبانە ئامادەن بۆ چاپدان:

١- بەخت و تەخت یان نەخت و ڕەخت (فۆلکلۆر)

٢- برای جوانخاسم ناتناسم (وتار و دەمەتەقێ).

٣- سکاڵام بۆ تۆیە ( شیعر).

+ سەلام و عەلەیکوم.

– وەعەلەیکوم.

+ ناوی جەنابتان چی یە؟

– مەجید.

+ کاکە من ئیمشەو لە خەونێ دا باوکی تۆم بینی و هەندێ گفتوگۆمان کردن ئەو باسی تۆی بۆ کردم کە تۆ ناوت مەجیدە و لە بازاڕێ دا لۆبیافرۆشی دەکەی.

– توخوا باوکم چۆن بوو؟

+ باوکت زۆر باش بوو.

خەونەکەی بۆ گێڕاییەوە.

مام عەلی وتی: هەندێ جار زوو لەماڵ وەدەردەکەوتم، تا لەگەڵ مەجید قسان بکەم، شەوێکیان دیسان خەونم دیتن، تەماشام کرد باوکی ئەو مەجیدە ئەویش وەکو خەڵکی گۆڕستانەکە یانی مردووەکان وا دەفرێکی لەدەستدایە دوعا و خێران کۆ دەکاتەوە، لێی چوومە پێش.

+ سەلامو عەلەیکوم.

– وەعەلەیکومە سەلام هۆ کاك.

+ ئەوە چۆنە تۆش خۆت وا خەریك کردووە؟

– داخی گرانم مەجیدی کوڕم مردووە و منیش بێبەش بووم لە خێر و دوعایان.

+ توخوا ئەوە کەی بووە؟

– ماوەی چەند مانگێکە.

+ ببوورە بەخوای نەمزانی، ئیشەڵلاً خوای گەورە عەفووی دەکات.

– ئیشەڵلاً.

مام عەلی وتی: کە لەو خەوە ڕابووم، خەونەکەم هاتەوە یاد، هەر زوو بەرەو بازاڕ چووم و پرسیم: ئەرێ ئەدی کاك مەجید؟

یەکێك وتی: مامە ئەوە ماوەی چەند مانگێکە مردووە.

منیش لەو ڕۆژەوە بڕیارمداوە تا لە ژیان ماوم، خێر و چاکە و دوعا بۆ خانەوادە و خزم و دۆستان و مردوان بکەم، چونکە بۆم دەرکەوتووە مردووەکان ژیانێکی تریان هەیە و پێویستیان بە کردەوە و ڕەفتار و چاکە و باشەی زیندوان هەیە.

✍✍بەسەرهاتی دووەم:

## ئەو کوڕەی بەشەونوێژ و دوعای دایکی تەسریح بوو

📖 ڕۆژێکیان ئاراسی مام شێخ بۆی گێڕامەوە وتی:

✎ لەشەڕی هەشت ساڵەی ئێراق-ئێران (١٩٨٠-١٩٨٨)جلی سەربازیم لەبەرکرد، تاقانەی ماڵەوە بووم، تازە خەتی سمێڵم دانابوو، بژێوی شەش خوشك و دایکێکم کەوتبووە شان، هەر کەسێك بچێتە بەرەکانی جەنگەوە، بەتەمای خۆی نیە بە زیندوویی بگەڕێتەوە.

وەزعی ماڵەوەمان لەوپەڕی خراپی بوو، چوار مانگم ڕاکێشا، کات: چێشتەنگاو بوو، لەگۆڕەپانی ئەو یەکەی مەشقیان پێ دەکردین، ڕیزمان بەستابوو، کت و پڕ شێخێکی دەستڕۆیشتووی عەرەب لەگەڵ ئامری وەحدەکە هات، لەنێو ئەو حەشاماتە زۆرەی ئەو گۆڕەپانە دەستی بۆ من درێژ کرد، خورپەیەکم بەدڵ داهات، ترسم لێ نیشت، لە دەروونەوە بەخۆمم وت: دەبێ چیم کردبێ؟ تۆ بڵێی تووشی کێشەیەك نەهاتبم و ناویان بەپێشمەرگە لەقەڵەم دابم؟

گەڕانەوە، ئەوەندەی نەبرد یەك لە ئەفسەرەکان کە یاوەری شێخەکەی دەکرد، هات لەدوورەوە بەئیشارەت بانگی کردم، لەڕیز هاتمە دەرو کەوتمە دوای، لەو ژوورەدا لەنگەرم گرت کە ئەوی تیا دادەنیشت.

هەندێ پرسیاری لێکردم، بەپێی وەڵامەکان هەموو ئەو شتانەی لەلای خۆی نووسی و وتی: ئێستا دەتوانی بڕۆی.

سەلامم بۆی کرد و ڕووم وەرگێڕا، گەڕامەوە ناو سریەکەم، دوو دڵی باڵی بەسەردا کێشام، ئەو شەوە تاوەکو درەنگی وەخت بیرم بەو باسەوە خەریکما، منێکی کورد و شێخێکی عەرەب کوجا مەرحەبا، شێخێك نەدەیناسم، نەپێشتر بینیومە بۆچی لەناو ئەو هەموو خەڵکە دەستی بۆ من درێژ کرد؟ دەبێ بە کێم تێکەیشتبێ؟ دەبێ نەمکوژن؟ ناهەقم نەبوو لەو بارودۆخە دژوارە بترسم، دەزگای مەخابەرات ئەوەندە بەهێزبوو هەزار و یەك گومانی خراپم بە مێشك داهات، پێش نووستن، دووڕکات نوێژمی حاجە و هەشت ڕکات شەونوێژم کرد وخەوتم، ڕۆژی پاشتر هیچ شتێکی وا نەقەوما، دوای دوو ڕۆژ دووبارە بانگیان کردمەوە، بەهەناسەی سوارەوە ڕۆیشتم، تف لەگەرووم وشك ببوو، گومانم دەبرد منیان بە سیخور لەقەڵەم دابێت، بەمەش چارەنووسم تەنها و تەنها کوشتنە، ئەوجا چیبکەم؟ قوڕی کێ بکەم بەسەری خۆما، هەڵاتن دادم نادات،

وەلێ ترسەکەم بە ئارامی و دڵتەنگیم بە خۆشنوودی گۆڕا، کاتێك لە گەرمەی شەڕێکی کاولکاریدا دەفتەری تەسریح بوونیان پێدام: پیرۆزە برۆ خوات لەگەڵ.

نەمدەزانی ئەوە خەونە یا زیندەخەو و خەیاڵ؟ منێك نە کەس بناسم، نەواستەم هەبێت، ئەی ئەو شتە چی بوو بۆ من ڕێککەوت؟ برادەرەکانم سەرسام بوون ئاخۆ ئەو واستە بەهێزەم لەکوێ پەیداکرد؟ دەیانوت:هەی شەیتان ئێمە دەمانوت مێش لەدەمت ناکەیتەوە، کەچی کوڕێکی هۆشمەند و زۆرزان دەرچووی.

هیچ وەلآمێکم پێ نەبوو چونکە دوور و نزیك نەمدەزانی باس و خواسی ئەو ڕووداوە چیە و چۆنە؟

بەخۆشحاڵیەوە گەڕامەوە ماڵ، کاتێك بەماڵەوەم وت: تەسریح کرام.

دایکم بەچەپەڕۆك لەسینگی خۆیدا: کوڕم لەو ئاگربارانە چۆن تەسریح کرای؟ هەبێ و نەبێ تووشی نەخۆشیەکی کوشندە هاتوویت و چەندین ساڵە لێمانت شاردۆتەوە.

دایکم گریا، بەدوایەوە خوشکەکانم کەوتنە گریان.

کە بەسەرهاتی خۆم و شێخە عەرەبەکەم بۆ گێڕانەوە ئەوجا باوەڕیان هات و گەلێ سوپاسی خوای گەورەیان کرد کە منی بەوان دایەوە تا لەمەودوا ئاگام لێیان ببێت و بەخێویان بکەم.

دایکم دەیگێڕایەوە، دەیوت: کوڕەکەم لەو ڕۆژەی بوویتەتە سەرباز و جلی سەربازیت پۆشیوە، شەو نەبووە دوعات بۆ نەکەم؟ شەونوێژ نەکەم و لەو خوایە نەپاڕێمەوە خودا سەلامەتت بکات و بتگەڕێنێتەوە، دیارە خوا نزاکانی قبوڵکردووین و ئەو شێخەی کردە سەبەب بۆ تەسریح بوونت. (سوپاس بۆ خوا).

* * *

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( دوو شت نەوەکانی ئادەم ڕقیان لێدەبێتەوە، یەکەمیان: مردن لەکاتێکدا مردن باشترە لەوەی تووشی ئاشوب و فیتنە ببێت، دووەمیش هەژاری و نەداری، ئەمیش باشترە بۆی لەکاتی لێپرسینەوەی قیامەتدا)( سلسلة احاديث الصحيحة/١٣٦)

## ۞بەسەرهاتێکی سەیری پیرێژنێك پێش مردن۞

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( هەرکات بەندە گوناهێکی کرد، ئەوا خاڵێکی ڕەش لەدڵیا دروست دەبێت، خۆ ئەگەر گەڕایەوە ئەوا خاڵەکە دەسڕێتەوە، ئەگەر بەردەوام بوو لەسەر تاوان و تەوبەی نەکرد، ئەوە لەسەر دڵی کۆدەبێتەوە و بەسەریدا زاڵ دەبێت) (رواه احمد و الترمذي)

✍ ئەفلاتون دەڵێ: تێکەڵ بەو جۆرە کەسانە مەبن کە ناتوانن نهێنیەکانی خۆیان بپارێزن.

✍ کاك (تاهیر مستەفا)ی هاوڕێم قسەیەکی جوانی هەیە هەمیشە دووپاتی دەکاتەوە، دەڵێ: خوای پەروەردگار تەماشای بەندەکانی دەکات ئەوانەی کە لەدزی و فزی یا داوێنپیسی و خراپەکاری ئاشکرا دەبن، بۆ کاری یەکەمجاریان (ئەوانەی ئیشی یەکەمیانە) چاوپۆشیان لێ دەکات، دەرفەتیان پێ دەدات بەخۆیاندا بچنەوە، تۆبە بکەن و بگەڕێنەوە، بەڵام دوای ئەوەی چەند جارێ هەمان شتیان دووبارە کردەوە، ئەوە بەندەکان خۆیان بەشانازییەوە بەدەمی خۆیان هاوار دەکەن: ئەو دزیەم کرد، ئەو ئیشەم لەگەڵ ئەو ئافرەتە کرد و..هتد، دواجار خوای پەروەردگار سووك و چرووك و ریسوایان دەکات و نهێنیەکەیان لێ ئاشکرا دەکات تا خەڵك بیانناسێ، بزانن چ بەشەرێکن!

📖 پیرەژنەکە لەسەرە مەرگدابوو، بەسەرهاتی خۆی گێڕایەوە، وتی [°]:

---



ئەم بەسەرهاتە مامۆستای ڕێزدار(عادل عوبید عومەر) لەدایکبووی ١٩٦٨ دەیگێڕێتەوە کاتێك دەبێتە سەرباز و ساڵی ١٩٩٠ دەچێتە(معهد دیفاع جوی) لە (محاویل)، لەو شوێنەدا کابرایەکی ڕەشەی چوار شانە دەناسێت، وەکو خۆی دەڵێت: بەبینینی ئەو کابرایە لێی دەترساین، زۆر بەهەیبەت بوو، کابرایەکی کەتە، هەردوو قۆڵی کوتابوو، ڕەسمی مار و دووپشکی لەسەر قۆڵەکانی نەخشاندبوو، کابرایەك بوو هەتا لەنزیکەوە نەتناسیایە نەتدەزانی چ کابرایەکی دەم بەخەندە و قسە خۆشە،

لەخێزانێك چاوم هەڵێنا، حەوت برام هەبوو، خۆیشم کچە تاقانەیماڵەوە بووم، وردە وردە خۆم ناسی، گەورە بووم، بوومە کچێکی ئاقڵ و زیرەك و سەنگین، چونکە دایك و باوکم نەمابوون، براکانم گەورە و بچووك ڕێزیان دەگرتم و خۆشیان دەویستم.

مـن ببوومـە مامـە خەمـە و دەمڕاسـتیان، پـرس و ڕایـان بـەمن بـوو.. مشـوورم لەهەموویان خوارد، ژنم بۆ یەکە بە یەکەیان هێنا، دواکەس برا بچووکەکەم بوو کە ژنم بۆی هێنا، بەڵێنم لێی وەرگرت لەو ماڵە بمێنێ و وەکو ئەوانیتر جیا نەبێتـەوە و ماڵی خـۆی نـەکات، بـەگوێی کـردم، خـۆیی و خێزانـی لەگـەڵ مـن لـەو خـانووەدا مانـەوە کـە لەباوکمەوە بۆمان بەجێ مابوو.

گەنجێکی جوانی ئاوایی سەرنجی ڕاکێشام حەزی لێبکەم و لەناخەوە خۆشم بوێـت، ئیلاقـەم لەگـەڵی بەسـت، نـاو بـەناو جـێ ژووانمـان گـەرم دەکـرد تـا دواجـار شـەیتان زەفەری پێ بردم دەستەمۆی ببم، بەجۆرێ ئاوێزانی یەك ببوین، هەست و هۆشی بردم ئاگام لەخۆم نەما و تەسلیمی حەزە شێتەکانی بووم، سەرەنجام کچێنی خۆم لەدەست دا[٥١]

ئاااااخ، چ کارێکی گەمژە و نەفامانەم ئەنجامدا؟ کارێك ئەوەندە لێی پەشیمان بووم، پەشـیمانی دادی نـەدام، خـوێنی ناموسـم تکـا و بێڕێـزیم بەرامبـەر خوێنێـك نوانـد براکانم بزاننەوە لێم لەسەر ناچێ و نامبوورن.

مەعشـوقە فریودەرەکـەم هـەر زوو لـە ترسـی ڕۆحـی خـۆی نـەك لەبـەر مـن، بـەناوی سەردانەوە ڕایکرد و گوندی بەجێ هێشت، ئەوەی بۆ منی سەرگەردان مایـەوە تـەنها گریان و فرمێسکڕشتن بوو بۆ حەزێکی سەرشێتی چەند چرکەیی کە دەبێ بەدرێژایی تەمەنم باجەکەی بدەم.

هەر بەجەستە لەسەر دنیا بووم، وەئەگینا سـەری دنیـام لـێ وێکهـاتبۆوە نەمـدەزانی چیبکەم؟ پـەنا ببەمـە بـەر کـێ؟ ماوەیـەك تێپـەڕی، هەسـتم کـرد بـێ خوڵـق و خـۆ و بێتاقـەتم، بێـزووم دەبۆوە، ئـارەزووی خـواردن و خواردنـەوەم نـەما، دەڕشـامەوە، زگـم

---

ئەو کابرایە کاتێك ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕامەوە ، لەناخەوە هەست و نەستی جولاندم، ئەویش بەسەرهاتی پیرێژنێکی تەمەن هەشتا ساڵەبوو، خودی ژنەکە پێش مردنی، بەسەرهاتەکەی بۆ دایکی گێڕابۆوە، لەوە دەچوو هەر زانیویەتی دەمرێت و ئەو شتانەی هەر لەناو دڵدا لێ بووەتە گرێ و خواش ویستی لەسەر بووە ئەو بەسەرهاتە ئاشکرا ببێت.. ئەم بەسەرهاتە پێش نیوەی سەدەی ڕابردوو ڕوویداوە.

[٥١] – پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: لەنێوانی دوو کەسی نامەحرەمدا، کەسی سێیەم شەیتانە.

پەیدا کرد، زگەکەم هێدی هێدی گەورە بوو، ناچاربووم مشوورێك لەخۆم بخۆم ، چونکە ئاشکرابوونی ئەو زگە دەبووە پەڵەیەکی ڕەش و سەری عەشیرەتەکەمی پێ شۆڕ دەکرد، ئەوەش ئەوپەڕی شوورەییە و براکانم هەرگیز لێمخۆشنابن و لەت و پەتم دەکەن، سەرم دەپەڕێن و دەمکەنە پەندو پۆی زەمانە.

ئەو ماوانە نەخەوم خەو بوو، نە خۆراك، هەمیشە ئەندێشەم بەرەو جیهانێکی دوور دەفڕی، لەبەر خۆوە دەموت: چۆن خۆم لەو زگە نەفرەتیە ڕزگار بکەم؟ چۆن لەباری ببەم و تا هەتایە ئەو نهێنیە بشارمەوە؟ هیچ چارەیەکم چنگ نەکەوت جگە لەوەی ترشبێت و تاڵبێت، دەبێ بچمە لای ژن برای بچووکم و بەنهێنی حارومەسەلەی خۆم و گەنجەکەی بۆ بگێڕمەوە، بە ترس و بیم و دڵەڕاوکێیەکی پڕ گومانەوە پێم هەڵێنا، چوومە لای، بەکوڵێ خەم و خەفەت و جەخارەوە فرمێسکم بۆی داباراند، لەنووکەوە بەسەرهاتەکەم بۆی باس کرد، پەرۆشی خۆی بۆ دەربڕیم و بەڵێنی پێدام نهێنیپارێزمبێت کە ئەوەی لەدەستیبێ یارمەتیم بدات، لەو سەروبەندە کەوتینە گفتوگۆ، چیبکەین؟ پەنا بەرینە بەر کوێ؟ دواشت ئەوەمان بەمێشك داهات بۆ لەباربردنی زگەکە بەناوی سەردان بچینە گوندێکی ئەو دەوروبەرە کە دەمانزانی مامانێکی بەساڵاچووی لێیە، بەبیانووی سەردانەوە خۆمان ئامادە کرد، خۆمان پێچایەوە بەرەو گوندەکە ڕۆیشتین، بەپرسیار چووینە بەردەم ماڵی مامانەکە و چووینە ژوورەوە، دوای سەلام و کەلام، نەخۆمان پێی ناساند بڵێین: ئێمە فلان و فلانین، نەئەویش ئێمەی ناسیەوە، ئەوە بۆ من شتێکی باش بوو.

براژنەکەم دەستی بۆ من درێژ کرد، بە هەڵبەستنی درۆو دەلەسەیەکی شاخدارەوە ڕووی کردە مامانەکە و پێی وت: پووریێ گیان ئەو ژنە هاوگیانمە، بەهەمووی چەند ساڵێکە شووی کردووە، پیاوەکەی هیچ و پووچە و زۆریش لەگەڵی خراپە، ڕۆژ نیە دارکاری نەکا و سەروگوێلاکی نەشکێنێت، ئەو ژنەش لەتاوا وایلێهاتووە چەندین جار پەنا بباتە بەر خۆسووتاندن و خۆکوشتنی خۆی، بەڵام ئەوە منم دڵی دەدەمەوە ناهێڵم پەنا بۆ ئەو کارە قێزەونە ببات، وابزانم ژیانێك بەو شێوەیەبێ مەحاڵە تا کۆتا بەردەوامبێ، ئێستاش زگی لێی هەیە و ئێمەیش خۆمان حەزناکەین منداڵی لێی ببێت چونکە دڵنیایین ئەو زەواجە تاسەر نییە و ئەگەر ببێتە خاوەنی دە منداڵیش چارەنووسی کۆتاییەکەیان تەنها و تەنها دەست لێکبەردان و جیابوونەوەیە.

مامانەکە باوەڕی پێکرد، سەری بۆ قسەکانی لەقاندو لەڕێی خۆیەوە هەستا کۆرپەلەی

نێو زگەکەمی لەبار برد، هەر ئەو ڕۆژە ڕێ و ڕێ گەڕاینەوە گوندی.

بە زانینی شووبراکەم بۆ ئەو کارە، نهێنی خەمەکانمی کردە دوو خەم، ئەو قسە ڕاستە کە دەڵێ: نهێنیت لەلای هەر کەسێك درکاند دەبیە کۆیلەی ئەو کەسە.

ساڵێك بەسەر ئەو ڕووداوە ڕابرد، گەنجە تەڵەکەبازەکە زانی دنیا شامی شەریفە کەس باسی ناکات و هیچ لەگۆڕێ نیە و نەمنیش زگم هەیە، هاتەوە گوندی، دەرفەتێك ڕەخسا بینیم و بەدزییەوە قسەمان کرد، سەرەتا بەدەم هەڕەشە و گوڕەشەوە پێموت: هەی ماڵوێران بزانە چ قوڕێکت بۆ گرتمەوە؟ فەرموو چ جای ئەوەی منت لەکچێنی کەواند، بەوەندە نەوەستای وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچووی، شوکر خوا ڕەحمیکرد توانیم چارەی زگەکەم بکەم کە ئێستا نە زگم هەیە و نەهیچی، کورە با ئەو کێشەیە لەوەندە بوەستێت و حەیامان نەچێ، چونکە مانەوەی من بەم وەزعەوە سەرگەردانیە هەتا بمێنم ناتوانم مێرد بەکەس بکەم، بۆیە داوات لێ دەکەم پیاوانە وەرە پێش، وەرە داخوازیم و بمهێنە.

ئەویش دایە قاقای پێکەنین و بەهەڵپەیەکەوە وتی: ببوورە بەتەمای ژنهێنان نیم، ئەسڵەن هێشتا بیرم لە ژنهێنان نەکردۆتەوە، بۆیە چاوەڕێی من مەبە بێمە پێش.

نەختێ سەرم بۆی لەقاند، ئەوجا زمانی خۆم گەست، بۆم ڕوون بۆوە کە منی فریو داوە، منی تەنها بۆ ڕابواردن و دەست گەرمکردنەوەی خۆی ویستووە..بیرم کردەوە چۆن لەخشتەی ببەم و تۆڵەی خۆمی لێ بکەمەوە! بەدەم زەردەخەنەیەکەوە لێی چوومە پێش، پێموت: دەی کەیفی خۆتە، زۆرت لێ ناکەم بەزۆر بمهێنی، تۆ هەر نیەتت وایە ژن نەهێنی و منیش هەر دەبێ تا مردن قژی ڕەشم سپی بکەم و بیهۆنمەوە و لەماڵەوە دانیشم، بۆچی بۆخۆمان ناوەناوە پێکەوە ڕانەبوێرین؟

بەو قسانە کوڵێ کەیفسازبوو ، بەخۆشحاڵیەوە وتی: ئەوجا چۆن یەکتر ببینین؟

بەدەم زەدەخەنەیەکەوە پێموت: برایەکەم بەتەمایە ئەمشەو بچێتە ڕاو، کەسی وا لەماڵمان نیە جگە لە براژنەکەم، چاوەڕێت دەکەم، سەعات دوانزەی شەو بەسەر دیوارەکە خۆت ئاودیو بکە و وەرە ماڵمان و ئەو دوو ژوورەی لەپێشەوە هەمانە ژوورێکیان براژنەکەم لێی دەخەوێت و منیش لەژوورەکەی تر ، براژنەکەم بێ شك دەرگا لەسەر خۆی شیش دەدات، منیش وەکو نیشانە دەرگای ژوورەکەم دەکەمەوە، دەیخەمە سەر پشت، بەبێ چرپە و بەهێواشی وەرە ژوورەوە، یەکسەر وەرە ناو جێیەکەم.

کوڕەکە لەخۆشیان دەمی بەش بۆوە، ئاهێکی قووڵی پڕ بەسیەکانی هەڵکێشا،لە چاوەڕوانی ئـەو شـەوە وەستا کـەی ببێتـە سـەعات دوازدە و بێتـە ماڵمـان لەگـەڵم رابوێری؟ ئەو نەزانە ئاگای لـەوە نیـە چ نەخشـەیەکم بۆی کێشاوە تـاوەکو سـەری بەفەتارەت بدەم و لەکۆڵ دنیای بکەمەوە. بیرم لەهەموو ئەو شتانە کردەوە بەیەك بەرد دوو چۆلەکە بکوژم ئەویش کوشتنی ئەو کوڕە و کوشـتنی براژنەکەم بوو بۆ ئـەوەی ئەو نهێنیە بۆ هەتا هەتایە لەگۆڕنێم ، کەس بەو نهێنیەم نەزانێ.

خـۆم گەیانـدە بـرا بچـووکەکەم، بەشـێنەیی پـێم وت: براکـەم شـتێك هەیـە دەمـەوێ ئاگادارت بکەمەوە تاوەکو ئەوها بەشاراوەیی نەمێنێتەوە.

برا بچووکەکەم بەتەسـەوە وتـی: تـۆ خوشـکی گـەورەمانی، فـەرموو قسـە بکـە ئـەوە گوێم بۆ گرتووی.

دەستم بە قسەی هەڵـەتی و پەڵـەتی کرد، پێم وت: ڕۆژانـە کـە دەچیە دەرەوە ئاگـات لەوە نییە و نازانی لەم ماڵەدا چی ڕوو دەدات، جا قسە بۆ برای خۆم بکەم، ماوەیەکە هەسـتم کـردووە خێزانەکـەت کـە براژنـی منـە پەیوەنـدی ناشـەرعی لەگـەڵ فلانـە کـوڕ بەستووە، بەو گوێیانەی خۆم گوێم لێبوو ئەمڕۆ مەوعیدیان بەیەکدا ئەمشەو سـەعات دوانزەی شەو یەکتر ببینن و لەگەڵ یەکدی ڕابوێرن، ئەوەش لەگـەڵ ڕەوشـت و ئاکـار و داب و نەریتی ئێمە ناگونجێت، بۆیە دەبێ بوێرانە لێیان بێیتـە دەسـت و هـەردووکیان بەسزای خۆیان بگەیەنی، پێمباشە ئێستا خۆت لەگوورە نەبەیت و بەناوی چوونە ڕاو، دوای نـانخواردن بچـیە دەرەوە، پـێش دوانـزەی شـەو بەچـارەگێك، نیـو سـەعات بـڕۆ لەسووچێکەوە خـۆت مـەلاس بـدە و سـەرنج بـدە کـەی کوڕەکـەت بینی بەسـەر دیـواری حەوشە بازی دا و خۆی ئاودیوی ماڵمان کرد، کەی چووە ژوورەوە دەرفـەتی هـەڵاتنی پێ مەدە و لەجێوە هەردووکیان سارد بکەوە و بیانکوژە.

براکەم تف لەگـەرووی وشـك ببـوو، پتـت لێـی بدابایـە دەتـەقی، وتـی: خوشـکەکەم، چۆنت وت وا دەکەم.

چۆن ڕێ و جێم بۆی دانا، لەقسـەم دەرنەچوو، دوای نـانی ئێـوارە بـەناوی ڕاوکـردن، ماڵەوەی بەجێهێشت. لەدەرەوە خۆی خافڵاند تا بەرەبەری دوانزەی شەو داهـات، لـەو نزیکانـە خـۆی شـاردەوە، کەوتـە چـاوەڕوانی چـی ڕوودەدات؟ ڕووداوەکـان بـەکوێ دەگەن؟

پێش سەعات دوانـزەی شەو بـەئەسپایی چـووم دەرگای ژووری بـراژنەکەم کـردەوە

ئەوجا بەهێواشی گەڕامەوە ژوورەکەی خۆم و توند لەناوەوە دەرگاکەم داخست..کاتی خۆی هات، کوڕەکە لەسەر دیوارەوە خۆی هەڵدایە ئەو دیوی ماڵمان ، کەوتە چاوگێڕان بەملا و بەولای خۆی، تەماشای کرد دەرگای یەك لەو دوو ژووره کراوەتەوە، بەخۆشحاڵیەوە پێی نایە ژوورەوە، بەمەیش برا بچووکەکەم تێی ڕوو بوو، لێیان بەژوور کەوت، هەردوکیانی دایە بەر خەنجەر و هەردووکیانی کوشت.

بەم ڕووداوە خۆشیم بۆ گەڕایەوە کە ئیتر کەس بەنهێنیەکەم نازانێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاقە خەفەتێکم مابوو ئەویش ئەوەیە نابێ ببڕای ببڕ مێرد بکەم چونکە خۆم دۆڕاندووە ، ئەوەندەی کوڕی سەرۆك عەشیرەت لێرە و لەوێ دەهاتنە داخوازیم، هەموویانم ڕەت دەکردەوە، کەسیش بەو نهێنیەی نەدەزانی، دواجار ئەوەندەی براکانم ملیان لەبەر ملنام و سەرکۆنەیان کردم ئەوەندەی پێم بڵێن: تاکەی ئەوها دەمێنیەوە؟ ئیێ بۆ شوو ناکەی؟ کێشەت چیە؟

بەسەر فێڵیان کەوتم، پێیانموت: دەی مادام هەروا دەڵێن: شووبکە، شووبکە، فەرموو من شوو بەو ئامۆزایەم دەکەم.

ئامۆزایەکم هەبوو زوو زوو پەرکەم دەیگرت وەکو نیوە مردووی لێ دەهات، چەند براکانم وتیان: ئاخر ئەو ئامۆزایەت نەخۆش و ناتەواوە پێویست ناکا شووی پێبکەی..وتم: ئەگەر ڕازین و دەتانەوێ مێرد بکەم هەر ئەوەیە داوام و تەواو، دوای ئەوە خۆ ئەو کابرایە بێگانە نیە، ئامۆزای خۆمە و لەئامۆزا کێوە؟ بۆ خۆم ئاگام لێی دەبێت و تا مردن خزمەتی دەکەم.

شووم بە ئامۆزاکەی کرد، منی گواستەوە، لەیەکەم شەوی بووك و زاوایی، بێ ئەوەی ئامۆزاکەی لێم نزیك بێتەوە، کت و پڕ پەرکەم گرتی وەکو شێتی لێهات، منیش ئەوەم بەدەرفەتزانی مەسەلەی دۆڕانی کچێنی خۆم بەیەکجاری پێ بشارمەوە و لەسەر ئەوی ساغ بکەمەوە، لێی چوومە پێش، توند پەلاماری قوڕگیمدا و خنکاندم، ئەوجا بەچەقۆ برینێکم لە قاچی خۆم کرد، هەندێ لەخوێنەکەم کردە سەر خامەی بوکێنی کە وانیشانی هەموو لایەکی بدەم لەو شەوەدا بوومەتە ژن .

ئەو شەوە بەئیسراحەت لێی خەوتم، بەیانی کاتێك هەستام و هەندێ نانم خوارد، بەدرۆ دامە قاژوقیژ، هەمووان لێم خڕ بوونەوە، وتیان: ئەوە چیبووە؟ چی قەوماوە؟ بەدەم فرمێسك ڕشتن و گریانی درۆینەوە لەخۆم دەدا، دەمگوت: ئەو ئامۆزایـــەم هیچ

عەیبی نەبوو بۆ خۆمان تا درەنگی شەو بەیەکەوە قسەی خۆشمان کرد، پێکەوە جووتبووین و ڕامانبوارد، قسمەت نەیکرد بەیانی کە لەخەو هەستام، نانی بەیانیم حازر کرد بەیەکەوە نان بخۆین، چەندی بانگم کرد دەنگ نەبوو توومەس لە لەخۆشیان هەر لە شەوێوە مردووە.

تازەیەمان بۆی دانا، ماوەیەك تێپەڕی، ئەوجا بە یەکجاری ئیسراحەتم کرد کە ئەو خەمەشم لەکۆڵ بۆوە، ئیدی لەمەودوا دەتوانم بەشانازییەوە بڵێ: سەربەرزم، من بێوەژنم و کەس بێ ئەدەبی بەرامبەرم نەکردووە.

ئەو کاتە هێشتا ناسك و نازدار و جوان بووم، داخوازیکەرم زۆر بوو، چەند داخوازییەکەم هات ، ئەقڵم یەك لەکوڕە عەشیرەتەکانی گرت، ڕازیبوونی خۆم پێی ڕاگەیاند و مێردم کرد، بوومە خاوەنی بڕێك منداڵ.

ئێستاش دوای تێپەڕبوونی تەمەنێك نەمتوانی ئەو نهێنیە تا سەر بشارمەوە،کە بیر لەو ڕابردووی خۆم دەکەمەوە ویژدانم ساڵەهای ساڵە ئازارم دەدات.

✎ لەومەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ:

۞یەکەم: مرۆڤ بەدرکاندنی هەر نهێنیەك لەلای هەر کەسێك، دەبێتە دیل و ئەسیری ئەو کەسە، تەنانەت هەندێ جار ترس و بیم و گومانکردن لەئاشکرابوونی نهێنیەکەی، وای لێ دەکات پەنا بباتە بەر کوشتنی کەسی بەرامبەر.

۞دووەم: زوڵم و جەور و ستەم چەند درێژە بکێشێ (با ئەو زوڵمە نهێنیش بێت) ڕۆژێك دادێ ڕووی ڕاستەقینەی بۆ خەڵك ئاشکرا دەبێت.

۞سێیەم: ئەو مرۆڤانەی پەنا دەبەنە بەر کوشت و بڕی ئەم و ئەو، ئەگەر بەڕووکەش خۆیان نیشان بدەن گوایە دڵخۆش و بەختەوەرن، لەناخەوە هەست بە ناڕەحەتی و نیگەرانیەکی زۆر دەکەن بەجۆرێ پێیان وایە چی بکەن و پەنا بباتە بەر هەرچییەك، ناتوانن خۆشنوودی و ئاسوودەیێ بۆ دڵ و دەروونی شەکەتیان بگەڕێننەوە.

ئاینی پیرۆزی ئیسلام تۆبە و گەڕانەوەی یەکجاری بۆ لای خوای پەروەردگار کردۆتە سەرچاوەی پاکبوونەوە و شووشتنەوەی دڵە ژەنگدار و ناخە پیسەکان بەو مەرجەی جارێکی تر بۆ کارەکانی پێشووی نەگەڕێتەوە.

* * *

# ۞ سەگ بەوەفایە ۞

📖 لە (ابو هريرە)ەوە(ڕەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (لەکاتێکدا پیاوێك دەڕۆیشت بە ڕێگایەکدا زۆر تینووی بوو، بیرێکی بینی دابەزییە ناوی و ئاوی خواردەوە، پاشان هاتە سەرەوە بینی سەگێك زمانی دەرهێناوە و لەتێنووا قەپ بە خۆڵەکەدا دەکات، پیاوەکە وتی: ئەو سەگە وەك منی لێ بەسەر هاتووە لە تێنوێتیدا، دابەزیەوە ناو بیرەکە و پێڵاوەکەی پڕ کرد لەئاو و بە قەپ گرتی هەتا سەرکەوت و سەگەکەی ئاودا، خوا ئەو کردەوەی لێوەرگرت و لێی بورد). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لەم ئاژەڵانەدا خێرمان دەست دەکەوێ؟ فەرمووی: ( لە هەموو جەرگێکی تەڕدا پاداشت هەیە)[52]

ئەو سەگەی شەو تا بەیانی پاسی ماڵ و ماڵاتی خاوەنەکەی دەکات بێ ئەوەی کەس چاودێری بکات، کێ فێری کرد؟ ئەوەش ڕێنموونی سروشتی (فطرية)تە؟

سەگ زوو هۆگری مرۆڤ دەبێت، بۆیە لە کۆنەوە مرۆڤ سەگی ماڵی کردووە و سوودی لێ وەرگرتووە. پاشماوەی سەر کوڵراوە بەردینەکان ئەوەیان سەلماندووە کە سەگ یەکەمین گیانلەبەر بووە مرۆڤ بەخێوی کردبێ. کۆنترین ئێسکەپەیکەری سەگ لە ئەشکەوتەکانی کوردستانی خۆمان دۆزراوەتەوە.[53]

---

[52] – عن ابي هريرة(ﷺ): ان رسول الله(ﷺ) قال: ( بينما رجل يمشي بطريق اشتد عليه العطش، فوجدبئرا فنزل فيها فشرب، ثم خرج فاذا كلب يلهث يأكل الثرى من العطش، فقال الرجل: لقد بلغ هذا الكلب من العطش مثل الذي كان بلغ مني، فنزل البئر فملاء خفه ماء، ثم امسكه بفيه حتى رقي فسقى الكلب، فشكر الله له، فغفر له). قالوا: يا رسول الله، وان لنا في (هذه) البهائم لاجرا؟ فقال: ( في كل كبد رطبة اجر).(بخاري/المساقاة/٢٢٣٤)

[53] – کوردستان خاڵێکی گەرمە: حسێن حاجی قادر نادری،چ ١، س ٢٠١٢ چاپخانەی شەهاب هەولێر، لەلاپەڕە –٢٢٨– ئاماژەی بەبەناوبانگترین جۆرەکانی سەگ کردووە، لەوانە :

١–سەگی دنگۆ: لەدەرەوەی شار و گوندەکانی ئوسترالیا دەژین.

٢–سەگی وشکانی هیندی: مێندەی چەقەڵێك دەبێت و بە کۆمەڵ دەژین.

٣–سەگی ڕاوی ئەفریقایی: لەباشووری ئەفریقادا هەیە.

٤– سەگی بەرخ: گەورەو بەهێز و تووك درێژە.

٥– سەگی کوڵی: سەگی پاسەوانییە و لە هەموو جیهاندا هەیە.

٦– سەگی ڕاو: زۆر جوانە، بەبێ نێچیر ناگەڕێتەوە.

٧–سەگی کوڵەمستی( بۆکسێن ): لە ئاڵمانیا هەیە.

سەگ هەیە بۆ ئاگرکوژێنەوە.. بۆ پۆستەچی.. بۆ مین و تەقەمەنی.. بۆ فریاگوزاری و فریاکەوتن لەدەم رووبارەکان کە ئەگەر منداڵێك کەوتە ئاوەوە ڕزگاری بکات و ...هتد.

لە ڕۆژنامەیەك خوێندمەوە: لە وڵاتی (یابان) نزیکەی ( ١٦ ) ملیۆن سەگ هەیە لەکاتێکدا ڕێژەی منداڵ هەر دە ملیۆن منداڵێك دەبێت، هۆکاری کەمی ئەو ڕێژەیەش بۆ دوورکەوتنەوەی گەنج لە پرۆسەی هاوسەرگیری لەلایەك و لەلایەکی دیکە بۆ ڕێگەنەدان بەمنداڵ بوون دەگەڕێتەوە.

ئەمەش وایکردووە ئەوانەی چوونەتە ساڵەوە (بەتەمەنن) ژیان لە تەنیایی بەسەر ببەن، واتا کەسێکی وایان نیە خزمەتیان بکات، لەمەڕ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە وەکو دڵنەوایی و سێبووری هاتنەوە و کوشتنی تەنیایی دا، بۆ خۆیان سەگ بەخێو دەکەن بۆ ئەوەی هەست بکەن کەسێ هەیە لەژیانیاندا هاوشانیانە ئەویش ئەو سەگەیە کە لەماڵەوە ڕایانگرتووە.

✍ئەگێڕنەوە پێغەمبەر(ﷺ) جارێکیان پیاوێك ئەبینێ بە کوژراوی لەدەشتێکا، ئەپرسێ: ئەمە بۆ کوژراوە؟ ئەڵێن: مەڕێکی دزی لە ڕانی "ابو زهرة" سەگی ڕانەکەش هەڵمەتی بردە سەری و کوشتی.

پێغەمبەرﷺ دەربارەی ئەو دزە ئەفەرموێ: ( قتل نفسه واضاع دینه، وعصی ربه، و خان أخاه وكان الكلب خيرا من هذا الغادر) واتە: خۆی بەکوشت دا و، دینی خۆی لەدەست دا و، بێ فەرمانی خوای خۆی و ناپاکی لەگەڵ برای خۆیا کرد، وە ئەو سەگە گەلێ لەم ستەمکارە باشترە.

لەپاشا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بەوانەی کە لەوێ بوون: ئایا ناتوانن ئێوەش ئاگاداری سەروماڵ و ناموسی برای خۆتان بکەن، وەك ئاگاداری کردنی ئەم سەگە بۆ ئاژەڵی خاوەنەکەی خۆی[٥٤]؟!.

سەگی بە وەفا ئامادەیە هەموو ژیانی خۆی لەپێناو خاوەنەکەی دانێ تاوەکو پارێزگاری لەهەموو ئەو شتانە بکات کە بە پێی دراوە و پێی سپێردراوە.

سەگی بەوەفا ناپاکی لەخاوەنەکەی ناکات ئەگەر لەتە نانێکی پێدا بۆی بەئەمەکە و تا مردن ئەو لەتە نانەی لەبیر ناچێ. لەو بەسەرهاتانە:

---

٨- پێشبڕکێ: بەخێرایی ٦٠کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا ڕادەکات.

٩- سەگی خزمەتگوزاری: دەچێتە ژێر ئاو و ماسیش دەگرێت.

[٥٤] – ناڵەی دەروون – شێخ محەمەدی خاڵ- بەرگی یەکەم-،چ ١- ل٩٨

**✍ بەسەرهاتی یەکەم:**

📖 مام (ئەحمەد حەمەد)[*] گێڕایەوە، وتی: (مام عەبدوڵڵای حەمەی مێرەم) (ڕەحمەتی خوای لێبێ ) خەڵکی گوندی (نۆمەرگومەت)ی سەر بە ناحیەی (سێگردکان) بوو، لەو ساڵانەی ڕابردوو وەفاتی کرد، بۆی گێڕامەوە وتی:

مەڕدارێك لەگوندەکەمان هەبوو، خۆی باسی دەکرد، وتی:

ڕۆژانە مەڕەکانم بۆ لەوەڕ دەبردە زورگ و قەدپاڵ گرد و گردۆلکە و چیاوچۆڵی دەوروبەری گوندەکە، بەتایبەت ئەو کەورەی پێیان دەوت: کەوری شێروەزەن[56]، دوو سەگم بۆ پاسەوانی ڕانەکە ڕاگرتبوون، دیقەتم دا ماوەیەکە دەعبایەك بە مێگەلەکەم فێر بووە، شەوانە بەناویان وەردەبێت، مەڕێکی لێ دەبا و بزر دەبێت. نەمدەزانی ئەو دەعبایە چییە؟ هەر وامدەزانی گورگە و سەرسام بووم بۆچی ئەو دوو سەگە لەڕاست ئەو دڕندەیە دەستەوسان ماون و جگە لە مراندن و وەڕین بەولاوە هیچ ناکەن؟

خزماتیم لەگەڵ خەڵکی ئاوایی گوندی سێگردکان هەبوو کە هەردوو گوندەکە ئەقارمان بەسەر یەکەوەیە، چوومە لای یەك لەو خزمانە کە دەمزانی دێڵە سەگێکی زەبەلاحی هەیە، ڕووم لێنا بۆ ماوەیەك چ بە قیمەت یان بەپیاوەتی ئەو سەگەیم بداتێ، ئەویش پێیوتم: بڕۆ بۆ خۆتی ببە چەندی دەتەوێ با لەلات بمێنێتەوە، کەنگێ ئیشت پێی نەما، ئەوسا بۆمی بگەڕێنەوە.

دێڵە سەگەکەم هێنا و گەڕامەوە..وەرزی بەهار بوو، کاتێك ئەو دەعبایە یەك لەو مەڕانە لەسەر شاخ هەڵدەداتە خوارەوە، مڕەمڕ پەیدا دەبێت، کاتێك بەیانی دادێ، تەماشای دێڵە سەگەکەم کرد هەموو لەشی برینداربووە و خوێن بە لەشی

---



[*] مام (ئەحمەد حەمەد صۆفی کەریم) لە ١٩٤٦/٧/١ لەدایك بووە، کەسێکی دنیادیتە و قسەخۆش و کەسایەتییەکی دیاری گوندی (تاڵەبانی گەورەیە)..

[56] - کەوری شێروەزەن پشتی چیای گۆڕقەرەجە و دەکەوێتە بەرامبەر گوندی نۆمەرگومبەت.

دادەچۆڕکێ، لەبەرخۆمەوە وتم: ئەگەر ئەو سەگە شتێکی لێبەسەربێت، من چ جوابی خۆم بدەمەوە؟

دێڵە سەگەکەم هێنا، خستمە ناو قەدی جوارکێك و بەپێی دەرمانی ئەو دەمە دەرمانم لێیدا، بەمەیش برینەکەی لەماوەی چوار پێنج ڕۆژێ چاك بۆوە، دەمەو عەسرانێکی درەنگ دێڵەسەگەکە چەند جارێك لوورانـدی و هەیپەی لێ کرد لەو شوێنە نەما و ئێمەی لەو زورگ و دەشت و دەرە بەجێ هێشت، لەبەر خۆمەوە دەموت: ئااای قوڕم بۆ گێڕایەوە دێڵەشم لەدەست چوو، ئەوجا چیبکەم؟

ئەو شەوە دێڵە سەگەکە نەهاتەوە، ڕۆژی پاشتر بەرەبەری نیوەڕۆ دەرکەوت و، لەگەڵ خۆیدا بۆرە سەگێکی حێلی هێنا، حیکمەت لەوە چی بوو ئەو سەگەی هێنا و هاتەوە؟ نازانم، دیقەتمدان بزانم چ شتێك ڕوو دەدات؟ چاوێکم بەسەریەوە بوو، تەماشام کرد خۆر بەرەو ئاوابوون هەنگاوی دەنا، پێکۆڕانیان دەکرد، بەملا و بەولا غاریان دەدا، سەریەخۆ وەکو ئەوەی خۆیان بۆ جەنگێکی گەورە ئامادە بکەن، هەڕەشەیان دەکرد..شەو داهات دیسان دەعبایەکە پەیدابۆوە، شەو تاریکەو نازانم ئەو دەعبایە چییە؟ لەناکاو خۆی بەناو مێگەلەکە داکرد، بووە لێك مڕاندن، نەموێرا بچم لێکیان بکەمەوە بەلأم باوەڕم وابوو ئەو سەگانە کۆڵ نادەن، لەدوورەوە کەوتمە چاودێریکردنیان، دەنگەکە نەما، بەیانی کاتێك بەرەو خوار کەورەکە شۆڕ بوومەوە تەماشام کرد دێڵە سەگەکە و بۆرە هەردووکیان لەو عەردەدا خەڵتانی خوێن بوونە و لە نێوانیاندا (بەور)[٥٧] یێکیش خەڵتانی خوێن بووە، لێیان نزیك بوومەوە سەیرم کرد بەورەکەیان کوشتبوو، ئەوانیش هەناسەیان دەهات و دەچوو، دوای تیمارکردنیان پاش سێ چوار ڕۆژ کە پێیان عەردی گرت، وەکو لە جەنگێکدا سەرکەوتووبن و کاتی گەڕانەوەیان هاتبێ، پێکەوە هەر دوو سەگەکە گەڕانەوە گوندی سێگردکان.

* * *

کەئیمامی عەباسی مامی پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: سەگێکی سپلە کەلێ کەلێ چاکترە لەهاوڕێیەکی خراپی ناپاکی دەست پیسی دڵ پیس، چونکە ئەو زیانی بۆت نییە، بەلأم ئەو هەرگیز لێی دڵنیا نابێت.

---

[٥٧] - بەور: پڵینگ.

✍✍ بەسەرهاتی دووەم:

## کاتێك بوومە سەرباز و چوومە سەربازگەی تاجی

✏ ساڵی ١٩٨٨ پەیمانگەی پێگەیاندنی مامۆستایانم تەواو کرد، بەبڕیارێك لەدایکبووی ١٩٧١ خزمەتی سەربازی ساڵێکیان دواخرا، منیش بەر ئەو بڕیارە کەوت و ساڵی ١٩٩٠ بانگ کراین، چووومە پێش، لە سەربازگەی هەولێر بوومە سەرباز، دوای مەشق و ڕاهێنانی دوو مانگ ، ڕەوانەی سەربازگەی تۆبزاوەیان کردین، لەوێش هەر مانگێك ماینەوە، ئەوجا بەرەو سەربازگەی تاجی بەغدا سەوق کراین، لە (تاجی) گەنجێکی سنووری کەرکووکم ناسی، کاك (سامی) ناوبوو خەڵکی گوندی (جانقڵ) بوو، ڕۆژێکیان باسمان لەسیفەت و وەفای سەگ دەکرد، ئەویش باسەرهاتێکی گوندەکەیانی بۆ گێڕامەوە[٥٨] وتی:

لە لادێکەمان (ڕەمەزان شوانی) ناوێ هەبوو بەدەست و قامکی خۆی کەسێکی بوێر و جەربەزە بوو، لەوانە نەبوو سیفەتی ترسنۆکی بدەیە پاڵ، ڕۆژێکیان دوو لەشوانەکانی ئاوایی تووڕەی دەکەن گوایە ناوێرێ شەو لەو دەشت و دەرە بمێنێتەوە، ئەویش حیرس دایگرت هەر بەو شەوە مێگەلە مەڕو بزنی ڕادا و دایە پێش خۆی، بەرەو پێدەشتی گوندەکەیانی برد و، بردنیە لەوەڕگایەك بیانلەوەڕێنێ، پڕتاو گوێی لەدەنگە دەنگی تەیرە تیتراوسکێك دەبێ، ترس بەگیانیدا گوزەر دەکات و لەبەرخۆیەوە دەڵێت: وەڵڵاهی هەبێ و نەبێ ئەمە نیشانەیە و دەنگەکە دەنگی گورگە نەوەکو تیتراوسك، هەر ئەوەندەی زانی دوو گورگی لێ پەیدابوون و زیاد لەهەر ئێوارەیەك سەگەکەی لەماڵەوە بەجێ هێشتبوو.. گورگەکان بەناو مێگەلەکە وەربوون،

---

[٥٨] - بۆ زاخاوی مێشك: دەگێڕنەوە کابرایەك سەگێکی بەوەفای هەبوو کاتێك دەمرێت، لاشەکەی دەباتە گۆڕستان، گۆڕێکی بۆ هەڵدەکەنێ و دەیشارێتەوە، موختاری گوندی کە ئەمە دەبینێ بەتووڕەییەوە پڕ بەگەرووی هاوار دەکا و پێی دەڵێ: هەی مەلعوون چ ڕەوای هەقە ئەمەت کردووە؟ ئەی نازانی ئەوە دروست نیە؟

کابرا ترسی لێدەنیشێ نەوەکو کابرای موختار لەگوندی دەریکات، بۆیە بەدەم زەردەخەنەیەکەوە پێی دەڵێ: قوربان گیان خۆت ئەم سەگە باش دەناسی و دەزانی چۆن پاسەوانی سەد سەر مەڕ و سەدو پەنجا سەر بزن و دە دوانزە مانگای کردووە و کەسیش نەیتوانیوە زەفەری پێ ببات، تەنانەت پێش ئەوەی بمرێ وەسیەتی بۆ کردم کە لە بزن و مەڕەکاندا دە دوانزە سەرێکت بەدیاری بدەمێ.

موختاری گوندی باوەڕی بەقسەکانی هێنا و کەمێ بیری کردەوە، ئەوجا وتی: یارەببی خوایە لێی خۆشبی بەڕاستی سەگێکی بەوەفابوو، ئەرێ سەگەکەت سەبارەت بە مانگاکان هیچ وەسیەتێکی نەکردبوو؟!

لەم ناوەدا بزنێك دەدەنە پێش و ، ئەویش بەدەستی گۆپاڵەوە دەکەوێتە دوایان تاوەکو بزنەکەیان لەچنگ ڕزگار بکات، لەناکاو نەبزن ما، نە دوو گورگەکە، بێئاگا هەر ئەوەندەی زانی کەوتە چاڵێکەوە، کەوتە بەینی گورگەکان کە گورگێکیان بزنەکەی لەبن خۆی نابوو، گورگەکەی تر چاوی دایێ و لێی مڕ بۆوە و ددانەکانی لێی جیڕەوە کرد وەکو خۆ ئامادەکردنێك بیەوێ پەلاماری بدات، بەمەش هەتا تینی تێدابوو هاواری کرد، لێرەدا وەفای سەگی بۆ دەرکەوت چۆن لەو کاتە ناسکەدا بۆی پەیدابوو، گەیشتە لای، ئەوجا کەوتە دوای گورگەکان کە ئەگەر ئەو سەگە نەبوایە خۆی بەزیندوێتی نەدەدییەوە، کاتێکیش کەوتە جولاندنی بزنەکە، بزن بەجۆرێ غەزریبوو واگومانت دەبرد ڕەنگە مردار بووبێتەوە، لەچاڵەکەی دەرێنا، دووبارە جولاندیەوە، هیچ جووڵەیەکی نەبوو، لەدڵی خۆیدا وتی: بەخوای هەبێ و نەبێ گیانی دەرچووە، کەچی لەناکاو بزنەکە لەبن دەستی دەرپەڕی و ڕایکرد، هەرە هەرە تا بزنی گرتەوە و بردیەوە ناو مێگەلەکە بەهیلاك چوو، هەروەها ڕۆژێکیان کاتێك مێگەلەکەی دەباتە دەر و ئێوارە پێشیان دەدات و دەیهێنێتەوە گوندی، سەگەکەی دیار نەبوو، بەیانی کاتێك مێگەلەکەی دەباتەوە هەمان شوێن تەماشا دەکات سەگەکە بەدیار بزنێکەوەیە کە ئەو ڕۆژە درەنگی وەخت دەزێ و لەمێگەلەکە دادەبڕێت، ئەو سەگەش بۆ پاسەوانی بزن و کارەکە تا بەیانی بەدیاریانەوە دەبێت و پاسەوانەتیان دەکات.

* * *

✍ئیمامی شافعی(ر.خ) دەڵێت:

لیت الکلاب لنا کانت مجاورة

ولیتنا لا نری ممن نری أحدا

ان الکلاب لتهدأ من مرابضها

والناس لیس بهاد شرهم أبدا

واتە: خۆزگە سەگ هاوڕێمان ئەبوو، وەکەسمان نەئەدی لە ئادەمی بێ وەفا، سەگ لەجێی خۆیا ئاهیستە و هێواش ئەبێتەوە، بەلام ئادەمی هەرگیز زەرەر وزیانی هێواش نابێتەوە.

* * *

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

﴿لَّعْنَتَ اللَّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ ﴿٦١﴾﴾ آل عمران: ٦١

# ❁ دەبێ بۆ درۆیەك دە درۆیان بكەین ❁

✍پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: نیشانەی مرۆڤی مونافیق سێ شتە: ئەگەر قسەی كرد درۆیان دەكات، ئەگەر وەعدو پەیمانی دا نایهێنێتە جێ، وەئەگەر ئەمانەتی پێدرا خیانەتی لەگەڵ دەكات[٥٩]

✍لەفەرموودەیەكی دیكەدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: بەڕاستی درۆ ڕووی مرۆڤ ڕەش دەكات و هێنان و بردنی قسەی خراپ لەنێوان موسڵمانان لەئازار وعەزابی قەبرە بۆ ئەو كەسەی وا بكات[٦٠]

✍(عبدالله) كوڕی (مسعود) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی: ( پێویستە لەسەرتان ڕاستگۆبن، بەڕاستی ڕاستگۆیی مرۆڤ ڕێنموونی دەكات و بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێت هەتا لای خوا بەڕاستگۆ تۆمار دەكرێ. خۆتان بپارێزن لە درۆ، بەڕاستی درۆ مرۆڤ بەرەو كاری خراپە دەبات، كاری خراپەش مرۆڤ بەرەو دۆزەخ دەبات، بەردەوام پیاو هەیە درۆ دەكات و بەدوای درۆدا دەڕوات هەتا لای خوا بەدرۆزن لە قەڵەم دەدرێت)[٦١]

✐ ڕاستگۆیی باشترین سیاسەتە و درۆكردن دەرهاوێشتەی پەروەردەیەكی هەڵەیە و نیشانەی هەستكردنە بە كەمی، ئەگەر درۆكردن بووە بەشێك لە كەسایەتی، ئەوا هەڵگرەكەی لەڕووی دەروونییەوە كەسێكی نەخۆشە و پێویستە چارەسەر بكرێ.

پێغەمبەر(ﷺ)ئەگەر بیزانیایە كەسێك درۆ دەكات، ڕووی لێ وەردەگێڕا و هاتوچۆی نەدەكرد هەتا ئەو كاتەی خەبەری بۆ دەهات ئەو كەسە تۆبەی كردووە، ئینجا ڕووی

---

٥٩ - قال (ﷺ )( اية المنافق ثلاث، اذا حدث كذب واذا وعد اخلف واذا ائتمن خان) متفق عليه.

٦٠ - قال(ﷺ )(الا ان الكذب يسود الوجه، والنميمة من عذاب القبر) البيهقي و الطبراني.

٦١ - عن عبدالله بن مسعود(ﷺ ) قال: قال رسول الله(ﷺ): ( عليكم بالصدق، فان الصدق يهدي الى البر، وان البر يهدي الى الجنة، وما يزال الرجل يصدق ويتحرى الصدق حتى يكتب عندالله صديقا، واياكم والكذب، فان الكذب يهدي الى الفجور، وان الفجور يهدي الى النار، وما يزال الرجل يكذب و يتحرى الكذب حتى يكتب عندالله كذابا).( بخاري/ الادب/٥٧٤٣).

تێدەکرد و ڕووی نەدایێ و گفتوگۆی لەگەڵ دەکرد[٦٢]

چـوار لـە سـەحابە بـەڕێزەکان چـوونە لای کابرایـەك بـۆ ئـەوەی فـەرموودەکانی پێغەمبەری لەلادا خڕ بکەنەوە بەوەی فەرموودەیەکی زۆری پێغەمبەر(ﷺ) ی لەبەرە، بینیان ئەم کابرایە لچکێکی پەڕۆکەکەی بەهەردوو دەستی گرتووە، ئەسپەکەی بەڕەڵا ببوو دەیوت: تـب تـب تـب تـا ئەسپەکە لێی نزیك بۆوە یەکسەر ئەسپەکەی گرتەوە، ئـەوانیش کـە لێیـان پرسـی: تـۆ فـەرموودەی پێغەمبـەرت(ﷺ) لەبـەرە؟ وتـی: بـەڵێ. وتیان: فەرموودەکانت لێ وەرناگرین چونکە تۆ درۆت لەگەڵ ئەسپەکە کرد، موسڵمان چۆن درۆ دەکات؟[٦٣]

لەوەتەی مرۆڤ هەیە ڕاستی هەیە، لەوەتەی ڕاستیش ڕووناکی خۆی پەخش دەکات تاریکییەك شەڕی ئەو ڕووناکییە دەکات، ئەو تاریکییە(درۆ)یە..درۆ، ئەو ڕاستە حەرامەی مرۆڤە نەفس نزمەکان پەنای بۆ دەبەن، درۆ کە هەمیشە لە نزیك ڕاستیدا خۆی حەشار دەدات و ترسنۆکانە پەلامار دەدات، پەلاماردانی درۆ وەك پەلاماری ئەو دوژمنە ترسنۆکە وایە کە ناتوانێ ڕوو بەڕوو شەڕ بکات چونکە هەقیقەتی پێ نییە، درۆش بێ هەقیقەت، بێ ڕووناکی، لەپەنا و پەسێوێکی شەرمەزار چنگ دەگرێ و

---

[٦٢] - درۆکردن چەند جۆرێکی هەیە، لەوانە:

١- درۆکردن لەپێناو بەدەستهێنانی شت ٢-درۆکردن بەمەبەستی پڕکردنەوەی بۆشایی دەروونی بۆ نموونە منداڵێك باس لەوە دەکات لەماڵەوە پایسکیلی هەیە، ئەویتر بێ ئەوەی پایسکیلی هەبێت باس لەوە دەکات چۆن پایسکیلی بۆ کڕاوە ٣- درۆکردنی خستنە پاڵ بۆ ئەوەی خۆی لەگلەیی دوور بخاتەوە، کارە خراپەکەی خۆی دەخاتە پاڵ کەسێکی تر بۆ نموونە ڕژانی ئاو و شکانی دەرگاو..هتد ٤- درۆکردن لەترسی دایك و باوکی چونکە وادەزانێ ئەگەر ڕاستی بڵێت ئەوە سزای دەدەن ٥- درۆی لاسایکردنەوە ئەوەی دایك و باوك لەماڵەوە فێری دەبێت.

هەروەها ڕێکخراوەکانی دەروونی ئاماژە بەوە دەدەن کە هەموو کەسێك هەوڵی درۆکردن دەدات هەتا منداڵ کاتێك هەڵەیەك دەکات یا کردەوەیەکی خراپ بۆ ئەوەی لەدایك و باوکی بشارێتەوە پەنا بۆ درۆکردن دەبات. بۆیە هۆکارەکانی درۆکردنیش زۆرن، لەوانە: ١-بۆ خۆپاراستن لەسزا و گلەیی و سەرکۆنە کردن ٢- سەرنج ڕاکێشانی کەسی بەرامبەر ٣- قەربووکردنەوەی بۆشایی دەروونی ٤- بەدەستهێنانی پاداشت ٥ - دڵخۆشکردنی کەسی بەرامبەر.

[٦٣] - لـە (ام کلثـوم)ی کچـی (عقبـة)ی کـوڕی (معـیط) دەگێڕنـەوە دەڵێـت گـوێم لێبـوو پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەیفەرموو: ( ئەو کەسە درۆزن نییە کە قسەی خێر دەکات: (واتە هەندێك قسە دەکات نەوتراوە) بەمەبەستی چاککردنی نێوانی دوو کەسە)(متفق علیه)

ترسنۆکانە پەلامار دەدات کەچی ناتوانێ هیچ بکات و ئەگەر هەر شتێکیش بکات کەم و کورت و کاتییە و سەرچاوە ناگۆڕێ!!.. هەر لەگەڵ دروستبوونی ژیان، ئایینەکان هاوڕێ لەگەڵ مرۆڤدا ڕێ دەکەن و بەردەوام لەنێو ئەو ڕێکردنەشدا شەڕی درۆ دەکەن. لە هەر ئایینێکدا کۆمەڵێك تێکست و چەمك و دەستەواژە هەن کە درۆ ڕەتدەکەنەوە و بەگوناهێکی گەورەی دەزانن کەچی درۆ هەر بەردەوامە، بۆ؟! چونکە ڕووناکی بەردەوامە، تا ڕووناکی و ڕاستی مرۆڤ بەردەوامبن، درۆ شەڕی خۆی دەکات و ئایینەکانیش بەردەوام درۆ ڕیسوا دەکەن و ئەم کێشمەکێشە بەردەوام دەبێت و گرنگترین خاڵی نێو ئەم هاوکێشەیەش بەردەوام دەبێت و گرنگترین خاڵی نێو ئەم هاوکێشەیەش ناسینەوەی درۆیە، چونکە زۆربەی جار درۆ خۆی لەنێو ڕاستیدا دەشارێتەوە و مرۆڤەکان دەرەقەتی کەشفکردنی نایەن. لەو حاڵەتەدا ئایین هێزی کەشفکردنی درۆ لەڕاستی و ڕەش لەسپی بەکاردەهێنێ و لەوێدا تێدەگەین ڕاستییەکی گەورە لەپشت تێکستەکانەوە ئامادەییان هەیە[٦٤]!..

درۆ چیە؟ درۆ ناڕاستی نیەتە کە لە دڵە، پێش ئەوەی ناڕاستی زمان بێت، واتە کاتێك مرۆڤ لەسەر درۆکردن نەفسی خۆی لێڕاهێنا ئەوا بەفیعلی دەبێتە درۆزن و هەتا لە کردەوەکانیشی حەرەکات و سەکەناتی درۆزنانەی تێدا دەبێت بۆ بەدەستهێنانی مەبەستێکی تایبەت بەخۆی جا قیمەتی هەبێت و نەبێت، چارەسەری درۆ ئەوەیە دەبێ مرۆڤ غیرەت بداتەوە خۆی و واقیعەکە چۆنە وا بکات ئەمەش بەیەك لەحزە ناکرێت کاتی دەوێ تا نەفسەکەی لێڕابێنێت و بیخاتە ڕیزی ڕاستگۆیانەوە، بۆ هەنگاوی عەمەلیش ئەو نمونەیە بخوێنەوە:- بۆ نمونە تۆ دەتەوێت بچیت بۆ بازاڕ بۆ سەردانی برادەرێکت و دەشزانی باوکت پێی ناخۆشە بچیە لای ئەو کەسە، کاتێ باوکت پێتدەڵێ: ها بۆ کوێ دەچی؟ ئەگەر وتت دەچمە بازاڕ و ناو دڵیشت برادەرەکەت بوو، ئەوا تۆ ڕاستت نەکرد، بەڵکو بڵێ دەچمە لای برادەرەکەم و بەو شێوەیە ئەوەی لەناو دڵە دەبێ ١٠٠٪ لەسەر زمان بێت، ئینجا ڕەنگدانەوەی لەسەر بیرو هۆشت ڕوو دەدات و بەرەو ڕێگای دروست نەبێت هەنگاو نانێ و بەدروستیش نەبێت بیر ناکاتەوە، بۆیە درۆ تەنها کاریگەری لەبەرامبەرت ناکات بەڵکو کاریگەری لەسەر هەموو سیفات و هەتا داهاتووی ژیانی شەخسیت دەکات لەهەموو ڕووێکەوە[٦٥]

---

٦٤ - د. سالار عوسمان / گ: گوڵان ژمارە (٦٩٨)٢٠٠٨/٨/٢٥ ل٦٦

٦٥ - باوکی عبدالرحمن: مەعریفەی عیرفان بۆ ناسینی زاتی ئینسان چ١ س٢٠١١ل٦٧

کەواتە درۆ شتێکی نادروستی دەربڕینە لەڕێی قسەکردنەوە لەپێناو بەدەستهێنانی سوودێك یان خۆ دزینەوە لەشتێکی ناخۆش و تەنگەتاو، زۆرن ئەوانەی درۆ دەکەن و درۆ بــوەتە پیشەی ڕۆژانەیان بە جۆرێ تا درۆیەك هەێت، وشەیەکی ڕاستیان لەدەم دەرناچێ.

هەندێك پێیان وایە ئەوە ژینگەی کۆمەلآیەتیە کە مرۆڤی ڕاستگۆ یان درۆزن پەروەردە دەکات، ئەوەك ڕەفتارێکی سایکۆلۆژی..ئەو کەسەی بەڕۆژی ڕووناك درۆ دەکات و شەرمیش ناکات وەکو دەڵێن کەسێکی ڕووقایم و بێشەرمە، ئەوانە ئەگەر درۆشیان لێ سپی بکەیەوە، هێندەی تۆزقاڵێك تەریق نابنەوە و گوێیان لێی نییە و هەست بەهیچ ئیحراجییەك ناکەن ( درۆ دوژمنی خوایە، لەم ڕۆژگارە درۆی سەرکردەکان بە فەلسەفە و سیاسەت لێك دەدرێتەوە و بەقسەزان دادەنرێن، وایلێهاتووە لەبەر زۆری درۆکان ڕاستیەکان بزر بووە)

✍بەسەرهاتی یەکەم:

**دەبێ بۆ درۆیەك دە درۆیان بکەین**

✎ سروشتی ئیشەکەم وابوو وەك سەرپەرشتیارێکی پەروەردەیی دەبوو لەنێو دوو مانگ جارێ بچمە ئەو گوندە و سەردانی ئەو قوتابخانە بکەم کە تەنها یەك مامۆستای هەبوو.

بەیانییەکی زوو بەڕێ کەوتم، ڕێك کاتژمێر هەشت و نیو گەیشتمە بەردەمی ئەو قوتابخانەی کە لە دوو هۆدە و هەیوانێکی خشتی قوڕ پێکهاتبوو کە ژمارەی قوتابیانی تەنها دە قوتابی بوو، پۆلەکانیش: یەك و دوو لە هۆدەیەك و سێ و چواریش لەهۆدەیەکی دیکە تێکەڵ کرابوون، سەردانی پۆلەکانم کرد، جەنابی بەڕێوەبەرم لەوێ نەبینی، کە پرسیاری ئەو دیار نەبوونەم لێ کردن.

یەك لەقوتابیەکان بێ پەروا وەڵامی دامەوە: مامۆستا ئەوە چ پرسیارێکە؟ مامۆستاکەمان ڕۆژانە بەئیسراحەتی خۆی دێتە ئێرە، خۆ ئەگەر کەیفی لێ نەبێ ئەوا بەناوی سەردانی تەربیەوە نایەت و ئێمەش تاوەکو نیوەڕۆ ئەوها لەو گۆڕە دەمێنینەوە.

ئەو ڕستەیە سەرنجی ڕاکێشام کە ئەو ماستە موویەکی تێدایە، سەعاتێك زیاتر لەگەڵ قوتابیەکان مامەوە، کە پەتی ئارامیم پچڕا، چوومە بەردەمی هەیوانەکە و مۆبایلەکەم دەرهێنا، تەلەفۆنم بۆی کرد.

ئەویش تەلەفۆنەکەی هەڵگرت، دوای چاك و چۆنی، کە پێموت: ئەرێ مامۆستا ئەوە لەکوێی؟

بەوپەڕی متمانە بەخۆ بوونەوە زمانی گەڕاند: وەڵا لەکوێبم؟ وا لەقوتابخانەم و دەرسێکی باش دەڵێمەوە، ئەی تۆ چۆنی مامۆستا؟ ئەحوالت؟ بەڕاستی لێمان بوویتەتە هەنارە شیرنە، ئەوە بۆ سەردانیەکمان ناکەی، بەڕاستی غەریبیت دەکەین؟

بەو قسانەی چاوم زەقبۆوە، لەدەروونەوە بەخۆمم وت: ئەی ئەی کورە خۆ ئەوە خەریکە قەرداریشم دەکاتەوە لەکاتێکدا نە لەقوتابخانەیە و ئەو درۆیانەش دەکات؟

بەهەڵپەیەکەوە پێموت: یەعنی تۆ ئێستا لەقوتابخانەی؟

سوێندێکی بەدرۆی خوارد: ئەرێ بەخوای وا لەقوتابخانەم و خەریکی دەرس وتنەوەم.

کە وتم: ئەی کوا لە کوێی؟ بۆچی ناتبینم؟

شڵەژا، چاوەڕوانی ئەو هەڵوێستەی نەدەکرد، بە پچڕ پچڕییەکەوە وتی: ب..ب..بۆ..بۆ بۆتۆ لەکوێی؟ لە قوتابخانەی؟

وتم: بەڵێ، بەڵێ. وا لەقوتابخانەم و تۆش لەوێ نیت.

بۆ پینەو پەڕۆی درۆیەکانی ، بەدەم پێکەنینەوە وتی: ببوورە مامۆستا گیان بەو خوایە بەم بەیانییە بەرەو قوتابخانە دەهاتم لەڕێی (هەنارە) لەگەڵ سەیارەیەکی دیکە تووشی پێکدادان هاتم، بۆیە دواکەوتم و نەمتوانی بێمە قوتابخانە.

* سەلامەتن ئیشەڵڵا؟ خۆ هیچتان لێ نەهاتووە؟

+ لەخوای بەزیادبێ نە من و نەسایەقی بەرامبەرم هیچمان لێ نەهاتووە، حالیەن لەو لەوێ وەستاوم و چاوەڕوانی ئەوەم کرێن بیت و سەیارەکەم ببەمە سناعە.

حەزمکرد ئەو درۆیەشی ساغ بکەمەوە،کە لێیم پرسی: جا تەلەفۆنت کردووە تاوەکو کرێن بێ؟

+ نەوەڵڵا بەس بەتەمام ئێستا تەلەفۆن بکەم.

* مامۆستا دەی مادام وایە تەلەفۆن مەکە، ئەگەر ناونیشانی ئەو شوێنەم بدەیتێ هەر ئێستا دەگەمە لات و دێم بەسەیارەکەم ڕایدەکێشم و پێکەوە دەیبەینە سناعە.

دیسان گۆمی بیرکردنەوەی شڵەژا دەیزانی ئەگەر بچمە لای بێ شك نەسەیارەی دەعمی کردووە و نەخۆیشی لەوێیە. وتی: نا، نا، نا بەڕێزم چۆن ئەزیەتت دەدەم؟ کورە وەها سەرم لێ شێواوە ئەگەر قسەیەکی هەڵەت و پەڵەتیم کرد توخوا لێمی

مەگرە، هەر باشە ناوی خۆم لەبیر ماوە، ببوورە من وا لەناو سەیارەی کرێنم و چی وام نەماوە بگەمە جیّ.

کە وتم: لەقسەکانترا دیارە باری دەروونیت تەواو نیە، کەواتە چۆن دەکریّ بەتەنیا بچیە سناعە؟ هەر ئێستا سلف لیّ دەدەم و دەگەمە لات.

وتی: بەخوای پێویست بەو ماندووبوونە ناکات، خوا پاداشتی بەخێرت بداتەوە، منیش هەر ئەوەندە پـارەم پیّ نیە بەنیەتم سەیارەکە لەسناعە بەجیّ بێلّم و بچمەوە مالّ تاوەکو پارە بێنم و بگەڕێمەوە.

ویستم پەلّپی درۆی ئەو بیانووەشی پیّ ببڕم، وتم: ئەگەر مەسەلە پارەیە ئەوە نزیکی شەست حەفتا وەرەقەم لەلایە، ئێستا دەگەمە لات، ئیدی چەندت پارە دەویّ پارەت دەدەمیّ و پێویست بەگەڕانەوە ناکات بۆ پارە بچیەوە مالّ.

دەمی تێك ئالاّ، دیسان نەیزانی چ درۆییەکی دیکە هەلّبەستیّ کە هەموو ڕێیەکم لێی گرتەوە، بەناچاری وتی: بەڕاستی هەر حەزدەکەم بچمەوە مالّ، هەست دەکەم نەختیّ ناساغم.

کە وتم: بەخوای ئەمە و ئەوەی پیّ ناویّ ئێستا لەکوێی؟ تۆ هەر سەیارەت پیّ نییە وا دێم و دەتبەمە نەخۆشخانە ئەوە دنیایە نەوەکو ئازارت گەیشتبیّ، مرۆڤ لەگەرما و گەرمیدا هەست بەهیچ ناکا.

خراپی لێقەومابوو، دەیشیزانی بەهەوەنتە وازی لیّ ناهێنم ئەگەر بچمە لای، داوای لیّ بکەم کوا سەیارەکە دەمەویّ بیبینم، ئەوەندەی دیکە درۆیەکەی زەقتر دەبێتەوە، وتی: زۆر سوپاس بۆ ئەو هەستە جوانەت، بەلاّم شوکر ئەوە براکانم گەیشتنە لام و لە تەکمدان، هەر حالّەتێك پێویستی کرد خۆم ئاگادارت دەکەمەوە، دووبارە ئەوە دوپات دەکەمەوە بەو خوایەی هەموومانی خەلّق کردووە ئەوەی عەیبە نیمە.

لەدەروونەوە دەمووت: هەی کەچەلّ ئەو قسەیەت ڕاستە چونکە دەعمت نەکردووە بێگومان ئەوەی عەیبە نیتە ، هەستم کرد پەیوەندیەکەم بەرەو تەواوبوون و پچڕان دەڕوات، پێموت: دەباشە سەلامەتی و هەرچیەکت پێویست بوو قسە بکە، ئەی ئێمە برای یەك نین؟

وتی: خوا لە برایەتیت کەم نەکات، زۆر سوپاس.

کە وتم: خواحافیز.

وتی: خوات لەگەلّ، خوا دەست بەبالّتەوە بگریّ.

مۆبایلەکەم داخست.

بەئیشێکەوە هەفتەیەك تێپەڕی، دووبارە چوومەوە هەمان گوند و هەمان قوتابخانە، کاتێك لەسەیارە دابەزیم، سەیارەکەیم لەپێش قوتابخانەکە بینی، لێی چوومە پێش، سەیریم کرد بزانم کوێی چا کردۆتەوە؟ فەرەیەکم بە دەوری لێ دا، نە سبووغێك، نەگۆڕینی بەدەن، نەشوختێك، ئەوەی عەیبە نەیبوو، وەلێ حەزم نەکرد زیاتر خۆم بەو بابەتەوە سەرقاڵ بکەم ، چوومە لای، ئەوەی لەچاوانی ئەو کابرایەم خوێندەوە دیاربوو حەزی نەدەکرد کەم تا زۆر ئەو بابەتەی لەگەڵدا بکەمەوە، منیش چۆن بەردێکم نایە بانی، ئەو ڕۆژە ئەوەندەی مامەوە دوور و نزیك باسی ئەو ڕۆژەم لەلادا نەکردەوە هەواڵی خۆی و سەیارەکەی لێبپرسم، نەوەکو وابزانێ من گێلم و بەگێلم تێ بگات!

✍✍بەسەرهاتی دووەم:

**بەهۆی درۆیەکەوە وازم لەکۆنەفرۆشی هێنا**

✎ برادەرێکی (چەرچی و کۆنەفرۆش)م هەیە، نوێژ دەکات و، کەسێکی خواناسە، ڕۆژێکیان پێکەوە دانیشتبووین، کاتێك پرسیاری ڕەوشی بازاڕم لێی کرد: ئەرێ بازاڕت چۆنە؟

وتی: بازاڕم چۆنبێ؟ دەستم لەکۆنەفرۆشی هەڵگرت!

کە وتم: بۆچی؟ خۆ تۆ ساڵانێکە ئەوە کار و پیشەتە.

وتی: دنیایەکی سەیرە، لەم زرووفە ڕاستی ببێژی باوەڕت پێ ناکەن، خەڵکانێك هەن فرچکیان بەدرۆ گرتووە.

کە لێم پرسی: درۆکردن شتێکی خراپە پێویستە خۆمانی لێ بەدوور بگرین.

بەدەم زەردەخەنەیەکەوە وتی: تۆ من دەناسی کەسێکی ئەوەندە بێویژدان نیم، حەزیش ناکەم پارە و لوقمەی حەرام دەرخواردی ماڵ و منالم بدەم، بەحوکمی ئیشەکەم لە بازاڕی سورچیان تێکە و لێکەی کڕین و فرۆشتنی کەل و پەلی کۆنەی ماڵانم دەکرد، ڕۆژێکیان بەسەیارەوە چوومە گەڕەکی (باداوە) هاوارم دەکرد: وەرنەوە تەلەفزیۆن دەکڕین، سەلاجە دەکڕین، فەرش و تاخمی قەنەفە دەکڕین و هەموو ئەو قسانە و زیاتریش، چەند دیمەنێك هەڵوێستەی پێ کردم کە لەچەند ماڵێکدا ئەو شتانەی پێیان نیشان دەدام لێیان بکڕم، من ئاگام لەبازاڕ هەیە دەزانم بایی چەندە و چەند دەکا؟ کە ڕاستیەکەم پێ دەوتن: لێم دەکشانەوە، دەیانوت: ئەو پارەیە کەمە،

لەوە زیاتر پارە دەكات، گەیشتە ڕادەیەكی وا یەكێكیان پێی وتم: ئەو نرخە ڕاست نییە، وەكو ناڕاستەوخۆ بڵێ: درۆ دەكەی كە درۆم نەدەكرد، لەناخەوە دەهری بووم، بەخۆم وت: ئەو خەڵكە چی لێ قەوماوە بۆچی باوەڕ بەڕاستی ناكەن؟ هەر ئەو دەمە ختورەیەكی شەیتانیم بەمێشك داهات لەدەروونەوە بەخۆم وت: دەی دەبا ئەوجارەیان درۆیەك بكەم بزانم حاڵی ئەو خەڵكە لەگەڵ درۆكردن چۆنە؟

لەتەماشاكردنی سەلاجەیەكدا دەمزانی لە بازاڕ لەسەد دینار هەتا سەد و بیست دینار دەكات، پێموت: ئەگەر بە چل دینار دەیفرۆشن ڕەنگە لەبازاڕ هەر پەنجا دیناریێ بكات و بۆ من دە دیناریێكی تێدایە.

سەیرم كرد بێ لام و جیم وتی: دەوەرە بیبە، خێری لێ ببینی.

سەلاجەم بار كرد و لەگەڵ ئەو شتومەكەكانی تر بردمنە بازاڕی سورچیان، بەتەنها سەلاجەكەم بە سەد و پازدە دینار فرۆشت، ئەو درۆیە هێندە ئازاریدام، وامدەزانی ئەو پارەیەم بەدزی پەیدا كردووە، ویژدانم ئاسوودە نەبوو، هەر ئەو كاتە چوومەوە ئەو شوێنە و لەدەرگای ماڵی ژنەكەمداو پێموت: ببوورە سەلاجەكەی ئێوەم بەپارەیەكی زۆر فرۆشتووە.

ژنەكە وتی: دەنە منیش وادەزانم سەلاجەكەم بەپارەیەكی باش پێ فرۆشتووی.

پێموت: خوشكێ ببوورە من دەمزانی لەبازاڕ چەند دەكات بەدرۆ ئەو نرخەم پێ وتی و تۆش یەكسەر باوەڕت بەدرۆیەكەم كرد، سەلاجەكەتم بە سەد و پازدە دینار فرۆشتووە، بیست، بیست و پێنج دینار قازانج بۆ من زۆرە، لەبیرمە بەچل دینارم لێت كڕی، فەرموو ئەوە پەنجا دیناری دیكە..

ژنەكە دەمی بەش بۆوە، وتی: ئەوە بەڕاستە؟ هەر بەڕاست ئەو پارەیە دەدەیەوە من؟

پێموت: ئەگەر ویژدانمان بكەینە حەكەم و درۆ نەكەین هەموومان قازانج دەكەین[66] پارەكەم پێیدا و ڕێ و ڕێ گەڕامەوە ماڵ، لەدەروونەوە هەستم بەخۆشیەكی زۆر كرد، لەو ڕۆژەوە بڕیارمدا واز لەكۆنەفرۆشی بێنم.

## بۆچی خەڵك درۆ نابینن؟[67]

---

[66] - ئیمامی عومەر(ﷺ) وتەیەكی پرشنگداری هەیە، (حاسبوا انفسكم قبل ان تحاسبوا) واتە: موحاسەبەی نەفستان بكەن پێش ئەوەی موحاسەبە بكرێن.

[67] - بەپێی ڕاپۆرتێكی دەزگای هەواڵگری ئەمریكی كە لە ئەبریلی٢٠٠٣دا هاتووە: دوای پرۆسەی ئازادی ئێراق، تاریق عەزیز كە یەكێك بوو لە گەورە یاریدەدەرانی سەدام حسێن دەڵێ: زۆر ترسناك بوو كەسێك

**✍ کاک هەندرێن بۆی گێڕامەوە وتی:**

**✍ لەسەر عارەبانە خاسم دەفرۆشت، ئەو خاسەم چۆن لە زەویەکە دەکردەوە دەمخستە سەری و بێ ئەوەی بەئاو بیشۆم یەکسەر دەمفرۆشتەوە، کەچی ئەو عارەبانچیانەی لەتەکمەوە وەکو من خاسیان دەفرۆشت، خاسەکەیان جوان بەئاو دەشووشتەوە، ئاوەکە بایی ئەوەندە لەناوەوەی دەمێنێتەوە و کێشەکەیشی قورس دەکات بتەوێ بەکیلۆ بیفرۆشی ئەوا لەجیاتی کیلۆیەك، دەبێتە کیلۆ و چارەگێك و زیاتریش. سەیرەکەی لەوەدابوو خاسی من زۆر لەهی ئەوان جوانترو باشتربوو، کەچی من هەتا کیلۆیەك خاسم دەفرۆشت، ئەوان شەش حەوت کیلۆ خاسیان لێی دەفرۆشت.**

---

سەرهەڵبڕێ و سەیری ڕووداوەکانی ئێراق بکات، کە فەرماندەیەکی سەربازی گەورە دیار نەمێنێ و هاوڕێکانیشی هەواڵی نەپرسن بۆ ئەوەی بزانن چی بەسەر هاتووە، چونکە دەیانزانی دەزگاکانی ئەمن ئەو فەرماندە نەگبەتەیان لەناو بردووە.

سەدام هەمیشە دەیگوت: مـن دەزانم کـە خـەڵك بـیر لـە خیانـەتی مـن دەکەنـەوە، بۆیـە دەسـتی دەکـرد بەدابەشکردنی تۆمەت بەسەر ئەو کەسانەی دەیویست لەناویان بەرێ.

تەنانـەت لەیـەکێك لـە کۆبوونـەوەکانی لەگـەڵ وەزیرەکـانی ئێـراق کـاتی شـەڕی ئێـران و ئێـراق پێیوتبـوون: چیبکەین بۆ دەربازبوون لەشەڕو ئەو بارودۆخە ناهەموارە؟ وەزیـری تەندروسـتی وەڵامی سەدام بەم شێوەیە دەداتەوە: ئەگەر بکرێ لەسـەر حوکم لا بچیت هـەتا ئاشتی لەگـەڵ ئێران بەرقـەرار دەبێـت ئینجا بگەڕێیتـەوە دەسەلات.

ئەو قسەیەی وەزیر بەلای سەدامەوە زۆر ناڕەوا دەبێت و هەر لەوێشدا سەدام داوای کرد وەزیری تەندروستی لە کۆبوونەوەکە بکرێتە دەرەوە، بەپێی قسەی خزمێکی نزیکی وەزیـری تەندروستی کە بەڕێوەبەری لیژنـەی پیشەسازی سەربازی ئەو کات بوو، ئـەوەبوو ڕۆژی دوایـی چەند پارچەیەك لە لەشی وەزیـری تەندروسـتی تەسلیم بەخێزانەکەی کرایەوە.

لەناو دەزگای سەربازی ئەوە بڵاوبۆوە هەر کەسێك بیروبۆچوونی جیاوازی هەبێت لەبیروبۆچوونەکانی سەدام بەتایبەتی فەرماندە گەورەکان ئەوا دووچاری ئیعدام دەبێتەوە.

سەدام حسێن ورد وردە توانی ئـەوە بسـەلمێنێ کە دەتوانێ بڕیـاری کوشتنی هـەر کەسێك بدات کە هـەواڵی ناخۆشی بۆ بهێنێت ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە یاریدەدەرەکانی درۆی بۆ بکەن.

دوای هـاتنی سالانی نـەوەت شـەش و نـەوت وحـەوت هـەمووان دەسـتیان کرد بەدرۆکردن بـۆ سـەدام حسـێن دەیانوت کە شەڕی کەنداویان بردۆتەوە.

عەبد حەموود کە یـەکێك بـوو لـە یاریـدەدەران و سـکرتێری سـەدام بـوو لـە شـایەتیەکەی ساڵی٢٠٠٣دا دەڵێ سەدام ڕاستی هێز و توانای سوپاکەی نەدەزانی چونکە لە ڕۆژانی یەکەمدا سەردانی سوپای دەکرد و قسـەی لەگەڵ سەربازەکاندا دەکرد بەڵام لەدواییدا پشتی دەبەست بەڕاپۆرتی نووسراو بۆ زانینی هەواڵی سوپاکەی.

سەرچاوە: ماڵپەڕی ئیلاف/ زەید بنیامین

## خوشك و برایەك لەڕێی( face book ) فەیس بووك حەز لەیەك دەكەن[٦٨]

[٦٨] - دوای سەرهەڵدانی ئەنتەرنێت، فەیسبووك لەساڵی ٢٠٠٤ لە وڵاتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا لەلایەن (مارك زوركربێرگ)دامەزرا كە لەم ڕۆژگارەدا یەكێكە لە تۆڕە كۆمەڵایەتیە بەرفراوانەكانی دنیای تەكنەلۆژیا كە بەملیۆنان خەڵكی بەخۆیەوە سەرقاڵ كردووە.

فەیسبووك وەكو تەواوی میدیا و دەزگاكانی تری ڕاگەیاندن، لایەنی باش و لایەنی خراپی هەیە.

**لایەنە باشەكان:-**

* فەیسبووك ئاستی ڕۆشنبیری و هزری مرۆڤ بەرز دەكاتەوە كە لەڕووی زانستی و كۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەدەب و هونەر و فەلسەفە و ئاین و وەرزشەوە پەرتووكێكی گەورەیە، دەتوانی ڕۆژانە لەڕێی ئەو كەسانەی لەو تۆڕەدا هاوڕێتن، زانیاری و هەواڵی تازە و نوێ وەربگری و لایكی ئەو پەیجانە بكەی كە نوێترین زانیاری و هەواڵت پێ دەدەن بەمەیش دەبیتە كەسێكی بەئاگا لەهەواڵ و دەنگوباسەكانی دنیا كاتێك زۆرترین شت دەخوێنیەوە بەتایبەت هەواڵی بەپەلە لەچەند ساتێكی كەم پێتدەبەخشێ.

*دەتوانی لەڕێی ئەو شتانەی بڵاویان دەكەیەوە كەسایەتی خۆت دەربخەیت و هاوڕێی تازە پەیدا بكەی و لەو ڕێیەوە ئاگات لە دۆست و خۆشەویستانت ببێت و لە بۆنە خۆش و ناخۆشەكاندا لێیان دانەبڕێی.

**لایەنە خراپەكان:-**

*بەكارهێنانی بەشێوەی خراپ بەتایبەت ئەو كوڕانەی خۆیان دەكەنە كچ و ئەو كچانەی خۆیان دەكەنە كوڕ بەناوی خوازراوەوە، یاخود لەو ڕێیەوە كچانی پێ لەخشتە دەبەن بۆ نموونە هەندێ كەسی خراپ و بێكار ئەم و ئەو بێزار دەكەن بەداواكردنی برادەرایەتی و كامێرا ناردن و كردنەوە و یەكتر بینین و لەكەداركردنی كەسێك كاتێك بەناوێكی خوازراوەوە ئەكاونتێك دروست دەكات بێ ئەوەی خۆی ئاشكرا بكات چ قسەیەكی ناشیرین هەیە دەیكات.

*دروستبوونی كاریگەری خراپ لەپەیوەندە كۆمەڵایەتیەكان كە لەو ڕێیەوە وابخوازێ دابڕان دروست ببێت بەهۆی دواندنی یەكترەوە سەردانی یەكتر نەكەن، هەرچیەكیان هەبێ لەو تۆڕەدا بەیەكی بگەیەنن.

*دانیشتنی زۆر بەدیار فەیسبووكەوە لەڕووی تەندروستیەوە كاریگەری بەسەر پشت و جەستە و لاوازبوونی چاو هەیە نەخاسمە ئەوانەی بۆ ماوەیەكی زۆر بەدیار ئینتەرنێتەوە دادەنیشن ئەمەش هۆكارێكە بۆ كاڵبوونەوەی خۆشەویستی نێو خێزان و كۆمەڵگا.

*جۆرێك لەتەمبەڵی بەرامبەر بەئیش و كارەكان دروست دەكات بەتایبەت قوتابی كاتێكی زۆری لێ بەفیڕۆ دەدات ئەگەر بەرنامەیەكی بۆ خوێندن و كاتەكانی چوونە سەر ئەنتەرنێت نەبێت.

*كەمبوونەوەی هاتوچۆ بەهۆی ئاڵوودەبوون و خووگرتنی بەردەوامەوە پێی.

*دابەزینی ئاستی خوێندنەوەی كتێب كە هەرچەند تەكنەلۆژیا پێشبكەوێت، هیچ پەیج و ماڵپەڕێك ناتوانێت جێی كتێبێك بگرێتەوە كە هەر كاتێك ویستت لەبەردەستتە و بەبێ پارە تێچوون و ماندووبوون لەجێوە دەیكەیتەوە و هیچ كاریگەریەكی خراپیش لەدوای خۆی بەجێ ناهێڵێت.

تاسەر بمێنێ ڕۆژ بەڕۆژ شتی سەیرو سەمەرە دەبینین و گوێبیستی شتانێ دەبین کە لە ئاقاریدا چاوئەبلەق و دوش دەمێنین، پێمان عەنتیکەیە چما دنیا ئەوها گۆڕاوە؟

برادەرێکم بەیانییەکی زوو تەلەفۆنی بۆ کردم وتی: مامۆستا دەمەوێ هەر ئێستا بتبینم.

بەشێنەیی پێموت: خێرە؟ خۆ هیچ نەبووە؟

وەلأمیدامەوە وتی: کە هاتیە لام هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم، دەی وا لەماڵەوە چاوەڕوانتم.

یەکسەر تەلەفۆنەکەی بەڕووم داخست. لەدەروونەوە بەخۆمم وت: واباشە خۆم بگەیەنمە لای، نەوەکو شتێك قەومابێ و پێویست بەبوونی من بکات.

بەپەلە خۆم گۆڕی، سولفم لە گەڕێنەکەمدا[٦٩] ، کە نەختێ گەرم داهات، بەڕێ کەوتم، بەکەمتر لە پێنج دەقە گەیشتمە بەرقاپی ماڵیان ، دابەزیم، دەستم بەپلاکی زەنگەکەوە نا، هێندەی نەبرد برادەرەکەم دەرگاکەی خستە سەر گازەرای پشت و بەدەم زەردەخەنەیەکی دەستکردەوە وتی: فەرموو بۆ سەرەوە هەڵکشێ مەترسە کەسمان لەماڵەوە نیە.

پێمهەڵێنا، بۆ سەرەوە ڕۆیشتم و لەهۆڵی دانیشتن لەنگەرم گرت.

برادەرەکەم گلأسێ ئاوی پێدام و هات لەتەکمەوە دانیشت، سەری بەسینگیدا شۆڕکردەوە، منیش بەدەم کۆخەیەکی نەرمەوە ڕووم تێیکرد و پێموت: هاااا، چیە؟ ئەوە پاپۆڕەکەت لە چ دەریایەك نقوم بووە؟ دەی قسەبکە بزانم چی بووە؟

ئەویش سەری هەڵبڕی و هەڵیدایێ: مامۆستا بگە فریام کارێکی زۆر خراپم لێ قەوماوە!

بەدەم قاقای پێکەنینەوە پێموت: خۆ پیاوت نەکوشتووە؟

وتی: شوکر بۆخوا لەو پیاوانە نیم دەستم بچێتە خوێنی هیچ کەسێك.

پێموت: ئەی ژنت هەڵگرتووە؟

وتی: نەوەڵلأ لەو تەرحە پیاوانەش نیم چاوم لەناموسی کەسبێت.

نەختێ سەرم لێی بادا، ئاهێکی قووڵم هەڵکێشا: کەواتە چی بووە؟ چ ڕوویداوە؟

کەچاوەکانی نایە سەر یەك و کردنیەوە: ئەو ئەنتەرنێتە نەعلەتیە شەیتانیە کارێکی وای پێکردم هەتا مردن ناتوانم لەبیری بکەم.

---

[٦٩] – گەڕێن: ماشێن، سەیارە ، ئۆتۆمبێل.

دووبارە سەرم لێی بادا: ئەنتەرنێت ئامێرێکە بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی دروستکراوە ئەوە ئێمەین نازانین لەجیاتی باش بەکارهێنان، بەخراپەو بۆشتی خراپ بەکاری دێنین، دەی قسەبکە خەریکە دڵم دەتەقێت.

بەدەم هەڵکێشانی هەناسەیەکی دوور و درێژەوە: تۆ شارەزای ئەم خانوەی دوو نهۆمە و خانوویەکی پان و پۆڕە، من و ئەو خوشکەم هەریەکەمان ژووری تایبەت بەخۆمان هەیە و هەریەکەمان لاپتۆپ و ئەنتەرنێتی خۆی هەیە و هەر یەکەشمان باراش[٧٠] لەئاشێك لێ دەکەین.

وتم: ئەوەی دەوڵەمەندبێ ئەو شتانەی بەلاوە ئاساییە، شوکر وەکو من نین، شەش سەرخێزان لەخانوویەکی سەد مەتری و لەدوو ژووردا ژیان دەگوزەرێنین.

بەدەم زەردەخەنەیەکی تاڵەوە وتی: تۆ خراپ لەمن مەگە، مەبەستم لاف و گزاف نیە.

کە پرسیم: ئەی باشە مەبەستت لەهێنانەوەی ئەو هەموو شێرو رێوییە چیە؟

وەلامی دامەوە وتی: ئێمە لەماڵەوە مەگەر بۆ ئێشێکی تایبەت وەئەگینە شەوانە دوای سەعات دەی شەو هەر یەکەمان دەچێتە ژووری خۆی و خۆی بەکارێکەوە سەرقاڵ دەکات، من بەجۆرێ هۆگری ئەنتەرنێت بوومە جاری وا هەیە مەلای بەیانی بانگ دەدات هەر بەدیار ئەنتەرنێتەوەم، بەناوێکی خوازراوەوە پێگەیەکم لە فەیس بووك کردبۆوە، تۆ ئەوە دەزانی بەناوی خوازراوەوە ناوم نابوو (فارس کەلاری)، ئیتر بەردەوام لەگەڵ ئەم و ئەو، لەگەڵ کچێك بەناوی فریشتە بەنووسین و مەسیج یەکترمان دەدواند، بەجۆرێ هەست و نەستمان بۆ یەکتر دەردەبڕی، ئاشنای یەك بووین شەوانە تا درەنگانێکی وەخت بەیەکەوە لەسەر خەت بووین، دوای تێپەڕ بوونی ماوەیەك هەر بەگومان بووم کە ڕەنگە ئەو (فریشتە) کوڕبێ و خۆی کردبێتە کچ، بۆیە پەتی ئارامیم پچڕا و حەوسەڵەم هەڵگیرا، داوام لێی کرد دەموچاوی خۆیم نیشان بدات، خۆی گران دەکرد و نەدەهاتە ژێر بارەوە، وازم لێی نەهێنا داوام لێی کرد لەرێی کامیراوە یەکتر ببینین، ئەو داوایەشی ڕەتکردەوە، هەر وازم لێی نەهێنا قەناعەتم پێی هێنا بزانم ئایا کوڕەو خۆی کردۆتە کچ، یان ئەوەتە هەر کچەو تەواو.

گفتوگۆیەکی زۆرمان لەو بارەوە کرد، فریشتەدەیوت: من کچم و منیش ڕەتم دەکردەوە: نەخێر باوەڕم بەو قسانەت نییە، هەبێ و نەبێ کوڕی و بە من ڕادەبوێری، وەئەگەرنا بەبەڵگە بۆم بسەلمێنە کە تۆ کچی.

---

[٧٠] – باراش: گەنم کاتێك لەفەردە دەکرێت و دەبردرێتە ئاش تا بهاڕدرێ و بکرێتە ئارد.

لەو گفتوگۆیەدا هەر دەیوت: ببوورە وەکو کولتوور ڕێ بەخۆم نادەم دەموچاوی خۆمت نیشان بدەم، ترس لەئێوەی کوڕ ئەگەر ئیستیغلالمان بکەن، لەوەوە بۆ مەرام و نیازی گڵاوتان بەکارمان دێنن.

من لەو سەرکێشی و نکۆڵیکردنە بەردەوام بووم، هەر دەمووت: فەرموو ئەگەر کچی، قەینا کامیراکەت بکەوە و لەکونی کامێراکەوە شوێنێکی خۆتم نیشان بدە، تاوەکو بزانم کچی و هەر بەڕاست تەمەنت هەژدە ساڵە.

ئەویش دەیوت: ئەوەللا تۆ خۆتم نیشان بدە بزانم بەو وەسفەی بۆت کردووم ئەوهای یان نا؟

من حەزم نەدەکرد وا بەئاسانی خۆمی نیشان بدەم تا لێی دڵنیانەبم ئاخۆ کچە یا کوڕ، بەڵام کاریگەری قسە نەرم و نیانەکەم وایلێکرد زوومی کامێرای لاپتۆپەکەی ڕوو بکاتە بەرۆکی و بێ پەردە خۆیم نیشان بدات و یەکسەر کامیراکەی کوژاندەوە، وتی: ئێستا دڵت داکەوت، ببوورە حەزم لە قاوەیە وا دەچمە خوارەوە، دوای چارەگێکی تر دێمەوە سەر خەت.

منیش هەمان قسەم کرد و یەکترمان بەجێ هێشت.

کاتژمێر سێ و چل دەقەی شەو بوو، خشپەی یەك شت نەدەهات، بەهێواشی دەرگاکەم کردەوە تا ماڵەوە هەست بەهیچ نەکات، خوشکەکەم ئەویش بەهێواشی دەرگای ژوورەکەی کردەوە تا کەس بەخەبەر نەیەت، هاتە خوارەوە بەرەو ئاندینەکە ڕۆیی، منیش بەدوایدا چوومە خوارەوە، پێموت: خوشکەکەم ئەوە خێرە بەو شەوە نەنووستووی؟

بەدەم زەردەخەنەیەکەوە وتی:حەزم لەخواردنەوەی کوپێ قاوە بوو بۆیە هاتمە خوارەوە، ئەی تۆ؟

وتم: منیش هەر بۆ خواردنەوەی کوپێ قاوە هاتومەتە خوارەوە.

کاتێك قاوەی ئامادەکرد و لەدوو گڵاسدا تێیکرد، هاتە بەرانبەرم و لەسەر یەك لە کورسیەکان دانیشت، بەدەم فڕکردنی قاوەوە کە بیرم لە وەڵامی پرسیارەکەی ئەم و دواتر پرسیارەکەی خۆم کردەوە، گومانێك دڵی تەنیم، لا ئیرادی پێموت: خوشکەکەم ئاکا بەم شەوە درەنگە خەریکی ئەنتەرنێت بوویت؟

بەپێکەنینەوە وتی: بەڕێوەڵڵا، ئەی تۆ؟

لێم پرسی: هیچ هاوڕێیەکت هەیە بەناوی فارس کەلاری؟

چاوی زەق بۆوە، ئەویش بیّ ویستی خۆی یەکسەر وتی: چما ئەو فارسە تۆی؟
وتم: ئەی تۆ فریشتەی؟
وتی: بەڵیّ.

نەمتوانی قاوەکە تەواو بکەم، لەجێوە هەستام، چوومە نهۆمی سەرەوە لاپتۆپەکەم کوژاندەوە تا بەرە بەری بەیان نەخەوتم، گەلیّ خەفەتم خوارد، خەمەکەم نەختیّ بەوە دەرەوییەوە لەبەر خۆوە دەموت: باشبوو هەر لەوەندە من و ئەو خوشکەم لەبەر یەك ئاشکرابووین، چانەبوو داوام لێی نەکرد تەواوی خۆیم بۆ ڕووت بکاتەوە؟

ئەگەر خوشکەکەم تاوانباربیّ ئەوە من دە ئەوەندە تاوانبارم، شەوی ئەمشەو ئەوەندەی بیر لەو خوشکەم دەکەمەوە هەرچەندە لێنەگەڕاوم کەس لەماڵەوە بەم کەین و بەینە بزانێت بەڵام کێشەی گەورەی من و ئەو خوشکەم مەگەر چۆن یەکتر نادوێنین و منیش ئەوەندەی کە چاوم پێی دەکەویّ یەکسەر فەیسبووکەکەم دێتەوە پێش چاو کە چۆن بۆ من سینگ و بەرۆکی خۆی کردەوە لەوەشدا بەحەیابوو هەر نەیویست خۆی ئاشکرا بکات لەکاتێکدا ئەگەر ئەمەی بۆ خەڵکێکی تر بوایە کارەسات دەقەوما، ئێستاش بڕیارمداوە ڕەنگە بەم شێوەیە بمێنمەوە شێتبم، بۆیە بڕیارمداوە سەری خۆم هەڵبگرم و بچمە دەرەوەی وڵات، هەرنا بتوانم دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك ئەو دیمەنە لەبیر بکەم.

منیش بەهەناسەیەکی قووڵەوە پێموت: تۆ پێویستت بەوەیە ماوەیەك لەو ماڵە دوور بکەویەوە بەڵام لەگەڵ ئەوە نیم بچیە دەرەوەی وڵات، خۆ ئەگەر بتوانی کەسێك دیاری بکەیت و بیهێنی و بیگوازیەوە و ماڵی خۆت بکەی و داوا لەو خوشکەت بکەی تا ماوەییّ سەردانیت نەکات و یەکتر نەبینن، پێموایە هەست و نەستت دەگۆڕیّ.

ئەویش پێیوتم: ئەوەش بیرۆکەیەکی جوانە، دایکم زوو زوو پێم دەڵیّ کوڕم ئەگەر حەزت لە ژنە کێت دەویّ با بۆت بچینە داخوازی و بۆتی بێنین.

منیش وتم: ئەوە دەرفەتێکی باشە ئەگەر کرا هەر ئەمڕۆ لەم بارەوە قسە لەگەڵ دایکت بکە و دڵت چ کچێك دەگریّ با بۆت بچێتە خوازبێنی و بیهێنە.

ماوەیەکی باش لەلای مامەوە، پاشان گەڕامەوە ماڵ، هەفتەیەکی نەبرد، هەواڵم پیّ گەیشت خوشکەکەی خۆی سوتاندوە و ئەویش ئەو کچەی مارەی کردبوو بیگوازێتەوە تەلاقیدا و لەناکاو بزر بوو، کەس نازانیّ چووەتە دەرەوەی وڵات؟ چووەتە کویّ؟ ئەوە مەتەڵێکە ئەوساو ئێستایش نەمزانی چی لێهات؟

## ✍بۆ زانیاریت:

**سەرنج بدە و بیر بکەوە**

داهێنەری رادار (د. رۆبرت مۆریی بێج) دەڵێت: باوەڕهێنان بەبوونی خوا لەو کارانەیە کە لە قووڵایی هەست و ویژدانی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێ.

ڕادار: دەزگایەکی ئەلیکترۆنییە بۆ شەپۆلەکانی ڕادیۆ و ئامێرە بێتەلەکان بەکار دەهێندرێ بۆ دیاریکردنی جێگەو شوێنی ئەو تەن و لەشانەی بەچاو نابینرێن جا بەهۆی دوورییەوەبێت یاخود تاریکی یان هەوروباران.

شەمشەمەکوێرە دەنگەدەنگی شەست هەزار شەپۆلێ لە چرکەیەك دەگرێت و ئەوەش کارێکی سەرسوڕهێنەرە، ئەوەتانێ کاتێك شەو دادێ زۆر بەئاسانی بەنێو ئەم کۆڵان و ئەو کۆڵان و نێو ماڵ و ئەو ئەشکەوت و دارستانانە هاتوچۆ دەکات بێ ئەوەی خۆی لەدیوار و دەرگا و دار و درەخت و بەردێك بدات چونکە ڕادارێکی هەستیاری زۆر بچووکی بۆ ڕێنموونی و پارێزگاریکردن پێوەیە ، زانایان لەتێڕامان و وردبوونەوەی ئەو خوڵقەندەی خوای پەروەردگار توانیان ڕادار دابهێنن.

زانایەك ویستی تاقیکردنەوە لەسەر ڕاست و دروستی شەپۆلەکانی ئەو باڵندە ئەنجام بدات، هات کۆمەڵە گوشێکی هێنا و بەڕیز لەژوورێکدا شۆڕی کردنەوە کە دووری نێوان گوش و گوشێك تەنها ٣٥سم بوو، ئەمەو سەرەوەی هەر گوشەی بە زەنگێکیەوە بەستا.

ئەوجا دوو شەمشەمەکوێرەی هێنا و لەژوورەکەدا بەرەڵای کردن و تەواوی گڵۆپەکانی کوژاندەوە، ، سەرنجیدا ئەو شەمشەمە کوێرانە زیاتر لە سێ کاتژمێر لەو ژوورەدا هاتوچۆیان کرد بێ ئەوەی خۆیان لەهیچ گوشێك بدەن و زەنگەکان لێ بدەن، ئەو زانایە گەیشتە ئەو ڕاستیەی کە ئەو ڕادارەی بە شەمشەمە کوێرەکەوەیە بەرهەمی توانا و زانایی پەروەردگارێکی مەزنە.

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

﴿ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تُقۡسِطُواْ فِي ٱلۡيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ ﴿٣﴾ ﴾ النساء: ٣

## ✍ چەند ژنی یان فرەژنی و شتی تریش....

✎ لەوەتەی مرۆڤ لەسەر گۆی ئەم زەویە هەیە و لەوەتەی مرۆڤ بووەتە کۆمەڵگا و خاوەنی شار و شارستانیەتە لەبەر هۆکاری هەمە جۆر و هەمە چەشن، چ بەشێوەی ڕەوا لەناو خێزاندا، چ بەشێوەی ناڕەوا لە دەرەوەی خێزاندا ئەم دیاردەی فرەژنییە هەبووە و مومارەسە کراوە، هەندێ کات بەبێ سنوور و هەندێ کاتیش لە ژمارەیەکی کەم یان زۆردا، هەر کەسێك لە مێژووی مرۆڤایەتی ئاگاداربێ دەزانێ کە تەنانەت پیاوچاکان و پێغەمبەرەکانی خوداش ژمارەیەکی زۆری ئافرەتی کەنیزەك و هاوسەریان هەبووە، وەکو بەڕاشکاوی لە کتێبی (مقدس)دا هاتووە، لە باسی داوود و سلێمان، خۆ مێژووی دەوڵەمەندان و پادشایان و خەڵکانی تری سادە و ئاسان توانیویانە ئەم کارە بکەن دوور لە هەموو سەرپێچی و ئاڵۆزییەك، هەروەکو ئێستای ئەورووپایی و ڕۆژئاواییەکان و ئەوانەی دیندار نین و حسێب بۆ ڕەوا و ناڕەوا ناکەن و باوەڕیان بە حەڵاڵ و حەرام نییە، لە هەموو ئەم دنیایە ئەمانە هەموویان باوەڕیان بە فرەیی هەیە و زۆر بە ڕاشکاویش مومارەسەی دەکەن و هیچ ئیشکالیشیان لەسەر ئەم جۆرە فرەییە نییە، بەڵکو کاتێ توورە دەبن و دەنووسن هەموو ناڕەزاییەکەیان لەسەر فرەیی ناو خێزان و فرەیی حەڵاڵە، ئەگینا قسەیان لەسەر فرەیی حەرام و زینا نییە و هەموو بەچاکی دەزانن و سەری لێ ناکەنەوە بەڕاستی تاکە ئاینێك کە تەنزیم و تەحدیدی ئەم کارەی کردبێ تەنها ئیسلامە کە کۆتایی پێ هێناوە بە چوار ژن و مەرجی(عدل)دادپەروەریشی بۆ داناوە، کە زۆر بە زەحمەت لە کەسێکدا دێتەدی ئەگەر نەشهاتە دی، نابێ ئەو کەسە زیاتر لەیەك ژن بهێنێ[٧١]

لەبەردەم بابەتی فرەیی، دوو ڕێگەمان لەپێشە:

---

[٧١] - سەید ئەحمەد پێنجوێنی دەربارەی فرەیی گۆڤاری نواڵەی نوێ، ژ٤١، س٢٠٠٦، ل٦-٧

❁ یەکەم: یان ئەوەتا خێزان بینا بکەین، چونکە ژن و پیاو بەسروشتی خۆی حەز بەدروستکردنی خێزان و بوونی ماڵ و منداڵ دەکات.

❁ دووەم: یان ئەوەتا دەبێ بەدڕەوشتی بڵاو بکەینەوە کە ئەمەش لەلای تاك تاکی ئافرەتانەوە نەبێت، قەبول ناکرێ. بۆیە چارەسەری قەیرەیی تەنها ڕازیبوونی ئافرەتانە بە چەندژنی، واتا دەبێت ئافرەتان هەبوونی چەندژنی قبوڵ بکەن.

هەرچەندە زۆر دەگمەن ڕێ دەکەوێ ئافرەتان ڕەزامەندی خۆیان لەسەر ئەم بابەتە نیشان بدەن کە لەناخەوە تووشی دڵشکاندنێکی بێوێنە دەبن و دوور نییە تووشی حاڵەتی دەروونیش بن.. لەو بەسەرهاتانە:-

✍بەسەرهاتی یەکەم:

**دوو ژنی سەر بۆ ژنی سێیەم دەکێشێ...**

🕮 مامۆستا جەواد پشدەری دوو ژنی هەیە، بۆی گێڕامەوە، وتی:

✎ ژنی یەکەمم مووچەخۆرە و پارەیەکی باش وەردەگرێ، خۆیشم لەتەك پیشەی مامۆستایی، نووسینگەی خانووبەرەم هەیە و لایەنی ماددیم زۆر باشە حەزم لێبوو ژنی دووەم بێنم، ڕۆژێکیان لەمەجلیسێك دانیشتبووم، باس هاتە سەر باسی چەندژنی ، من بە لەخۆ بوردییەوە زمانم گەڕاند وتم: پیاو کەسێکە قسەیەکی کرد، خاوەن قسەی خۆیبێ، من خۆم بەپیاو دەزانم، لەخۆشم ڕادەبینم و دەوێرم دەنگ هەڵبڕم کە وتم: دەیکەمە دوو، تەواو دەیکەمە دوو.

هاوڕێکانم بەدەم قاقای پێکەنینەوە وتیان: بەردی گەورە نیشانەی نەهاویشتنە، ئەوەی لەشەڕ نەبێ شمشێری تیژە، زۆر کەس ئەو قسەیان کرد و هیچیان لەبارتەقا نەبوو تەنانەت بوێرن لەبەردەم ژنیان بکۆخن.

من کۆخیم و قسەی خۆمم بردە سەر، ژنی دووەمم هێنا.

ژنی یەکەمم بێ ئەوەی یەك دەقە لەگەڵ ژنەکەی دیکە دانیشێ، بەهەوای هەوەس ڕقی لێ دەبۆوە، بێ ئەوەی چاوی بەچاو کەوتبێ حەزی بەچارەی نەدەکرد ، ئێستاش زوو زوو دێتە بن سەرم و بەگوێم دەچرپێنێ: پیاوەکە وەرە مەردی خوابە ڕازیبە و دەم بکەوە، دەم هەڵبێنە، وەرە ژنی سێیەم بێنە وەعد کام ژن جوانە، کامە ژن حەزی پێ دەکەی بۆت دەچمە داخوازی و ماڵ و مەسرەفی گواستنەوەشت لەسەر من بێت.

ژنەکانم هەریەکەیان لەخانوویەکی سەربەخۆدانا، ئەویان لەوسەری هەولێر و ئەویتریان لەوسەری هەولێرە. ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ کە هیچ ژنێك حەز ناکا ژنی

بەسەربێت.

*　　*　　*

✍ لەوەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ:

❁یەکەم: زۆربەی ئەوانەی ژنیان بەسەر دێ، وادەزانن بەشێك لەخۆشەویستی پیاوەکانیان لێ زەوت دەکرێ، وەکو چۆن ئەو حاڵەتە لە منداڵی یەکەم و دووەم بەرامبەر بە دایك ڕوو دەدات.

❁دووەم: ژنی یەکەم قوربانی بە زۆر شت دەدات بۆ ئەوەی سەرنجی پیاوەکەی بەلای خۆی ڕاکێشێ.

✍✍بەسەرهاتی دووەم:

**ژنان حەز ناکەن لەخەویشدا ژنیان بەسەربێت**[٧٢]

🕮 بەسەرهاتێکی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە:

✍ پیشەکەم وای دەخواست لەو کولێژە، وانەی زمان بڵێمەوە، خوێندکارانیش کچ و کوڕ تێکەڵاوە، کۆرسی یەکەم تازە دەستی پێکردبوو، پێش ئەوەی پرسیارەکان دابەش بکەم، لەنزیکەوە چەند ئامۆژگارییەکی کورتی خوێندکارانم کرد وەکو تکا و ڕجا کەس سەیری یەك نەکات، هاااا، ئەوە پێموتن ئەوەی گــزی بکات و قۆپیــەی لێ

---

[٧٢] - مامۆستا (شێخ مەزهەر خۆڕاسانی) لە ڕەمەزانی مانگی ٧ی ٢٠١٤دا، شەوانە لە تەلەفزیۆنی لۆکاڵی (سرووشت)ەوە بەرنامەیەکی جوان و بەپێزی هەبوو، خەڵکێکی بێشوماری شاری هەولێرو دەوروبەری سەیریان دەکرد، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام لێرەدا ئاماژەی پێ بدەم، لەبابەتی فرەییدا قسەیەکی ئەوەندە خۆشی گێڕایەوە کە دەق لەگەڵ ئەم بابەتە هاوڕابوو، پوختەی قسەکانی بۆ ئەو بەسەرهاتە وەکو قسەیەکی خۆش ئەوەبوو:

خەوم بینی، گەلێ کەیفساز بووم، کە لەخەوەکەم بێدار بوومەوە، ڕووم کردە ژنەکەم و پێموت: ئەرێ تۆ دەزانی لە چ خەوێکی خۆشدابووم!

ژنەکەم بە تەوسەوە وتی: خەوی چی ؟، دەی بۆمی بگێڕەوە بزانم خەونت بەچییەوە بینی؟

وتم: نا، نایگێڕمەوە، دەترسێم تووڕەبیت.

وتی: تووڕە نابم، چۆن لەسەر خەونێکی سادە و ساکار تووڕە دەبم.

وتم: لەو خەوەدا ژنم دووەمم دێنا، بەزم و ڕەزمێکی ئەوەندە خۆش بوو، لەدوای خەڵکێکی زۆرم گێڕابۆوە، ئاااای کە زۆر دڵخۆش بووم.

ژنەکەم چاوی لێ زەق کردمەوە، ناوچەوانی لێ گرژ کردم و وتی: دەبێ هەر ئێستا بخەوییەوە و خەو ببینی و بچی ئەو ژنە تەڵاق دەی.

بکرم، بێ چەند و چوو دەریدەکەم و سفری بۆ دادەنێم.

دەفتەری ئەزموونیم دابەشکرد، هەر یەکە پرسیاری خۆی وەرگرت، ئەوجا وتم: هاااا، وامەزانن غافڵگیرم، پشتی سەرم چاوە، هەر جوڵەیەکی نامۆ بنوێنن، دەتانبینم ئەوجا وەزع لەخۆتان تێك مەدەن.

چوومە سەرەوە، لەسووچێکی نێو هۆڵەکە وەستام، هەندێ جار دالغەم لێ دەدا، هەندێ جار وەکو کامێرای شاراوە چاوم بەکونج و کەلەبەری ئەو شوێنە دەگێڕا و لە بوونی هەر گومانێکدا خۆم دەگەیاندە ئەو شوێنە، بەتایبەت ئەگەر بمزانیایە قوتابیەك دەموچاوی سوور هەڵگەڕاوە یان جوڵە جوڵیەتی و تۆتکە[٧٣] ناگرێ، ئەمەش وایکردبوو ئەوەی بەخۆی بگوتبایە: پاڵەوان، نەیدەتوانی قۆپیەکەی دەربێنێ و لەسەری بنووسێتەوە.

تاو نا تاوێ تەماشای کاتژمێری دەستم دەکرد، لە بەرە بەری کۆتایی وەکو ئاگادارکردنەوە پێموتن: دەی خێراکەن، کات بەرەو تەواوبوون دەڕوات و، تەنها بیست دەقەتان لەبەردەمدایە، ئەوە چارەگێك ڕۆیی ، ئەوە دە دەقە ، ئەوە پێنج دەقە، وەلێ هەمووان بەپەلە دەفتەرەکانیان هێنا و ڕادەستیان کردم، وەلێ لەو هۆڵە پان و پۆڕە، تەنها کچە قوتابیەکی بەرچاو مابۆوە، دەیوت: توخوا مامۆستا بوەستە چی وام نەماوە ئێستا تەواو دەبم.

بێ هیچ مەبەستێك لێی چوومە پێش، بەدیار سەرییەوە وەستام، بزانم چی ماوە، قیروسیام لەخۆ کرد کە ئەگەر وەڵامەکەی زۆر نەبوو، هەندێکی پێ بڵێمەوە، وەلێ لە دەنگە دەنگی چەك ڕاکێشانێ ڕاچڵەکیم، سەرم بەرز کردەوە زەلامێکم بینی کلاشینکۆفی بەدەستەوە بوو، لوولەی تفەنگی تێ کردم، کە وتم: ئەوە چی یە؟ چ قەوماوە؟

بەتووڕەییەوە لێی ڕاخوڕیم: وەرە بزانم چیت لەبن سەرە؟ هەر ئێستا سی فیشەکت لێ سارد بکەمەوە؟

بەترس و لەرزەوە، پێموت: تۆ کێی؟ ناوت چیە و چ ئیشت لێرەیە؟ دەی بۆ دەرەوە!

بەهەڵچوونەوە وتی: نەخێر ناچمە دەرەوە، من باوکی ئەو کچەم، فەرموو ئەگەر نیەتت خراپ نیە، خێرە بەتاقی تەنیا لەگەڵیدا لەم شوێنە دەمێنیەوە؟ ئێستاش بۆ ئەوەی حەیامان نەچێ بەپیاوانە وەرە پێش و کچەکەم مارە بکە، یا لەوەندە بیڕێتەوە.

---

[٧٣] - تۆتکەناگرێ: ئۆقرەناگرێ، هێورنابێتەوە..

هەڵەرزیم، ئاهێکی قووڵم هەڵکێشا، کە وتم: ئاخر من خاوەنی ژن وماڵ و منداڵی خۆمم ، ئەو کچەی تۆ بەکچم دەشێ، من چ لەکچت بکەم خۆی تاخیر کردووە و زوو وەلأم ناداتەوە؟

ئەویش بەتووڕەییەوە دەستی هەڕەشەی لێ شەقاندم: من گێلمە گێلم نازانم چیە! خۆت ڕووڕەشی دنیا و قیامەت مەکە و با منیش تووشی ئەو قەتلە گەورەیە نەبم، دەمێکە هەستم کردووە کچەکەم ئاسایی نییە، هەی ئاگری بن کا، دواجار گومانەکەم چۆن بوو، وادەرچوو. دووبارەی دەیڵێمەوە: بەپیاوانە وەرە پێش داوای دەستی بکە، وەعد داوای هیچت لێ نەکەم تەنها ماڵێکی خۆشی بۆ دابنێ و لەگەڵ ژنەکەی دیکەدا فەرق و جیاوازیان پێ مەکە، قەینا ئەوەشت لەگەڵ دەکەم ئەگەر هەر دەڵێی بۆم ناگونجێ دیسان ئەوەش کێشە نیە لەگەڵ ژنەکەی دیکەت هەر لەو ماڵەی دابنێ و ماڵی بۆ جیا مەکەوە بەس توو ئەو خوایە دڵی کچەکەم مەشکێنە و لەگەڵیان دادپەروەربە.

بەو قسانە گەلێ دەهەری بووم، بەحیرسەوە: ئەوە قسە نییە دەیکەی؟ من بەبەلاش ژنم بۆ بێتە ماڵ نامەوێ، ژنی خۆم عەیبی نیە، ئێرە چونکە حەرەمی زانکۆیە ئەگەر بەخۆشی دەچیە دەرەوە باشە، وەنەگینا بەیەك تەلەفۆن ئاسایشت بۆ بانگ دەکەمە ئێرە، بێن بەشەق بتبەنە دەرەوە.

هەر وازی نەهێنا، بەوپەڕی هەڵچوونەوە وتی: چیە دەتەوێ بەئاسایش بمتۆقێنی و هەڕەشەم لێبکەی؟ بەڕاستی کەسێکی زیرەکی و زۆرت لەبن سەرە، هەر خوا بزانێ چیت لەگەڵ ئەو کچەم کردووە وا ئێستا لێی بەئاگا دێمەوە، دوا قسەم بۆ تۆ: دێیە پێش یان بتکوژم؟

لوولەی تفەنگی خستە تەوقی ناوچەوانم، وتم: ببوورە کچی تۆ بەکچی خۆم دەزانم، بۆیە ناتوانم بیهێنم و بیکەمە ژنی دووەمم.

کابرا ئاگری لەناوچەوان دەباری، دەستی بەپلاکی تفەنگەکەوەنا، دەستم نا بەدەم و چاومەوە گرت و تا هێزم دەبەدەن دابوو هاوارم کرد، لەدەنگی هاواری خۆم خەبەرم بۆوە: سوپاس بۆ تۆ خوایە، چا نەبوو ئەوە خەون بوو.

خێزانم هێشتا نەخەوتبوو، کە منی بەو شێوەیە بینی هەناسەم سوارە و شەلاڵی ئارەقە بوومە، بە پەرۆشەوە لێم هاتە پێش، دەستی بە دەم و چاوم داهێنا، بەهەڵپەیەکەوە وتی: پیاوەکە خێربێ، ئەوە چیبووە؟

پێموت: ژنیٚ ئەزیەت نەبیٚ هەندیٚ ئاوم بۆ بێنە.

ئەویش گلاٚسیٚ ئاوی بۆ هێنام، لێموەرگرت، بەچەند بینیٚ هەڵمقوٚڕاند، گلاٚسەکەم لەجێوە لەسەر مێزەکەی تەنیشتم دانا.

ژنەکەم وتی: پیاوەکە لەوە دەچیٚ خەوێکی ناخۆشت بینیبیٚ؟

منیش دوای ئەوەی شەیتانم بەنەعلەت کرد، لەسیریٚ تا پیوازیٚ تەواوی بەسەرهاتەکەم بۆی گێڕایەوە.

ژنەکەم هەناسەیەکی پڕ ئۆخەی هەڵمژی، سەری ماچکردم، بەدەم زەردەخەنەیەکی گەشەوە وتی: من پیاوی خۆم دەناسم، لێی ناترسێم تەنانەت لەخەویشدا ژنم بەسەر بێنیٚ.

* * *

✍✍✍بەسەرهاتی سێیەم:

## ژنان حەز ناکەن بە سوعبەتیش باسی ژنی دووەمیان لەلادا بکەی[٧٤]

✎ شەوێکیان لە شارەدێی (کەسنەزان) من و دایکم و ئارامی برام چووینە سەردانی ماڵی مام (عارەب سارتکەیی)، تاویٚ دوان لەویٚماینەوە، ، زۆر قسەی خۆشمان کرد، لەدەرگای زۆر باسماندا، نازانم لەچیەوە قسە هاتە سەر پیاوی دووژنە، مام (عارەب)ی قسەخۆش و دەم بەخەندە، گێڕایەوە، وتی: ئێوارەیەکیان دوو سیٚ میوانمان هات، دەمێکی خۆشمان بەڕێکرد، گۆنگرەمان بەقسەی پیاوی دوو ژنە گەرم کردبوو، نەنکی یەك لە میوانەکان هەڵیدایێ: پیاوەکەی من کاتی خۆی هەتا مردیش

---

[٧٤] - برادەرێك بۆی گێڕامەوە وتی:

هەر بە سوعبەت ڕۆژێکیان بەژنەکەم وت: دەزانی ئەمڕۆ لە مەجلیسێك دانیشتبووین، کاتێك باسی ژنی دووەم هاتە گۆڕیٚ، وتم: من ژنهێنەرم، هەر لەو مەجلیسە ژنێکیان پێشکەش کردم وتیان: وەرە پێش بەکراسی بەریەوە پێشکەشت بیٚ.

هەر لەسەر ئەو قسەیە بیٚ ئەوەی ئەسڵ و ئەساسی هەبێت، ژنەکەم غەزری، خۆی لیٚ لا لووت کردم و چەنەی بەست هەتا دوو هەفتەی ڕەبەق قسەی لەگەڵ نەکردم، چەندی وتم: کچیٚ بەسوعبەتم بوو، کاتێك ئاشت بۆوە، وتی: حەز ناکەم بەسوعبەتیش ئەو قسانە و باسی ژنی دووەمم بۆ بکەی. منیش وتم: تۆبە بەحەیاتم لەدەرەوەش ئەو قسەیە ناکەم، وتی: کورە ئاخر دیوار بەگوێیە. وتم: وەعد هەرقسەیەکت بیستەوە ئەوجارەیان لێم مەبوورە، ئەوجا هاتەوە سەر تایم و ئێستا و ئێستا تا دڵیم لیٚ نەڕەنجیٚ هەڵەی وا دووبارە ناکەمەوە.

هەر دەیوت ژن دێنم و ژنیشی نەهێنا، پێتان ناخۆش نەبێ ئێوەی پیاوان ئەو دەنگە دەنگەتان هەیە و لە دەنگە دەنگی خۆتان ناکەون.

هەموومان بەو قسانە چاومان زەق بۆوە، منیش ڕووم تێیکرد، بۆ فشقیات سەرزارەکی پێموت: نەنەگیان مادام ئەو قسەیەت کرد، ئەگەر سەری خۆم لە ئەلحەد[٧٥] دابێ، وەڵلاهی وەبیللاهی وەتەڵلاهی کە هەر سێکی ناوی خوایە، هەر سبەینێ زوو دەیهێنم، تەواو لەخۆم بێزاربووم، ئەوە وەزع نیە منی تێدام؟ بەڕاستی ئەوها خۆش نیە!

دایکی منداڵان تیلە نیگایەکی پڕ لەڕق و کینەی دامێ، لچی لێهەڵێنام و سەری داخست، ئێستاش تا میوانەکان هەستان ورتەی لەدەمەوە دەرنەهات. لەوەوە لێم لا لووت بوو، کە بانگم دەکرد، جوابی نەدەدامەوە، کە دەموت: ئەوە خێرە پۆزمان بەسەر لێ دەدەی؟ بۆ جوابمان نادەیەوە؟

بە سووربوونەوە دەیوت: بڕۆ بڕۆ... بڕۆ با ژنە تازەکەت جوابت بداتەوە! با ئەو قسەت بۆ بکا!

هەستم کرد ئەگەر هەقیقەتی قسەکانی بۆ ئاشکرا نەکەم ڕەنگە هێندەی دیکە دڵی گەرد بگرێ و ئەوەندەی دیکە ناخی خۆی بخواتەوە لەکاتێکدا زۆرم خۆشدەوێ و هەروا حەزم کرد تووڕەی بکەم، بۆیە لێی چوومە پێش، بەدەم بزەیەکەوە پێموت: کچێ ئافرەت بەبیللا سوعبەتم لەگەڵ کردی، ژنی چی و حاڵی چی، بەخوای ژنم بۆ بڕازێننەوە و بەکراسی بەریەوە بۆمی بێننە ماڵ نامەوێ! کە وتم: سبەینێ زوو دەیهێنم، تەواو لەخۆم بێزار بووم ئەوە وەزع نیە منی تێدام ؟ بەڕاستی ئەوها خۆش نیە، مەبەستم ئەوەبوو سوێندم خوارد سبەی زوو گەلأبەیەك بلۆك بێنم و لەناو ئەو پارچە زەویەی دانێم کە دەمەوێ خانووی لەسەر دروست بکەم، ئەوە دەبینی گەلأبە بلۆکم لەناو زەویەکە هەڵڕشت، هەروەها چاك دەزانی چونکە بێ جێ و ڕێین، خانوویەکی پڕوپوختمان نیە تێیدا دانیشین، ببە بەحەکەم توخوا ئاهەقمە بڵێم کەی ئەوە وەزعە منی تێدام، ئێستا دڵت داکەوت؟

بـــەو هەواڵە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بزەیەکی نایە سەر لێو و عێدزی و

---

[٧٥] – ئەلحەد: بەو بەردانە دەوترێ کە لەسەر مردوو دادەندرێ پێش ئەوەی خۆڵی بەسەر دابکرێ و بشاردرێتەوە.

**تووڕەییەکەی نەما**[٧٦]

**لەوەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی:**

**📖 ژنان تاق و لۆق تێیاندایە پێی خۆشبێ پیاوەکەی ژنی بەسەر بێنێ، گەلێك قسە و قسەلۆکی سەیر سەیر هەیە بەبیستنی سەرسام دەبیت.**

**۞کابرایەك دەناسم چاکوچۆنیەکی گەرممان لەبەینداین، دەمێکە ژنی هێناوە، کوڕی لە کۆلێژ و کچی بەماڵ و مێردە، کەچی ئالوودەی بەدڕەوشتی بووە، وازی لێ ناهێنێت.**

**ڕۆژێکیان پێم وت: بەتەمانیت دوای ئەو هەموو تەمەنەی بەڕێت کردووە واز لەو سیفەتە بێنی لەکاتێکا تۆ کەسێکی بەڕێزی و پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بەرزت هەیە؟**

**بەپێکەنینەوە وتی: من هیچ کێشەییەکم نیە چونکە ئیزنم لەژنەکەم وەرگرتووە.**

**لێمپرسی: ئیزنی چیت وەرگرتووە؟**

**وتی: لەوەتەی ژنم هێناوە، ژنەکەم قسەی سەری زمان و بنی زمانی ئەوەیە بەدەیەها و سەدەها جار پێم دەڵێ: پیاوەکە بەس ژنم بەسەر مەهێنە، بۆ خۆت ئازادبە لەدەرەوە لەگەڵ چ ژنێك ڕادەبوێری؟ چی دەکەی بیکە، من هەقم بەسەرتەوە نیە**[٧٧]

---

[٧٦] - برادەرێکم زوو زوو دەگێڕێتەوە دەڵێ: من لەماڵەوە زۆر ئازام، بەئاشکرا باسی ژن دەکەم، ژنەکەم خۆی شێلوو ناکات، پێم دەڵێ: پیاوەکە کێ دەستی گرتووی بڕۆ ژن بێنە و لێت بێ منەتم.

کە دەڵێم: چما ئەو قسەیەت لەدڵەوەیە؟ هەر بەڕاستی ڕازی ژنی دووەم بێنم؟

دەڵێ: بلێ ڕازیم، بۆ ڕازی نەبم، فەرموو ژن بێنە بەلام نەیەوە ئەو ماڵە.

[٧٧] - هەر مرۆڤێك شتێکی هەبوو لێی بسەنیەوە یان لێی بکەیە نیوە پێی ناخۆشە، ژنی دووەم بۆ هەر ژنێك ئەوەیە کە پیاوەکەی خۆشی خۆی و مەسرەف و لەزەت و هەموو شتەکانی لێ دەسەنێتەوە دەیداتە ژنێکەی تر.

پوورە (عەیشێ) [٧٨] ڕۆژێکیان لەماڵەوە قسەی بۆ کردم، وتی:

من لەژیانمدا ژنی وەك پوورە(خەجەی سابیر عارەب) م نەدیوە، بەمانای وشە ژن بوو..دوو کچ و کوڕێکی هەبوو، کوڕەکەی زوو جوانەمەرگ بوو، خەڵکەکە بەناوی پیاوەکەی کە ناوی ( سابیر عارەب ) بوو بانگیان دەکرد.

مام سابیر کچێکی بەمێرد و تاقە کچێکی مابۆوە دەیویست بۆ برازایەکەی بەمێرد بدات، ئەویش لێی دێتە دەست و پێی دەڵێ: پیاوەکە ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی؟ قبوڵم نیە کچەکەمان بۆ ئەم و ئەو بەمێرد بدەی، فەرموو ئەگەر لەخۆت ڕا دەبینی بڕۆ بۆخۆتی به ژن بدە.

کە مام سابیر ڕەزامەندی نیشاندا ژنی دووەم بێنێ، ئەویش قۆڵی خۆی لێ هەڵکرد و کەوتە گەڕان ژن بەژنێنیەکی بۆ کچ و پیاوەکەی ڕێك خست، چاك و باشی پوورە خەجیج لەوەدابوو، ئاوی خۆشووشتنی بۆ هەوێکەی گەرم دەکرد کە ناوی ئایش بوو، ئایش ئەو ڕۆژانەی دەچووە پەرێز و بانان، هەر ئەو منداڵەکەی بۆ بەخێو دەکردو بەجۆرێ سەرفسوونی ئەو ماڵەی دەکرد، کەس لەقسەی دەرنەدەچوو، هەمووان گوێڕایەڵی بوون کە هەتا مردیش کێشەیەك لەو خێزانە ڕووی نەدا.

* * *



٧٨ - ... پلە (عەیشێ صۆفی کەریم) لەدایکبووی ساڵی( ١٩٣٥)ە، ساڵی٢٠٠٢ چووەتە ماڵی خوا، ئێستا لە (کۆیە) دادەنیشێت.

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

﴿ وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ﴿٢٨﴾ ﴾ النجم: ٢٨

# خۆتـان لە گومان بپارێزن

پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەفـەرموێت: ( خۆتـان بپـارێزن لـە حـەوت گوناهـە گەورەکـە، هاوەڵانیش پرسیان: پێغەمبەری خوا ئەو گوناهانە چین؟ فەرمووی: هاوەڵ پەیداکردن بۆ خواو، سیحر و جادوو، کوشتنی کەسێك بەناهەق و،خواردنی سوو و، خواردنی ماڵی هەتیو و، پشت هەڵکردن لە گۆڕەپانی جەنگ و، بوختانکردن بۆ ئافرەتانی داوێن پاکی باوەڕدار) (متفق علیە)

**گومان:** بڕیاردانە لەشتێك کە بە دوو دڵیەوە هەنگاوی بۆ بنێی، لەکاتێکدا لەنێوان کـردن و نەکردنیـدا دابمێنـی نـەزانی ئاکامـەکان بـەرەو کوێـت دەبـەن؟ بۆیـە هـەر بیرکردنەوەیەك کە لێی بەگومانبین واباشە بڕیاری لەسەر نەدەین تا ئەو کاتەی خۆمـان یەکلا دەکەینەوە (ئەوە بۆ کارێکە بمانـەوێ ئـەنجامی بدەین) ئاخۆ دەبێ لەسۆنگەی سـەرهەڵدانی ڕق و کینـە و دڵپیسـی و تۆمەتبەخشـینەوە و لەخشـتەبردن و فریـودانی ئەم و ئەودا، گوناهی گومانبردن چ تاوانێکی گەورەبێ؟

پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرموێ: ( خۆتـان لـە گومـانی خـراپ بپـارێزن ، بەڕاسـتی بەدگومانی زۆربەی درۆیە، بەدوای هەواڵی خەڵکدا مەڕۆن، سیخوڕی بەسەر یـەکترەوە مەکەن و ململانێی یەکتر مەکەن، ئیرەیی بەیەکتر مەبەن و ڕقتان لەیـەکتر نـەبێت، پشـت لەیەکتر مەکەن و بەندەی ڕاستەقینەی خواو برای یەکتربن)[٧٩]

✍ **بەسەرهاتی یەکەم:**

**خەریك بوو بەهۆی گومانێکەوە ژنەکەم تەلاق بدەم**

📖 پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( دع ما یریبك الا ما لا یریبك) واتە: واز لـە کارێك

---

٧٩ - عن ابي هريرة(رضي الله عنه): ان رسول الله(ﷺ) قال: ( اياكم والظن، فان الظن اكذب الحديث، ولا تحسسوا ولا تجسسـوا، ولا تنافسـوا، ولا تحاسـدوا، ولا تباغضـوا، ولا تـدابروا، وكونـوا عبـادالله اخوانا).(بخـاری/ الادب/٥٧١٧).

بێنن کە گومانتان لێیەتی، کارێك بکەن بێگومانبن)

١٢/٩/ ١٩٩٦ لە کۆمەڵگای(کەسنەزان) گەڕەکی( حەسەناوە) بۆ یەکەمجار ژنم گواستەوە، بەهۆی شەڕی ناوخۆی نێوان( پارتی و یەکێتی)یەوە هەموو کەس نەیدەوێرا لەسنووری هەولێرەوە بچێ بۆ سلێمانی و بەپێچەوانەوە هەمان شت ڕاست بوو، تەنانەت ئەوانەی هیچیان لەهیچ نەبوایە بۆ ئەوانیش زەحمەت بوو چونکە بەهۆی تەشقەڵە و توندوتیژی بازگەکانەوە لە (خەتی تەماس) لێپرسینەوەیان لە ورد و درشتی ئەو کەسە دەکرد: ناوت چیە؟ خەڵکی کوێی؟ بۆ کوێ دەچی؟ ئینتیمای حزبیت چیە؟ چ ئیشت هەیە و بۆچی دەچیە شار؟ خزمەکانت چ کارەن و ...هتد.

بۆیە لەو چوون و هاتنە، لەو ڕاگرتن و تەحقیق و تەحقیقکاری و ئەو هەموو پرسیارەی لێیان دەکرا، کابرا هەستی نەدەکرد خەڵکی ئەم ولاتەبێ، بۆیە هەزار و یەك تفی لەخۆی دەکرد کە بۆ جارێکی تر ئەگەر ئیشێکی پێویستی نەیەتە پێش، هەرگیز لەماڵەوە دەرنەچێ و ئەو سەفەرە نەکات.

بەخۆ و خێزانەوە لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٩٨ ماڵمان بۆ هەولێر بار کرد و لەگەڕەکی (گڵکەند) لەخانوویەکی ٨٩مەتری پشت (بالە)[٨٠] سەرچاوەمان گرت، سێ ساڵ زیاتر لەو شوێنەماینەوە، ئاشنایەتیمان لەگەڵ دەرو دراوسێی کۆڵانی ئەو گەڕەکە پەیدا کرد.

ساڵێك بەسەر ئەو باربارێنە تێپەڕی، (شوان)[٨١] ی کوڕە خەزووورم ناوی لە کولێژی ئاداب هاتەوە، دەبوو لە شارەدێی(تەق تەق)ەوە بێتە هەولێر و خوێندنی چوارساڵی زانکۆ لەو شارە بەسەر ببات. ئەو ڕۆژەی هاتە ماڵمان زۆرم خورك کرد و ڕووم لێینا

---

٨٠ - بالە: لەنگە.



٨١ - مامۆستا (شوان ناصح مەجید) دەرچووی کۆلێژی ئاداب/ بەشی ئینگلیزی زانکۆی سەلاحەدینە، دوای پرۆسەی ئازادی بووەتە وەرگێڕ و ژیانی هاوسەری پێکهێناوە، خاوەنی دوو منداڵە بەناوی( شانیا و شارۆ) ئێستا لە ئەمریکا ژیان بەسەر دەبات.

ئەچێتە (بەشی ناوخۆیی) و بەدرێژایی ئەو ساڵە لە لامان بمێنێتەوە، دیاربوو حەزی لێبوو لەگەڵ برادەرەکانی بمێنێتەوە و هەر وایشی کرد.

لەو ڕۆژەوە ئەوەندەی زەروور بوایە بۆ خۆشووشتن و شۆرینی جلی بەری، دەهاتە ماڵمان و گەلێ جومعان[٨٢] لەماڵمان دەمایەوە، دواتر لەنێوارەیەکی درەنگ دەگەڕایەوە بەشی ناوخۆیی.

ڕۆژێکیان دەمەو عەسر بوو، بەرەو بازاڕی شێخەللا شۆڕ بوومەوە، لەنیوەی ڕێ، تووشی ماڵە دراوسێکەمان بووم، دوای چاکو چۆنی، وتی: مامۆستا ماوەیەکە شتێکم لەدڵدایە، نازانم چۆن پێتی بڵێم.

ناچاربووم سەری بۆ بلەقێنم و گوێی بۆ هەڵخەم: فەرموو هەر قسەیەکت هەیە بیڵێ ، شتی وەك چی؟

ئەختێ خۆی هێناو برد، هەڵیدایێ: ماوەیەکە هەست دەکەم کەسێکی غەریب و غەوارە بەماڵتان فێربووە بەتایبەت ئەو دەمانەی تۆ لەماڵ نی.

خورپەیەکم بەدڵ داهات، موچڕکەیەکم بەلەش داگەڕا، بە حیرسەوە لێمپرسی: چۆۆۆۆۆۆن؟

وتی: من لە پەرۆشیم بۆ تۆ کە کەسێکی بەڕێزی بۆیە وەك جیرانێکی باش هەر ئەوەندە دەڵێم، چاودێری ژنەکەت بکە بزانە چۆن هەڵدەستێ و دادەنیشێ؟ خەریکی چیە و چی دەکات ؟

هیچ قسەیەکم بۆ وتن نەبوو ، سوپاسیم کرد کە لەخەوێکی غەفڵەت ئاگادار کردمەوە

*خواحافیز.

-خوات لەگەڵ.

بەری دڵم گیرا، بەبێ خولق و خۆ چوومەوە ماڵ، خۆم لەگووره نەبرد بچم بەگژیا و لێیبدەم، پاشان ڕەوانەی ماڵی بابی بکەمەوە و تەلاقی بدەم. خۆم گوڕی، لە ژوورەوە ئەو دۆشەکەی ڕاخرا بوو، داهاتمەوە لەسەری ڕاکشام، کەوتمە داڵغەلێدان، لەدەروونەوە بەخۆمم وت: تاوەکو ئەچمە بنج و بنەوانی ئەو قسانە و لە ڕەگ و ریشەوە ڕاستی شتەکان هەڵنەکێشم، بڕیار نادەم.

جار جاریش لەبەر خۆمەوە دەموت: نا، نەخێر ئەو ئیشە لەشان و شەوکەتی ئەو ژنە

---

[٨٢] – جومعان: ، هەینی، جومعە.

ناوەشێتەوە لەبەر هیچنا لەبەر ئەوەی نوێژ دەکات، بە ڕۆژوو دەبێت و لەخوا ترسە، تۆ بڵێی ناپاکیم دەرهەق بکا؟

هەر خۆم وەڵامی خۆمم دەدایەوە: ئەی نالێن مرۆڤ شیری خاوی خواردووە، کەواتە بەبێ بەڵگە یەك شەقاو ناهاوم و لەو ڕوانگەوە هیچ نامەقولیەك ناکەم دوو ڕۆژیتر پەشیمانی لەدوابێت.

قسەکان بەجۆرێ هەست و نەست و ویژدانی داگیر کردم، ڕۆژ بەڕۆژ گومانەکانم پەرەیان دەسەند و گەورە دەبوون کە لە نزیکەوە چاودێری بکەم بزانم ئەو کەسە کێ یە وا بەژنەکەم فێر بووە؟

ڕۆژێکیان تازە بەتازە لە قوتابخانەی (کوردستان) دەهاتمەوە، هەمان کابرام بینی لەدوورەوە بەهەلەداوان بانگی کردم و بەهەڵپەیەکەوە وتی: مامۆستا مامۆستا ئەرێ تۆ دەزانی؟

وتم: چی بزانم؟

وتی: من ماوەیەکی باشە چاودێری ئەو گەنجە دەکەم وەکو لەسەرەتاوە بۆم باس کردی، ئەو گەنجە ئێستا وا چووەتەماڵتان و هێشتا لەماڵتانە.

بەحیرسەوە وتم: چۆۆۆۆۆۆۆن؟

بزەیەکی نایە سەر لێو: چۆن و مۆنی پێ ناوێ وابزانم نزیکەی سەعاتێك زیاترە چووەتە ژوورەوە، هێشتا دەرنەچووە.

هەستم کرد دڵم دادەخورپێ و لە لێدان دەکەوێ، نازانم چۆن لەم ئان و ساتە (شوان) هاتە دەرەوە، کابراکە بەبینینی تیلە نیگایەکی بەپەلەی دامێ، وتی: سەیرکە سەیرکە ئەوە ئەو کابرایەیە کە من دەیڵێم.

شەهادەیەکی بەهەقم هێنا، هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا، وتم: تۆ دڵنیایی ئەو کەسەی بەماڵمان فێر بووە ئەو کەسەیە؟

وتی: لەسەدا هەزار دڵنیام، ئەوە ئەو کەسەیە کە دەیڵێم؟.

وتم: بۆ ئەوەی دڵئارام و ئاسوودەبی، ئەم کوڕە ناوی (شوان)ە،، شوان برای خێزانمە، ئەمساڵ لە کولیە وەرگیراوە و ناوە ناوە بەپێی دەرفەت دێتە ماڵمان.

کابرا ڕەنگێکی هێناو برد،چاوی زەق بۆوە: چیییییییییییییی؟

منیش لەدوورەوە بانگیم کرد: کاکە شوان، کاکە شوان.

شوان بەدەم زەردەخەنەیەکەوە بەرەو ڕوومان هات، تەعاروفم پێی کرد بۆ ئەوەی بزانێ

ئەو کەسە کوڕە خەزوورمە.

کابرا بەجۆرێ شڵەژا، هەستی بەشەرمەزارییەکی زۆر کرد، هەر زوو ڕوخسەتی خواست و تێی تەقاند، لەم ناوە نەما.

✍✍بەسەرهاتی دووەم:

## گومان ئاگری تووڕەیی خۆش دەات

🕮 مامۆستا خدر عومەر کۆیی گێڕایەوە، وتی:

✎ لەم شارەدا ( مەبەست لێی شاری کۆیە بوو) دوو گەنج پیاسەیان دەکرد، بەبەردەم کابرایەکی بەرپرس تێ دەپەڕن، یەك لەو دوو گەنجە لەناکاو تەماشایان دەکات و پێدەکەنێ.

کابرای بەرپرس وەکو لەخۆی بە گومانبێ، فەرمان بەپاسەوانەکانی دەوروبەری دەدات گەنجەکە بگرن و لە ژووری بکەن، ئەوجا لێدانێکی خاس لێی بدەن.

گەنجەکەیان بردەو لە ژووریان کرد، لێدە و لێدە، نیوە مردیان کرد. کاتێ کابرای بەرپرس هاتە لای، لێی پرسی: وەرە بزانم بۆ پێکەنی؟ چما ئێمە مەیموون و گاڵتەجاڕی تۆین؟

گەنجەکە سەیری کردن و دایەوە قاقای پێکەنین.

بەرپرسەکە هێندەی دیکە دەهری بوو، ڕووی گرژ کرد: دەی لێیدەن، شلکوتی بکەن، مارانکوژی بکەن بەحەیاتی خۆی پێی بەخواری دانەنێت.

گەنجەکە بەدەم هات و هاوارەوە پڕ بەگەرووی دەیقیژاند: ئاخر بۆ لێم دەدەن؟ چیم کردووە؟

پێیان وت: دەمت تێکنێ، بۆچی سەیری ئێمەت کرد و پێکەنی؟ ئێستاش هەر پێکەنیەوە؟

گەنجەکە نەختێ سەری بادا، کە لغاوی دەمی ترازاند: قوربان خوا لەسەر سەرە بەئێوە پێ نەکەنیوم، بڕۆن بانگی هاوڕێکەم بکەن بزانن بەچی پێکەنیم؟ هاوڕێکەم نوکتەیەکی خۆشی گێڕایەوە ئەگەر حەزدەکەن بۆتانی دەگێڕمەوە، نوکتەکەی ئەوەندە خۆش بوو خۆم بۆ نەگیرا کە لائیرادی ڕووم بەلاتان وەرگێڕا دامە قاقای پێکەنین، وەعد لەسەر دەستی ئێوە لەژیانما کام نوکتەی خۆشە هەیە و بۆمی بگێڕنەوە ئەگەر پێکەنینیشم هات، پێنەکەنم.

* * *



باوکی ڕەحمەتیم هەمیشە دەیوت: کوڕم شاخەوان ئەگەر کابرایێ لە کەسێ بەگومان بوو، ئەو کەسە جگەرەی بەدەمەوە بوو، جگەرەکەی تەواوکرد، کوژاندیەوە و قونچکەکەی لەبەردەم فڕێ دا کە دەبێ فڕێی بدات، کابرا چونکە لێی بەگومانە لەبەر خۆیەوە دەڵێت: ئەو جگەرەی بێ هۆ فڕێ نەداوە، بۆچی کە گەیشتە ڕاست من ئەو جگەرەی فڕێ دا؟

✍✍✍بەسەرهاتی سێ یەم:

## گومان هۆکاری خۆسووتانە

📖 پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( جاری وا هەیە بەندە قسەی ئەوتۆ دەکات کە بیر لە سەرەنجامەکەی ناکاتەوە، خوا بەهۆی ئەو قسەوە فڕێی دەداتە ناو ئاگرەوە(قووڵایی) دوورتر لەنێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا)[٨٣]

✎ سەرەتای هەشتاکان بوو، لە یەك لەگوندەکانی (دەشتی کۆیە) پیاوێك هەبوو دوای ململانێیەکی سەخت و دژوار لەگەڵ ئەو نەخۆشیەی تووشی ببوو، وەفاتی کرد، خەڵکی ئاوایی کۆبوونەوە، دوای شۆرین و کفن و نوێژکردن لەسەری، بردیانە قەبران.

پێش شاردنەوە و لەگۆڕنانی تەرمەکەی، ژنەکەی لەسەر قەبران بەدەم گریان و فیغان و ڕۆڕۆ و پرچ ڕنینەوە و لەخۆدان و سینگ کوتانەوە، پڕتاو کە تەماشایەکی ئەو حەشاماتەی ئەوێ دەکات. پیاوێکی بەتەمەن لەخانەی گومانەوە ڕووی تێکرد، وتی: چاو چاو، بزانە هیچ شەرم و حەیای بەخۆی نیە، هێشتا تەرمی پیاوەکەیمان تەقەت نەکردووە، چاو دەگێڕێ پیاوێکی تر بۆ خۆی بدۆزێتەوە.

ژنەکە هیچ نیەتێکی لەو سەرهەڵبڕین و سەیرکردنە نەبوو، قسەی کابرای لە دڵ گرت، کە گەڕایەوە ماڵ، چووە گەرماو و دەرگای لەسەر خۆی شیش دا، دەبەیەك

[٨٣] - عن ابي هريرة(رضي الله عنه): ان رسول الله (ﷺ) قال: ( ان العبد ليتكلم بالكلمة مايتبين ما فيها، يهوي بها في النار ابعد ما بين المشرق و المغرب).( بخاري/ الرقاق/ ٦١١٢).

ئەوتی بەسەر خۆی داکرد، بەدەنکە شقارتەیەك كۆتايی بەژيانی خۆی هێنا و خۆی سووتاند.

پێش ئەوەی بمرێ باسی ئەو گومانەی کابرا بەتەمەنەی بۆ کەس و کاری گێڕایەوە، کە بەوای ئەوەوە ئاگری لەخۆی بەرداوە.

*   *   *

✍ لەوەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ:

🕮یەکەم: لە سۆنگەی ئیسلامەوە زۆربەی زانایان رایان وایە بە بەڵگەی فەرمودەی دروست رێگری کراوە ئافرەتان ئامادەی ناشتنی مردووبن.

🕮دووەم: قسە کاریگەری زۆری هەیە بۆیە دەبێت مرۆڤ زۆر وریای ئەو وشانەبێت کە لەدەمی دێنەدەر، چونکە ئەم سەرنجامە خراپە بەهۆکاری وشەیەکەوە بووە.

🕮سێیەم: حەرامە مرۆڤ خۆی بسوتێنێ بەهەر هۆکارێك بێت، سۆزی خوا زۆرەو دەرگای ژیان زۆرن نابێت بێ ئومێدبی لەسۆزی خوا چونکە ئارامبگری خوای گەورە دەرگای خێرت لێ دەکاتەوەو دڵ و سینەت گوشاد دەکات، ئەمما ئارامنەگری دەستی دەچێتە شتێ کە ژیانی خۆی لە دونیاو دوارۆژ دەدۆڕێنێ.

*   *   *

## ✍✍✍✍✍بەسەرهاتی چوارەم:

## گومان دەبێتە هۆی کوشتنی مرۆڤەکان[٨٤]

---

[٨٤] – کارزان هەورامی بۆی گێڕامەوە وتی: بەهۆی ڕووداوی هاتوچۆوە لەپێکدادانێ لەگەڵ سەیارەیەکی تەکسی، بێ ئەوەی سەرپێچیکاربم، لەو پێکدادانە زامداربووم و خاوەن تەکسیەکەی بەرامبەرم چونکە گیانی لەدەست دابوو، منیان گیرت و تەوقیف کرام، ماوەیەکم لە گرتووخانە بەسەر برد، چەند شتێکم بینی و بیست ئەقڵ قبوڵی ناکات:

✍یەکەم: دایکێك لەسەر جگەرە کێشان شکاتی لە کوڕەکەی کردبوو تا تەرکی جگەرە بکات و کوڕەکەی وازی لەجگەرەکێشان نەدەهێنا، دواجار هاتە دیدەنی وتی: هااااا، ئێستا وازت لەجگەرەکێشان هێناوە تا بەرت بدەم و بێیتەوە ماڵ؟ ئەویش پێی وت: تاوەکو من مابم واز لەجگەرە ناهێنم و ناشمەوێ چیتر لێرەت بینمەوە .

✍دووەم: مامۆستایەکی زانکۆ تەحەروشی سێکسی لەگەڵ منداڵێکی دە دوانزە ساڵەی خۆی کردبوو، ژنەکەی شکاتی لێ کردبوو، دەیانوت حاکم بڕیاری داوە هەشتا ساڵ سجن بکرێ لەکاتێکدا تەمەنی خۆی نزیکی پەنجا، شەست ساڵێك دەبوو.

لە شاری (کەرکوك) ژنێك هەبوو کابرایەکی کوتاڵفرۆشی کردبووە موشتەری خۆی، هەرچی جارێك بهاتایە، شتی بەقست یان بەپارەی کاش لەلا دەگێڕایەوە.

ڕۆژێکیان داوای جۆرە قوماشێکی لێ کرد نەیبوو، کوتاڵفرۆشەکە پێیوت: خوشکەکەم لەو ڕۆژانە کەی هاتمەوە، دەیهێنم و ئاگادارت دەکەمەوە.

کاتێك قوماشەکەی هێنا و هاتەوە ، چاوەڕوانی هاتنە دەرەوەی ژنەکەی دەکرد بێتە دەرەوە، بەڵام ژنەکە دەنگی نەبوو، ئەویش بەناچاری لەدەرگایماڵیانی دا، ئەوەندەی نەبرد منداڵێ هاتە دەرەوە.

لێی پرسی: دایکت لەماڵە؟

وەڵامی دایەوە: نەخێر چووەتە بازاڕ، کە هاتەوە بڵێم چی؟

پێیوت: بڵێ موشتەریەکە هاتبوو ئەوەی دەیویست ئەویشی لەگەڵ خۆی هێنا بوو.

کابراکە ئەوەندەی پێ نەچوو، بەسەیارەوە لەو کۆڵانە بۆ کۆڵانێکی دیکە ڕۆیی.

منداڵەکە چووەوە ژوورێ، کەباوکی لێی دەپرسێت: کچم ئەوە کێ بوو لەدەرگای دا؟

پێی دەڵێ: کابرایەك بوو پرسیاری دایکمی دەکرد، وتی: کەی هاتەوە پێی بڵێ موشتەریەکە هاتبوو، ئەوەی دەیویست ئەویشی لەگەڵ خۆی هێناوە.

ئەویش بەو قسانە ئاگری لەناوچەوان دەباری، بەخێرایی دەرگای حەوشەی کردەوە بەڵام هیچ پیاوێکی لەدەرەوە نەبینی ، چووەوە ژوورێ، کە ژنەکەی هاتەوە، بێ ئەوەی پرسیاری هیچی لێ بکات، تەنها ئەوەندەی وت: کێ حەددی هەیە خۆی لەبالأم بسوێ

---

سێ یەم: باوکێك کچەکەی خۆی خنکاندبوو، بەسەرهاتی ئەو کچەش ئەوەبوو شووی بە ئامۆزایەکی خۆی کردبوو، لەماڵەوە زۆر لەگەڵی خراپ بوون، سەرەڕای لێدان و سووکایەتی پێکردن، بەباوکیان وتبوو: وەرە کچەکەت ببەوە، کچەکەت بێ ئەخلاقە و زەلاممان لەسەری گرتووە.

باوکەکە بۆی گێڕاینەوە وتی: ئێستاش دیمەنی کچە خێر لەخۆ نەدیوەکەم لەپێش چاوە، چۆن بە گوریس خنکاندم، چۆن چاوەکانی زەق بۆوە، هاواری دەکرد و دەیوت: بابە گیان خوا ئاگادارە، بەژیانی خۆم بێ ئەخلاقیم نەکردووە، من بەکچێنی خۆم لەو شتانە پاراستووە ئیدی چۆن دوای شووکردن کارێکی وا دەکەم خەم و خەفەتتان بدەمێ و سەرتان شۆڕ بکەم؟

منیش بەو گومانە خراپانەی برا و برازاکەم کردیان، کچەکەم خنکاند، لەکاتێکدا بەحەیاتم یەك شتی خراپم لەو کچە نەبینیبوو، زۆر دڵتەنگ و خەفەتبارببووم کاتێك کچەکەمیان بۆ تەشریح برد و فەحسیان کرد جوابەکەی هاتەوە، وتیان: کچەکەت هەر کچ بووە و ئەو خوانەناسانە ئەو تۆمەتە گەورەیان بەدەمەوە هەڵبەستاوە، قەت موستەحیلە لەو برا و برازایەم خۆش نابم وەکو ئەو تۆمەتەیان خستە پاڵی و بەناهەق بەکوشتیان دا.

چما وات لێهات موشتەری بۆ خۆت بدۆزیەوە و خیانەتم لێ بکەی؟

یەکسەر دەمانچەی لێ ڕاکێشا، بەچەند فیشەکێك ساردی کردەوە.

دوای تێپەڕبوونی عەیامێ، ڕۆژێکیان کابرای کوتاڵفرۆش هاتەوە هەمان کۆڵان، کە منداڵی ژنەکە ئەوی بینی، خێرا خۆی گەیاندە لای باوکی، پێی وت: بابە بابە ئەو کابرایەی وتی: من موشتەری دایکتم، وا لەدەرەوە بەخۆو سەیارەوە لەو ساحەیە وەستاوە.

ئەویش ئەو هاتنەی بەدەرفەت زانی کەهەڵساوە، دڵواپەسی و نیگەرانی پێوە دیار بوو، هاتە دەرەوە تۆڵەی خۆی لێ بکاتەوە، کە سەیری کرد ئەوە کابرایەکی بەتەمەن زۆریش بەتەمەنە و هیچی بەبەرەوە نەماوە، لێی چووە پێش، بەتاسەوە لێیپرسی: ئەرێ تۆ موشتەری ژنەکەم بووی؟

وتی: بەڵێ، ماوەیەك پێش ئێستا داوای قوماشێکی کرد، بۆیم هێنا، هاتم لەدەرگامدا، منداڵەکەتان کردیەوە کە وتی: دایکم چووەتە بازاڕ، منیش پێموت: کەی هاتەوە پێی بڵێ موشتەریەکە هاتبوو ئەوەی دەیویست ئەویشی لەگەڵ خۆی هێناوە، بۆۆۆۆۆ، هیچ بووە؟

کابرا لەجێوە سارد بۆوە، ئەوجا لە گومانەکەی گەیشت کە بەناهەق چ تاوانێکی گەورەی بەرامبەر ژنە بێتاوانەکەی ئەنجامدا کە نەدەبوو بەگومانەوە قسەکان بخوێنێتەوە[85]

[85] - بەسەرهاتێکی کۆن هەیە دەگێڕنەوە ژنێك چووە لای کابرایەك وتی: پیاوەکەم بەتەمایە ژنم بەسەر بێنێ، چیبکەم بۆ ئەوەی ژنم بەسەر نەهێنێ و تەنها منی خۆش بوێت؟ کابراکە پێی وت: کەی خەوت، بڕۆ مووسێکی تیژ ببە و بەهێواشی دوو تاڵە موو لە سمێڵی بکەوە، ئەوجا بیخەرە ژێر زەویەوە ئیدی پشتی لێبکەوە بەبێ تۆ هیچ ناکات و چۆنت بوێ دەتوانی وەکو ئەڵقە لەدەستی بکەی.

ئەویش وتی: وادەکەم.

هەر دوای ئەوە، کابرا خۆی گەیاندە لای پیاوی ژنەکە و پێی وت: وەرە ئامۆژگارییەکت بکەم، ژنەکەت دەستی لەگەڵ پیاوی خەڵکی تێکەڵکردووە. ئەویش وتی: ئەمەت لەکوێ زانی؟ وتی: من لەخۆڕا قسە ناکەم، فەرموو کە چوویەوە ماڵ دوای هەر شتێ خۆت بخەرە خەوەوە، من بەو گوێیانی خۆم گوێم لێبوو ژنەکەت قسەی بۆ دۆستەکەی دەکرد کە دوای کوشتنت بیخوازێ، ئەویش پێی وت کە دوای خەوتنی تۆ، ژنەکەت بەهێواشی مووسێکی تیژ بێنێ و لە قوڕقوڕاگەت گیر بکات و بتکوژێ.

کابرا وتی: ئاخر من ژنی خۆم خۆش دەوێ؟

ئەویش پێی وت: ئاخر ئەو تۆی ناوێ، تاقیکردنەوە باشترین بەڵگەیە.

✍ لەوەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ:

۞یەکەم: وەکو پێشتر باسمانکرد، گومان و چاوەڕوانی نەکردن بۆ ڕوونبونەوەی شەتەکان وامان لێدەکات دەست بۆ شتانێ بەرین کە عەقڵ و شەرع لەگەڵی هەڵناکەن.

۞دووەم: کوشتنی بەناهەق تاوانێکە لەتاوانە گەورەکان و سزای بەئێشی بۆ دیارکراوە لەدوارۆژدا.

۞سێیەم: جوان هەزمنەکردن و جوان تێنەگەیشتن لە وتەو قسە سەرنجامێکی ئاوا شومی لێدەکەوێتەوە.

* * *

✍✍✍✍✍بەسەرهاتی پێنجەم:

**گومان خۆشەویستان لەبەرچاوی یەك ڕەش دەکات**

📖 برادەرێکم گێڕایەوە وتی:

✍ کچێکم خۆش دەویست سەنگین و ڕەوشت جوان بوو، چوومە خوازبێنی، هەموویان ڕازی بوون ، مارەم کرد، ما[٨٦] بیگوازمەوە، برادەرێکم کە بۆ من زۆر لەپێش بوو، وتی: براکەم ئاگادارت دەکەمەوە نەکەی ئەو کچە بێنی، تۆ پێت وایە ئەو کچە کچێکی شەریفبێ؟ حەزدەکەی بەناو بۆت دەژمێرم کێ و کێ چووەتە لای، تا ئێستا چەندین کەسی بەڕێ کردووە، برادەرێکم هەیە ناوی ناهێنم ڕەنگە تۆش بیناسی لەجێ ژوانێکدا لەکچێنی کەواندووە، ئەمەش بووە ڕێخۆشی تاوەکو منیش چەند جارێ دەستی خۆمی پێ گەرم بکەمەوە، جا کچێك ئەوە ڕەوشت و ئەخلاقیبێ تۆ چ دڵێکت پێی خۆشە؟ بە چ چاو و ڕوویەکە دەیهێنی؟ چۆن دەیکەیە هاوسەری ژیانت؟ من بەش بەحاڵی خۆم بەکراسی بەریەوە پێشکەشمی بکەن و بەبەلاشم بدەنێ نامەوێ، ئێستاش سەرەتایە تا کێشەکە قووڵ نەبۆتەوە دڵنیام کەس و کاری بەم وەزعە بزانن

---

کابرا چووەوە ماڵ، دوای نانخواردن و چا خواردنەوە، بە ژنەکەی وت: ئافرەت خەوم دێ.
لەجێوە ڕاکشا، ئەوەندەی پێ نەچوو بەئەنقەست دەستی کردە پرخە پرخ وەکو ئەوەی خەوتبێ.
ژنەکەشی بەو پرخەپرخە وایزانی نووستووە، بەهێواشی بەدەستی مووسەوە لێی چووە پێش، ویستی مووسەکە بەسمێڵی دابێنێ، کابرا لێی ڕاپەڕی، توند مووسەکەی لەدەست وەرگرت و کوشتی، کەس و کاری ژنەکەش کە بەمە دەزانن، ئەوانیش پەلاماری پیاوەکە دەدەن و دەیکوژنەوە، لەوەوە کێشەیەکی گەورە دەکەوێتە نێوان هەردوو بنەماڵە و چەندین کەسی بێتاوان لەم نێوەندە دەکوژرێ.

[٨٦] – ما: ئەوجا، ئەوەی مایەوە.

دەست لەخنخنۆکی[87] دەنێن و دەیخنکێنن، وەرە بەقسەم بکە من چاکەی تۆم دەوێ؛ بڕۆ بیانوویەکی لابەلا بدۆزەوە و تالۆقی[88] بدە.

منیش بەو قسانەی کردی، کچەم لەپێش چاو کەوت، سەرەڕای ئەوەمەسرەفە زۆرەی لێیم کردبوو، تەلاقمدا.

کەمتر لەمانگێك دوای ئەو تەلاقدانە، ئەو برادەرەم کە ئەو قسانەی بۆ کردم و وای لێکردم لەو زەواجە پەشیمان ببمەوە و دەسبەرداری ببم، تووەس خۆی تەماحی تێدابوو بۆیە ئەو تۆمەتانەی بۆ هۆنیبۆوە، دوای من دەچێتە پێش و داخوازی دەکات، هەر لەو ماوەیە دەیگوازێتەوە، کە ئەوەم لێی بینی، ئێستا و ئێستا قسەی لەگەڵ ناکەم و بۆم دەرکەوت گومانبردن و ئاژاوەگێڕی چ کارەساتێکی مەترسیدارە؟

✍ هەر ئەو برادەرەم گێڕایەوە وتی:

✎ دراوسێیەکمان هەبوو حەزی لەکچێك دەکرد، کچەکە ئەوی نەدەویست، کە زانی بەهیچ شتێ دەستەمۆ نابێت و نایەتە ڕایێ، کەوتە درۆ هەڵبەستن بۆی بەوەی لەگەڵ ئەو کچە ڕایبواردووە. کە ئەو قسەیان پێ دەگاتەوە ، بێ ئەوەی بچنە بنج و بنەوانی ئەو قسەیە: کێ کردی؟ بۆ کردی؟ کێ خەتابارە؟ کچەکە دەبەستنەوە، توند دەمی دەگرن تا نەقیژێنێت، ئەوجا دەیبەنە دەرەوەی شار، لەدەم ڕووبارێکی ئەو دەوروبەرە دەیخنکێنن و بەزێی دادەدەن.

*   *   *

✍✍✍✍✍✍✍✍ بەسەرهاتی شەشەم:

## گومان مرۆڤ دەکاتە دز!!

📖 مامۆستا (ئەبوبەکر شوان) وتی:

✎ پیاوێك گێڕایەوە وتی: لە گوندی پیرێژنێك هەبوو، بەتەمەن و بەساڵاچوو بوو خزمی خۆمانبوو، هەر جارەی ببینیایە دەمی دەجوولا و ورتەی دەهاتێ و منیش دەموت: بەخوای لەوانەیە بەتەمەنی کاری لێ کردبێت، تا ڕۆژێکیان لێم پرسی: پوورە ئایش بۆ دەبینم هەر لەبەر خۆوە قسە دەکەی؟

وتی: ڕۆڵە با بۆت بگێڕمەوە.

---

[87] - خنخنۆك: گەروو، قوڕگ، قنخنۆکە.

[88] - تالۆقی بدە: بەرەڵای بکە، تەلاقی بدە.

وتم: فەرموو

وتی: منداڵ بووم، لە گوندی یەكێكیان بەبووك دەبرد، منیش لەگەڵ بووك بووم تارایێكی سووری جوانیان هێنا، ماڵی بووكێ تا دەهات سیخناخە دەبوو لە خەڵك، هێندەی نەبرد وتیان: تارای بووكێنی دزراوە، كێ بردوویەتی؟ كەس نەبوو، تا یەكێ لە ژنان وتی: ئایش تۆ لێرە بووی دیارە تۆ بردووتە؟

منیش سوێندم بە قورئانێ خوارد كە من نەمبردووە.

منیان دایە بەر چەپەرۆكان، هاواری خوام كرد، لەناكاو قەلێك لە حەوشەكە قیژاندی، لەسەر درەختێ هەڵنیشت، تارا سوورەكەی بە قاچان گرتبوو فڕێی دایە حەوشەكە.

خەڵكەكە بەم دیمەنە تاسان و منیان ماچ كرد، بەڵگەی بێ تاوانی منی سەلماندن لەخۆشیانا شاگەشكە بووم و كە گەورە بووم، ئەو هۆنراوەم هۆنییەوە:

تارا بۆ من وەفایە

ئەوەی دەیڵێم ئەوهایە

ڕاستگۆیی و دەستپاكی

شوكرێكە لەلای خوایە

قەل سەلماندی بۆ هەمووان

منی هەژار بێ خەتایە

* * *

📖مامۆستا مەلا ئەمرۆ عەلی گێڕایەوە، وتی:-

✎ لە یەك لە گوندەكانی سنووری شارەدێی شۆڕش، فەقێیەك بەتەنیشت گوندێ گوزەر دەكات و تێنووی دەبێ. لا دەداتە یەك لەماڵەكانی سەرەڕێی و لەدەرگایان دەدات، دەرگای لێ دەكەنەوە، بەئەدەبەوە داوای جامێ ئاو دەكات كە تەنها ژنێك لەو كاتەدا لەماڵەوە بوو، ژنەكە دەست و برد جامێ ئاوی بۆ دێنێ و فەقێیەكە دوای هەڵقوڕاندنی ئاوەكە، ماڵئاوایی دەكا و دەڕوات.

ئەوەندەی پێ نەچوو پیاوی ژنەكە گەڕایەوە ماڵ و داوای جەمەدانی كرد، ژنەكەی وتی: پیاوەكە من جەمەدانیەكەتم لەبەیانیەوە شووشتووە و لەسەر ئەو ڕستەم هەڵخست، سەرسام ماوم بۆ نەماوە؟ ئەمڕۆش بێجگە لەو فەقێیەی ئەو گوندەی

بەرەوەمان کە لایدایە ماڵمان و داوای ئاوی کرد، ئاوم دایێ و ئیدی ڕۆیشت، لەو بترازێ کەسی تر نەهاتۆتە بەر قاپی حەوشەمان.

ئەویش بە تووڕەییەوە چەند کەسێکی بەگەر خۆیدا، کەوتنە دوای فەقێ، کە گرتیان بێ ئەوەی هیچ قسەیەکی لەگەڵ بکەن، کەوتنە سەری، هێندەیان کوتا، نیوە مەرگیان کرد، کابراکە دەستی خستە قنخنۆکی بەقەستی خنکان: هەی ئاڵچاغ ئەوە ئەو جەمەدانیەت لەکوێ شاردۆتەوە، بەدنمەکی لەوە زیاتر چیە بچیە ماڵێك ئاویان بخۆیەوە، ئەوجا شتیان لێ بدزی؟.

دوای تێپەڕبوونی ماوەیێ بەسەر ئەو ڕووداوە، کاتێك ئەو پیاوە یەك لەمەڕەکانی دەکوژێتەوە، و چاکی دەکات، دەبینێ جەمەدانیەکەی لەناو زگی مەڕەکەیە کە ڕەنگە لەبرسان خواردبێتی. بەو دیمەنە زۆر دڵتەنگ دەبێت کە چ ناهەقیەکی بەرامبەر بەو فەقێیە کرد، بۆیە بەخۆ و چەند کەسێکەوە بە دەست و دیارییەوە دەچنە ئەو گوندەی دیکە و داوای لێبوردنی لێ دەکەن.

ئەویش بەلێبووردەیی خۆی، گەردنی ئازاد کردن.

* * *

📖 هەر مامۆستا مەلا ئەهرۆ گێڕایەوە وتی:: لەیەك لەگوندەکانی سەرەوە، کابرایەك بەمەبەستی سەردانیکردن لەشارەوە دەچێتە ئەو گوندە و لەلای مەلای گوندی دەمێنێتەوە کە ناسیارێکی خۆیان بووە، ڕێزێکی بێ پایانیی لێ دەنێ، پێش نیوەڕۆ مەلا دەنگدەدات و دەڵێ : مەلاژن ئەم نیوەڕۆیە میوانێکی خۆشەویستم هاتووە مریشکێکمان بۆ سەر ببڕە.

مەلا ژن لەپشتەوە وەك ئەوەی دەست بەکوشتنەوەی مریشکێك بکات، دەڵێ: ئەوە یەك..مەلا قسە ناکات، مەلاژن دەڵێ: ئەوە دوو..مەلا قسە ناکات، مەلاژن دەڵێ: ئەوە سێ. دیسان مەلا قسە ناکات، مەلاژن دەڵێ: ئەوە چوار تا شەش دەژمێرێ.

کابرای میوان وا تێگەیشت مەلاژن دەیەوێ پێی ڕابوێ، تێناگات مەبەستی لەو قسانە ئەوەبوو کە بە مەلا دەڵێ: ئەوە یەك، ئەگەر بیوتبایە باشە، ڕادەوەستا. کە وتی: دوو. مەلا هەر قسەی نەکرد، مانای ئەوەیە هێشتا مریشکی تر سەرببڕێت، بۆیە هەتا شەشی ژمارد، ئەویش بەهێواشی وتی: ئەوە یەك درۆ..دوو درۆ..سێ درۆ..چوار درۆ..پێنج درۆ ..شەش درۆ.

مەلا بەم قسانە لەجێوە هەستاو بەتووڕەییەوە وتی: چما گومانت لەو قسانەی مەلاژن هەیە؟

کابرای میوان وتی: فەرموو ئەگەر ڕاست دەکا با گۆلکێکم بۆ بکوژێتەوە.

مەلا وتی: مەلاژن دەی هەر ئێستا گۆلکێکمان بۆ بکوژەوە.

ئەوەندەی نەبرد مەلاژن گۆلکەکەی کوشتەوە، کاتێك مەلا و کابرای میوان هەستان بچن گۆلکەکە چاك بکەن، کە چوونە حەوشەی پشتەوە، کابرای میوان واقی وڕما بینی مەلاژن درۆ ناکات لەولاوە شەش مریشکی سەربڕیوە و گۆلکەکەیشی کوشتووەتەوە، هەستی بەشەرمەزارییەکی زۆر کرد.

کابرا نانی نیوەڕۆی لەوێ خوارد، ویستی هەستێ و بگەڕێتەوە، مەلا لەڕقان سوێندێکی گەورەی لێ خوارد هەتا هەموو ئەو گۆشتەی لەلادا نەخوات نەهێڵێ بڕواتەوە.

کابرای میوان کە بۆ تاقێك و شەوێ هاتبوو هەتا شەش حەوت ڕۆژ مایەوە کە هەتا هەموو گۆشتەکەی نەخوارد، لێی نەگەڕا بگەڕێتەوە.

* * *

سەرنج بدە....

ئایا بیرت لەوە کردۆتەوە و دەزانی ئەو فڕۆکانەی بۆ فڕین هەلدەستن پێویستییان بەهێزێکی پاڵپێوەنان هەیە؟ لەو ڕوانگەوە بەپێی ئەو یاسایە ئەگەر هێزی پاڵپێوەنان بەقەد چرکەیەك تێکبچێ، یەکسەر فڕۆکەکە بەردەبێتەوە.

ئەوە یاسایەکە بۆ فڕینی فڕۆکەیەکی بچووك، ئاخۆ بۆ ڕاگرتنی گەورەیی ئاسمان و ئەوەی تێیدایە، چ هێزێکی بێ وێنە ڕایگرتووە نەکەوێ؟ خوای پەروەردگار ئەو حەقیقەتەمان پێ دەلێ ویستی خۆی لەسەرە کە ئاسمانی ڕاگرتووە بۆ ئەوەی بەسەر زەوی نەکەوێ وەك دەفەرموێ: ﴿وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ أَن تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ﴾الحج: ٦٥

ئەوەش نیشانەی ئەوەیە هێزێکی گەورە ڕایگرتووە و هەردەمایەك ئەو هێزە نەما، ئەوە ئەوەی لەئاسماندایە بەردەبێتەوە، بۆیە بەرنەبوونەوەی ئاسمان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوای پەروەردگار زیندووە و هەرگیز نامرێ..نموونەی ئەو فڕۆکانەی هەیە شتێکی سەرسوڕهێنەرنیە بەقەد فڕینی باڵندە کە بەپێی یاسایەك خوای پەروەردگار ڕێنموونی کردوون بۆ ماوەیەکی زۆر بەبێ هیچ خەلەلێك لەئاسمان بفڕن و بمێننەوە. لێرەدا باڵندە نیشانەیەکی دیکەی ئەو هێزە مەزنەیە، فەرموو لەدروستکردنیدا ئەگەر باڵندە پەڕوپۆ و باڵی نەبووایە، نەیدەتوانی بەرگەی گەرما و سەرما و فڕین بگرێ، لەوەشدا هەر زوو لەناو دەچوو، بەلەناوچوونی باڵندە، کرم و مێروومەکانی ژێر زەوی‌یە لەدەنووکی هاوسەنگی باڵندە قوتاری دەبوو، زیادیان دەکرد و ڕەگی هەرچی گژوگیا هەیە دەیانخوارد و وشکیان دەکرد، بەمەیش ئەوەی ئاژەڵ و حەیوانە خواردنی چنگ نەدەکەوت و دەمرد، کە مرۆڤیش گۆشت و گژوگیا (ڕووەك) هیچی نەبوو بیخوات، ئەوە ئەویش لەماوەیەکی زۆر کەمدا دەمرد. (بیر بکەوە لەدروستکراوەکانی خوای پەروەردگار کە هیچی بێحیکمەت دروست نەکردووە).[]

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

﴿ لَا جَرَمَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْتَكْبِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾ النحل: ٢٣

## سەرکردە[٨٩]

ئەو سەرکردەم لەپێش چاوە
تا دوێنێکە،سەیری دەکرد
لەناخەوە، کوژاوە
دڵبرین و داماوە
زەلیل، کەسێکی سوتاو
بەجل و بەرگی دڕاو
کە خۆی ئەوها دەبینی
هەمووانی دەخستە سەرچاو
* * *
ئێستا لووت بەرز ، ڕوح زل
کەس نەناس، لەخۆبایی،
بە ورگێکی پڕ و زل
کاتێ هەڵدەستێتە سەرپێ
هاوار دەکا و هەڵدەچێ.
بێ شەرم، بەرگی شەرم دادەکەنێ
کام خەون سەوزە دەینێتە ژێر پێ و
بەئەقڵی هەمووان تێر پێ دەکەنێ
* * *

[٨] – شیعری: شاخەوان عەلی–وەفایەك بۆ تۆ.

دز هەر دز بوو، دوو ڕوو
چاو هەر چاو بوو، بێ چاو و ڕوو
بێ باکانە دژ بەدوێنێ
تف بۆ ڕابردووی دەنێرێ،
هیچ نابینێ
هەموو شت بۆ ئەمڕۆ،
لەچاوی پارە و کورسی دەبینێ
* * *

ئەوە دوێنێیە بەئەمڕۆی گەیاند
کردیە دەمڕاست و
بردی پێیگەیاند
ڕەش و ڕووتەکان من و تۆین
لەسەر تەختی شانۆ دەڕۆین
ئەوەی حیسابی پاکە
لەداهاتووی بێ باکە
مەرد، فوو لەچرای ڕابردووەی ناکا
دەزانێ داهاتوو دەیهاڕێ،
ڕووی ڕەش دەبێ و
مێژوو ڕوحمی پێ ناکا
* * *

(ابو هريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ( تەماشای لەخۆتان خوارتر بکەن، تەماشای لەخۆتان ژوورتر مەکەن، ئەوە باشترە بۆ ئەوەی ناز و نیعمەتی خوا بەسەرتانەوە بەکەم تەماشا نەکەن)[٩٠]

[٩٠] – عن ابی هريره(ﷺ) قال: قال رسول الله(ﷺ): (انظروا الى من اسفل منكم، ولا تنظروا الى من هو فوقكم، فهو اجدر ان لا تزدروا نعمة الله– قال ابو معاوية– عليكم).( بخاري/ الرقاق/٦١٢٥).

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: خوای گەورە لەهەموو بەرپرس( مەسئوولێك) دەپرسێتەوە دەربارەی ئەو کەسانەی کە لەژێر باڵی ئەودان کە ئایا هەق و مافی ئەو کەسانەی داوە و پاراستووە یان فەوتاندوویەتی، خوای گەورەش لەپیاو دەپرسێتەوە لەبارەی خێزانەکەی[91]

لەسەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز[92]، پیاوێکی جوولەکە خانوویەکی بەسەر مزگەوتێکەوە هەبوو، والی ئەو شارە داوای لێ دەکات خانووەکەی پێ بفرۆشێ تا مزگەوتەکەی پێ گەورە بکات، بەڵام کابراکە ڕازی نابێت، پێی دەڵێ: خانوو خانووی خۆمە و نایفرۆشم.

والی بەزۆر خانووەکەی لێ زەوت دەکات و ئەویش بۆ سکاڵاکردن دەچێتە لای

---

[91] - قال (ﷺ )(ان الله تعالى سائل كل راع عما استرعاه احفظ ذلك ام ضيع حتى يسأل الرجل عن اهل بيته) رواه نسائي و غيره

[92] - ئەگەر عەدالەت ئاور داتەوە

گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو دەخواتەوە.

دەگێڕنەوە لە سەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز (ڕەزای خوای لێبێ) (٦١ك -١٠١ك) دادپەروەری بەجۆرێ باڵی کێشابوو، هەژارەکان خێر و سەدەقەیان وەر نەدەگرت و دەوڵەمەندەکان کەسیان بەدەست نەدەکەوت کە زەکاتیان بدەنێ، کەچی دوای وەفاتی عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەرازووەکە بەتەواوی لاسەنگ بوو، دەوڵەمەندەکان هێندەی دیکە دەوڵەمەند بوون و هەژارەکانیش ئەوەندەی تر هەژار بوون، چونکە سامان و داهاتی ئەو خەڵکە لەشوێنی شیاوی خۆی دانەدەندرا و بۆ شتێ خەرج دەکرا کە لەشەرعی خوادا نەبووە.

لەنموونەی سەرکردەی خوداپەرست و دنیانەویستدا، لەیەکەم وتاریدا دوای دانرانی بەجێنشین لەسەر دوانگە گوتی:

* ( خەڵکینە من ئەرکێکم بەسەردا دراوە کە پرسم پێنەکراوە، داواشم نەکردووە و بەڕاوێژکردنیش وەرمنەگرتووە، بۆیە ئێوە هیچ ناچارنین بەپابەندبوون بەجێنشینی من و سەرپشکن بۆ هەڵبژاردنی کەسێکی دیکە)

خەڵکەکە بەیەك دەنگ هاواریان کرد: ئێمە تۆمان قبوڵە و بەپێشەوای خۆمانت دەزانین، پشت بەخوا ببەستە و لەگەڵتاین. بۆیە دەستی کرد بەدانانی پلانی کارگێڕی بۆ کۆمەڵی موسڵمانان و پێشەواتییان، چونکە زانی کە دەبێت ئەو ئەرکە بەجێبهێنێت و گوتی:

* (دوای سوپاسی خودا، بزانن پێغەمبەرێکی دیکە، پەرتووکێکی دیکە لەئاسمانەوە نایەت، حەڵاڵ تا ڕۆژی دوایی هەر حەڵاڵە و بڕیاری خودا نەگۆڕە، من بڕیاردەر و دادوەرنیم بەڵکو جێبەجێکارم، هەروەها داهێنەر نیم بەڵکو شوێنکەوتووم گوێڕایەڵی هیچ کەسێك لەسەرپێچی فەرمانی خودادا ناکرێت، منیش چاکترینی ئێوەنیم بەڵکو کەسێکم وەك هەر یەکێکتان، تەنها ئەوەیە بارێکی قورس لەسەر شانمە کە بەرپرسییە).

خەلیفە عومەر دەبینێ ئەوە خەریکی تیمارکردن و پێچانی قاچی حوشترێکە و لەبەر خۆیەوە دەڵێت:هەر حوشترێك لەدیجلە و فورات زیانی پێ بگات من لەبەرامبەریدا بەرپرسیارم[٩٣]

کابرای جوولەکە لەبەر خۆیەوە دەڵێت: وەی وەی ئەوە چ ئەمیرێکە؟ ئەوە چۆن دەتوانێ داوای من بەجێ بێنێ.ڕووی وەردەگەڕێ ڕێ و ڕێ بگەڕێتەوە، خەلیفە عومەر کە دەیبینێ بانگی دەکات، ئەوجا پێی دەڵێ: ئەوە بۆ هاتی و بۆ گەڕایتەوە؟

کابراکە حارومەسەلەی خۆی بۆی دەگێڕێتەوە کە خانوویەکی هەیە و لەتەك مزگەوتە و والی شارەکەیان بەزۆر خانووەکەی لێ زەفت کردووە دەیەوێ مزگەوتەکەی پێ گەورە بکات و منیش ئەگەر بەخۆشیبێ خانووی خۆم نافرۆشم و سەرەنجام خانووەکەی بەزۆر لێ سەندم.

ئیمامی عومەر زۆر دڵتەنگ دەبێت و لەجێوە کە ئێسقانێکی بەدی کرد، بەخەڵووز[٩٤] خەتێکی ڕەشی بەسەر دادێنێت و دەیداتە کابرای جوولەکە و پێی دەڵێ: فەرموو ئەوە ببە و بیدەرە دەست والی و هەقت بەسەر هیچەوە نەبێت ئیشەللا موڵکەکەت بۆ دەگەڕێنێتەوە.

ئەویش ئێسقانەکەی بۆ دەبات، والی یەکسەر لەوە تێ دەگات کە ئەوەی کردوویەتی زوڵمە و ئەوەی ئیمامی عومەر بۆی ناردووە ئاماژەیەکە پێی دەڵێ ئەگەر زوڵم لەو کابرایە بکەی و مافەکەی بۆ نەگەڕێنیەوە ئەوە ئێسقانت دەشکێنم و دەتکوژم، بۆیە بەداوای لێبوردنەوە خانووەکەی بۆ دەگێڕێنێتەوە و پێی دەڵێ: دڵت ئاسوودەبێ کەس بۆی نیە خانووەکەت لێ داگیر بکات و زوڵمت لێ بکات.

✍ **بەسەرهاتی یەکەم:**

**بەرپرس دەبێ ئاوابێ...**

✍ لەدوای ڕۆژێکی سوتێنەر وماندووکەر و سەخت تاریکی باڵی بەسەر شاردا کێشا، هەموو گیاندارانن هەموو کارکەران و ڕەنجدەرانی ڕۆژ بۆ حەوانەوە ڕوویان لە لانەکانیان کرد بەڵام هێشتا هەندێ لەبەر ئازاری گیان و هێندێکیش لەترسی ئازاری

---

[٩٣] – وەحیدالدین خان دەڵێ: ئەگەر تێنوێتی بۆ ئاو بەڵگەبێ لەسەر بوونی ئاو، هەروەها تێنوێتی بۆ دادپەروەری ئەبێ بەڵگەبێ لەسەر بوونی دادپەروەری، جا لەبەر ئەوەی دادپەروەری نییە، ئەوە بەڵگەیە لەسەر بوونی جیهانی دوایی شوێنی دادپەروەری ڕاستەقینە.

[٩٤] – خەڵووز: ڕەژوو.

دواڕۆژ بەئاگان و خەو ناتوانێ بەزەوییاندا بدات. بەڵام ئەوەی دڵ دەلەرزێنێ ئەمشەو دەنگی گریان و فوغانی چەند منداڵێکی ژێر دەوارێکی ڕەشە.

بەکۆڵانانـدا دەگـەڕا زۆری نـەبرد گەیشـتە نزیـك دەوارەکـە.. گریـانی ناوەختەکـەی منداڵـەکان سـەرنجی ڕاکێشـا کـەمێ مـات بـوو، هەسـتی ڕاگـرت، نـا بێـدەنگ نـەبوون. لەلایەکی دەوارەکەوە مەنجەڵێ لەسەر ئاگرە لەبەر دووکەڵ بەئاسانی بەرچاو ناکەوێ.. ژنێکی بەئارام لەپشت سەری منداڵەکانەوە خەریکی بێدەنگ کردنیانە: بەسبێ کوڕم، بەسە کچم هێندەی نەماوە ئامادە دەبێ.

لێیان چووە پێشەوە سەلامی لێ کردن: خوشکم ئەوە بۆچی منداڵەکانت دەگرین؟

* لەبرسانا.

– ئەی ئەوە چیە لەسەر ئاگرەکە؟ بۆچی نانیان نادەیتێ؟

*ئـەوە تـەنها ئـاوە دەمـەوێ بەچـاوەڕوانی خـەو بەلایانـدا بەرێتـەوە، هیچـمان نیـە بیانـدەمێ، خـوا سـزای ئـەو برسـێتیەمان لـە خەلیفـەی موسـڵمانان وەرگـرێ وەك یارمەتیمان نادات.

– خوشکێ کێ دەڵێ خەلیفە ئاگای لە حاڵتانە؟

*ئەی ئەگەر ناتوانێ ئاگای لەحاڵی موسڵمانانبێ بۆ دەبێتە خەلیفە.

دەمی بووە تەڵەی تەقیو، فرمێسکەکانی حازربوون بۆ چۆڕانەوە، هیچی نـەگوت، بە پەلە وەك لـەدەمی گـورگ بـەربووبێ بـەڕاکردن گەڕایـەوە، یارمەتیدەرەکەی بەدوایـدا تـا گەیشتە ماڵەوە، دڵی دەکولا، هەر دووبارەی دەکـردەوە و لەمێشـکیدا لێکـی دەدایـەوە( کە ناتوانێ ئاگای لـە حـاڵی موسـڵمانان بـێ بـۆ دەبێتـە خەلیفـە) کۆڵێکـی ئامـادە کـرد، ئارد، خورما، خواردەمەنی دای بەکۆڵیدا، یارمەتیدەرەکەی شـەرمی دەکرد گەورەکـەی ئەو کۆڵەی بە کۆڵەوەیە: گەورەم بهێڵە من هەڵی بگرم.

–نا..نا.. کەس گوناهی کەس هەڵناگرێ، ئەمە گوناهی منە، ئەوە کۆڵی منە.

فرمێسکەکانی دەچۆڕایەوە، بەهەڵەداوان بـەرەو دەوارەکە گەیشتە لایـان، بـەخێرایی دەستی کـردە خۆشـکردنی ئاگرەکـە و ئامـادەکردنی خـواردن، دووکـەڵ بەبـەینی ڕیشـە سپیەکەیدا هاتووچۆی دەکرد..دایکی منداڵـەکان واقـی وڕمـابوو نەیـدەزانی چـی بـووە، ئەم پیـاوە پـیرە بۆچـی وا بەپـەرۆشـە، پیرەمێـردیش دڵـی دەکـولا، فرمێسـکەکانی وشـك نـەدەبوون..خواردن ئامـادە بـوو، منـداڵانی لـەخۆی کـۆکردەوە، یەکەیەکـە لەباوەشـی دەکردن و خواردنی دەکرد بـەدەمیانەوە، منــداڵان تێربوون، دەستیانکردە پێکەنین و

یاریکردن.

ئاهێکی هاتەوە بەر، دڵی خۆش بوو، پێکەنینی منداڵان فرمێسکەکانی وشك کرد. دایکی منداڵان کە ئەویش ڕووی زەردەخەنەی لێ دەباری، لەپیرەمێردەکە چووە پێشەوە و بەسەرسوڕمانەوە لێی پرسی: توخوا پێم نالێی تۆ کێی وا بۆمان بەپەرۆشی خوا لێت ڕازی بێت؟

- ئەو تاوانبارەم کە منداڵەکانتم برسی کرد، ئەو تاوانبارەم کە خەوی ئەو شەوەم لێ تێکدان لەبرسانا.

دیسان فرمێسکەکانی بۆ ڕانەگیرا و بەسەر ڕوو و ڕیشە سپیەکەیدا چۆڕایەوە: من عومەری کوڕی خەتابم.

* تۆ ئیمامی عومەری؟ تۆ خەلیفەی موسڵمانانی؟

- بەڵێ.

* شەرمەزار خۆمان ئەی خەلیفەی پێغەمبەر لێمان ببوورە؟

- نا، ئێوە لەمن ببوورن ئاگاداری حاڵتان نەبووم.

خواحافیزی لێکردن، بەلام هەر دڵی دەکولا، هەر لێکی دەدایەوە و دەیوتەوە: کە ناتوانێ ئاگای لە حاڵی موسڵمانان بێ بۆ دەبێتە خەلیفە؟[95]

✍✍ بەسەرهاتی دووەم:

## موسڵمان بارێك نانێتە شانی ئەگەر پێی هەڵنەگیرێ

✎ کابرایەك دەچێتە لای گەورە دەسەلاتدرێك و داوای لێ دەکات بۆ هەندێ کاری تایبەت بە نهێنی لەگەڵی دانیشێ، کابرای دەسەلاتدار پێی دەڵێ: ئەگەر هاتووی بەشان و باڵم هەڵدەیت و ستایشم بکەی ئەوە خۆم باش خۆم دەناسم و پێویستیم پێی نیە، خۆ ئەگەر هاتووی بوختان بەدەمی خەڵکەوە بکەیت ئەوە جوان دەچمە بنج و بنەوانیەوە و لێتی قبوڵ ناکەم، خۆ ئەگەر درۆیەکی هەڵبەستراو بێت ئەوە لەوەشدا گوێ بەو قسانە نادەم. کابرا بەو قسانە حەپەسا، وتی: مادام وایە ڕێ بدەن من لەخزمەتان مورەخس دەبم.

ئێوارەیەکیان من و چەند مامۆستایەك داوەتی کابرایەکی خانەدانی ئەم شارە بووین، کابرا ڕێزێکی زۆر گرتین و داوەتێکی وای کردین بەگێڕانەوە باس ناکرێ،

---

[95] - تاوانی گەورە پیاوان - هیوا سیوەیلی-گ: هەڵەبجە -ژ: ٢٠-٢١

کەسێکی خواپێداو و خواناس ، بەرێزەوە زمانی گۆی دەکرد، ئەوەندەی هەستم لێی ڕاگرت وشەیەکی ناشیرینی لەدەم دەرنەپەڕی، بەئینسافەوە قسەی دەکرد.

یەك لەو مامۆستایانە پێی وت: خۆزگە ئەم شارە چەند کەسێکی وەکو تۆی تێدا دەبوو، قەت ڕۆژمان بەو ڕۆژە نەدەگەیشت، باشە چۆنە ئەم لایەنانە ناهاتوونەتە ماڵت و ڕوویان لێ نەناوی پۆستێکت پێ بدەن؟

بەدەم زەردەخەنەیەکی گەشەوە وتی: لەخوای بەزیادبێ لەهیچم کەم نیە، ئەوەی دڵ دەیخوازێ هەمە، ڕۆژێکیان کەسێکی خەواس و شارەزا، بەرپرسێکی بەرزی مەکتەبی سیاسی یەك لەوحزبانە بووە میوانم ، ماوەیەکی باش پێکەوە دانیشتین، بەیەکەوە لەدەرگای زۆر باس و خواستمان دا، نازانم لەسەرەوە ڕایانسپاردبوو یان تەنها پێشنیاری خۆی بوو، وتی: هاتووم ئەگەر ببیە لایەنگر و پشتگیریمان بکەی نیەتمان وایە بتکەینە قایمقامی ئەم شارە و ئەو قایمقامە لادەبەین یان دەیگوازینەوە بۆ شوێنێکی تر.

منیش یەکسەر وتە جوانەکانی پێغەمبەرم هاتەوە یاد کە دەفەرموێ:(كلكم راع و كلكم مسؤل عن رعيته) (رواه بخاري و مسلم)

واتە: هەمووتان بەرپرسیارن و لێتان دەپرسرێتەوە دەربارەی ئەو کەسانەی کە لەژێر باڵی ئێوەدان.

پێموت: سوپاسی ئەو هەستە جوانەت دەکەم بەلاّم ئیشێ بەمن نەکرێ نەیکەم باشە، دوای ئەوە ناخۆشترین شت ئەوەیە لەسەر حیسابی کەسی تر پۆست وەربگری.

بە پێکەنینەوە وتی: قسەیەك بکەم ڕەنگە باوەڕ نەکەی، خەڵکی وامان هەیە دەرگا نەماوە لێی نەدات تەنها پلەیەکی بەسیتی بدەینێ، خوا لەسەر سەرە خەڵکانێك هەن ئامادەن ژنی خۆیان بە.....بدەن بەس ئەوەندە لەدایەرەیەك بەرپرسێتیەکیان بدەینێ و هەیە گەوادی دەکات تەنها شتێکی دەستکەوێ و خوانەخواستە ئەو قسانەم بەهیچ مەبەستێك نیە وبەخراپی لێکی مەدەوە.مەسئولیەت چیە؟

وتم: مەسئولیەت خزمەتکردنە ئەوجا لەهەر شوێنێکبێ، من ئێستا لەهەر کاتێکی تر مورتاح و دڵخۆشم کە سەر بەهیچ حزبێك نیم و ڕێز لەهەموو لایەك دەگرم، بەلاّم واقعێك هەیە بۆ لەخۆمی تێك بدەم، ئەگەرببمە قایمقام نابێ شەویش بەئیسراحەت بنووم ئەوە چیە لەفلانە شوێن شەڕە، ئەو کێشەیە ڕوویدا، لەزەتی ژیان بۆ مرۆڤ سەلامەتی ئیمان و ئافرەت و سەروەت و سامانە شوکر بۆ خوا ژنێکی وای پێ

بەخشیوم جوان و ڕێك و پێك و بەڕێزە، لە موڵك و ماڵی دونیاشدا سەیارەو مەزرەعە و خانووی باشم هەیە، ئەگەر لەوە زیاتر داوا بکەم مەغرووری و لەخۆبایی بوونە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( خۆ بەکەم زانین بنوێنن هەتا هیچ کەس شانازی نەکات بەسەر ئەوی دیکەدا و کەسیش هەڵنەکوتێتە سەر کەسی دیکە) (اخرجە مسلم) لەو قسە و گۆڵمەزە و هەرایەدا، قەناعەتی بەو قسانە هات و تا هەستا و ڕۆیشت، چیتر نەچووەوە سەر ئەو بابەتە[٩٦]

*   *   *

[٩٦] – هەرگیز خۆت بەزیاد یان کەم مەزانە:
دەگێڕنەوە پیرەژنەکی چینی هەبوو، دوو گۆزەی ئاوی هەبوو، هەردوکیانی بەم سەر و ئەو سەری شەقرە دارێکەوە قایمکردبوو، ئینجا ئەم دارەی بەسەر هەردوو شانی خۆیدا دەدا، ڕۆژانە ئاوی لە کانیێکەوە بۆ ماڵی خۆیانی بەم دوو گۆزەیە دەهێنا، یەکێ لەو دوو گۆزانە درزێکی تێدابوو،بەڵام ئەوەی تریان ساغ و سەلیم بوو، ڕۆژانە یەك گۆزە ئاوی خۆی بەتەواوی دەگەیاندە ماڵی پیرەژنەکە، بەڵام گۆزە درزتێکەوتووەکە بەدرێژایی ڕێگەکە ئاوی لێدەتکایەوە و بە نیوە دەبوو تا دەگەیشتە ماڵەوە. بێگومان گۆزە بێ عەیبەکە شانازی بە دەستکەوتەکەی خۆیەوە دەکرد، بەڵام لەملاوە گۆزە داماوە درزتێکەوتووەکە هەستی بە شەرمەزاری ناتەواویەکەی خۆیەوە دەکرد، چونکە تەنها دەیتوانی نیوەی ئەو کارە بکات کە بۆی دروستکرابوو.
پاش دوو ساڵ لە نۆشکردنی تاڵاوی شکست، ڕۆژێکیان گۆزە درزتێکەوتووەکە لەبەردەم کانیەکەوە هاتە گۆو بەپیرەژنەکەی وت: زۆر هەست بەشەرمەزاری خۆم دەکەم، لەبەر ئەم درزەی کە بەتەنیشتمەوەیە کە وایکردووە تا دەگەینە ماڵی ئێوە، ئاوم لێبتکێتەوە.
پیرەژنەکە بەزەردەخەنەوە وتی: سەرنجت نەداوە کە گوڵوگوڵزار بەلای ڕێگەکەی تۆوە ڕواوە، بەڵام بەلای ڕێگەی گۆزەکەی ترەوە نەڕواوە؟ چونکە من ئاگاداری ئەم درزەی تۆ بووم، بۆیە تۆوی گوڵم بەسەر زەوی لاکەی تۆوە چاندبوو، هەموو ڕۆژێك لەکاتی گەڕانەوەمان بۆ ماڵەوە تۆ گوڵەکانت ئاو دەدا، من ماوەی دوو ساڵە بەهۆی تۆوە سەرمێزی ماڵەوەمان بەم گوڵانە دەڕازێنمەوە، ئەی گۆزە، بەبێ بوونی تۆ بەم شێوەیەی ئێستات ئەم جوانی و شکۆیەی ماڵەوەمان نەدەبوو.
خوێنەری بەڕێز....
هەر یەك لەئێمە درزێکی خۆی هەیە، بەڵام بزانە کە ئەم درز و شەقانەن وایان کردووە ژیانمان بەخۆشی و شادی بەیەکەوە ببەینە سەر، چونکە لەبەر بوونی ئەم درزانە لەهەر یەکێکماندا وایکردووە کە چاوپۆشین لە درزی بەرامبەرمان، ئەی گۆزە درزتێکەوتووەکان دڵتان خۆشبێ، خۆتان بەکەم مەزانن، لەبیرتان نەچێ بۆنی ئەم گوڵ و گوڵزارانەی سەر ڕێگەکەی خۆتان بکەن ها!!
و: لە ئینگلیزیەوە: اسماعیل عبدالرحمن پیرداودی– گ: ژیار – ژ١١٥ –س٢٠١٤ –ل ٣١

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿١٦٥﴾﴾ الأنعام: ١٦٥

# چۆن دەوڵەمەند بوون؟

(ئەبو هورەیرە)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( دەوڵەمەندی بەشتی زۆر نییە، بەڵکو دەوڵەمەندیی ئەوەیە کە دڵ و دەروونت دەوڵەمەند بێت)[٩٧]

هەروەها (ابو سعيد الخدري)(ر.خ) دەگێڕێتەوە: کەسانێك لە (انصار) داوای (پارەو شتیان کرد) لە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش هەندێکی دانێ، پاشان داوای تریان کرد، هەر بەشیدان، هەتا هیچی لا نەما، ئەوسا فەرمووی: ( هەرچی خێر و بێرێکم لابێ لەئێوەی ناگرمەوە، هەر کەسیش پاك و ( نەفس بەرز) بێت، خوای گەورە دەوڵەمەندی دەکات، ئەوەی بێ نیازی لە خەڵکی دەرخا، خوا دەوڵەمەندی دەکات، ئەوەش خۆی بگرێت خوا ئارامی پێ دەبەخشێت، بەهیچ کەس هیچ بەخششێك نەدراوە کە لەخۆگری گەورەتر و خێردارتر بێت)[٩٨]

دەوڵەمەندی لا لێکردنەوەی خوای پەروەردگارە لەمەڕ ئازمایشی بەندەکانی، ماڵی پێ دەدا، تاقی دەکاتەوە ئایا شوکرانەبژێوە ؟ نرخی دەوڵەمەندیەکەی دەزانێ ؟ دەستی نەدار و بێ نەوایانی پێ دەگرێ یان نا؟[٩٩] لەوەشدا بەهەندێکی دەبەخشێ و بەهەندێکی دەگرێتەوە.

---

[٩٧] - عن ابي هريرة (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): ( ليس الغنى عن كثرة العرض، ولكن الغنى غنى النفس). (بخاري/ الرقاق/٦٠٨١)

[٩٨] –(ابو سعيد الخدري)(ﷺ): انا ناسا من الانصار سالوا رسول الله(ﷺ) فاعطاهم، ثم سالوا فاعطاهم، حتى اذا نفد ما عنده قال: ( ما يكن عندي من خير فلن ادخره عنكم، ومن يستعفف يعفه الله، ومن يستغنه الله، ومن يصبر يصبره الله، وما اعطي احد من عطاء خير و اوسع من الصبر). (بخاري/ الزكاة/١٤٠٠).

[٩٩] - کابرایەکی خۆشناو لە گیانەڵا دابوو، ئاوزینگی نەدا، بەمیریان ڕاگەیاند نەخۆشێك هەیە ئەگەر سەردانی بکات خێری دەکاتێ و خێرێکی گەورەیە، ئەویش بەخۆ و دارودەستەکەیەوە چووە لای، بەقەد بگەرەکێشێك لەلای مایەوە، پرسیاری کرد: ئەوە چیەتی؟

وتیان: قوربان ئەو کابرایە لەبرسان وشك بۆتەوە.

✍ بەسەرهاتی یەکەم:

## بزانە بۆچی چووم و تووشی چی بووم؟

📖ماموستا (جەمال ناصر)[100] بۆی گێرامەوە وتی:

✎مام(ئەورەحیم) کابرایەکی مەشرەبخۆش و قسەخۆش بوو ، خوو و خەسڵەتی وابوو گەلیٚ پاکوخاوێن بوو، گرنگی زۆری بەلەبەرکردنی جل و بەرگی نویٚ دەدا. ساڵی١٩٨٩ بوو، ڕۆژێکیان هاتە دوکانەکەی باوکم لە گوندی (تازاوای سەریاس) و تاویٚ دوان لای مایەوە، من لەم ئان و ساتە لەویٚ وەستابووم، گوێم هەڵخست، بەسەرهاتێکی سەیری خۆی بۆ باوکم گێرایەوە، وتی:

لەسەرەتاکانی هەشتا بوو(هەشتاکانی سەدەی بیست) لەهەڵەبجەوە چوومە سلێمانی و لەوێشەوە بەنیشیٚ دەبوو بچمە کەرکووك، بارودۆخی داراییم لەوپەڕی خراپی دابوو زۆریش خراپ، نەمدەزانی چۆن ژیان بگوزەرێنم، کاتێك گەیشتمە کەرکووك کات: بەرە بەری نیوەڕۆ بوو ئەوەندە پارەم لەباخەڵدا نەبوو بەدڵی خۆم پێی بچمە مەتعەمێك و نانێکی باشی لیٚ بخۆم، بیرم کردەوە، کەوتمە چاوگێران بەڵکو قەرەباڵغیەك لەشوێنیٚ ببینم بزانم تازییەکی لێیە، کیٚ دەزانیٚ من کێم؟ وەکو ئەو خەڵکە دەچم لێی دادەنیشم و نانێکی باشی لیٚ دەخۆم.

پێم هەڵێنا، تەواویٚ ڕۆیشتم، پرتاو جێگەیەکم بەرچاو کەوت، کۆمەڵیٚ سەیارەی لیٚ وەستابوو، خەڵکانێك دەهاتن و دەچوون ، لەدەروونەوە بەخۆمم وت: ئەوە دۆزیمەوە یان ئەوەتە لەم شوێنە ژنهێنانە، یان تازیەیە و هیچیان بۆ من فەرقی نیە. بەخۆشحاڵیەوە بە جلێکی پۆشتە و پەرداخ چوومە ئەو شوێنە و یەکسەر بۆ ژوورەوە

---

میر بە بزەیەکەوە وتی: ئەی کەوایە بۆ برنج و شیر ناخوا؟

ئەوانیش وتیان: قوربان ئەگەر برنج و شیری بخواردایە بۆ وای لیٚ دەهات؟



[100] ماموستا ( جەمال ناصر حەمەحەسەن) لەدایکبووی ١٩٧٩ی شاری بەغدایە، دەرچووی کۆلێژە و لەهەولێر دادەنیشێت، خێزاندارە و ماموستای قوتابخانەی سەرەبستی بنەڕەتی ئێوارانە.

هەڵکشام تا لەو شوێنە لەنگەرم گرت کە خەڵکانێکی پیاو ماقوڵی لێ بوو، بەخێرهاتنێکی گەرمیان کردم، وەڵامم دانەوە، ئەوجا خۆم قڕ و کپ کرد، دیاربوو شوێنەکە نە ئەویان بوو نە ئەمیان، جار نا جارێ سەرم هەڵدەبڕی و تیە نیگایەکم دەدانێ بزانم لەو ژوورە چ باسە، ئێستاش نەمزانی ئەو شوێنە شوێنی چی بوو، ئەوەی هەڵوەستەی پێکردم بەدزییەوە چاوم دەدانێ، بینیم کەوتنەخۆ، لەبەینی خۆیان بوو بە فسکە فسك و مقومۆ، منیش ئەوە لەچاوەڕوانی ئەوەدام سفرە ڕابخرێ و نان دانێن تاوەکو نانێکی باش بخۆم و بەپەلە لەوێ هەڵسم، هەر ئەوەندەم زانی یەك لەوانەی لەوێ دانیشتبوون بەئەسپایی لەجێوە هەستا و هاتە لام، بەبێ هیچ قسەیێ، یەکسەر کیسە نایلۆنێکی خستە تەنگەی باخەڵمەوە و چووەوە شوێنەکەی خۆی، دەستم گەیاندە نایلۆنەکە و دەستم لێیدا هەستم کرد پارەیە، پارەیەکی زۆریش، ئیدی بێ ئەوەی یەك قسە بکەم لەجێوە ڕاست بوومەوە، ڕووم بەلادا وەرچەرخاندن و پێیانموت: دەی بەیارمەتیان، خواحافیز[101]

هەمووان بەخۆشحاڵییەوە وەك مەرامێکیان تازە هاتبێتە دی، لەبەرم هەستان و بەگەرمییەوە بەڕێیان کردم، لەخۆم ڕامام، کەوتمە بیرکردنەوە ئاخۆ لەبری چی ئەو شتەیان پێدام؟ هێشتا نازانم چ باسە و حیکمەت لەو شتە چیە، تەواوێ دوورکەوتمەوە، کیسە نایلۆنەکەم لەباخەڵ دەرێنا، تەماشا دەکەم هەمووی پارەیە، چاوم زەق بۆوە کە بۆ ئەو کاتە پەنجا هەزار دیناری ئەصلی بوو، پەنجا هەزار پارەیەکی خەیاڵی بوو چیت بویستبایە بەو پارەیە پێت دەکڕی، ئامێکی قووڵی پڕ

---

[101] - چاك و سەخاوەت بەپارەوە مەقامی مرۆڤ لای خوای پەروەردگار بەرز دەکاتەوە، ئەوەتا پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( ئیرەیی ڕەوا نی یە لەدوو شت دا نەبێت، یەکەم: پیاوێك خوای گەورە قورئانی پێبەخشیوە، شەو و ڕۆژ دەوری دەکاتەوە و دەیخوێنێت، دووەمیش بریتیە لەوەی: پیاوێك ماڵی پێدراوە و بەشەو و ڕۆژ دەیبەخشێ و نایگرێتەوە لە خەڵکی) ( متفق علیه)

بەدوورکەوتنەوە لە بەخشش و خێرات هیچێ لەو سەروەت و سامانە بەشی ئەو نیە ئەگەر لەسەری لێپرسینەوە نەکرێ، لەو ڕوانگەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( هەمیشە وەچەی ئادەم دەڵێت: ماڵەکەم ماڵەکەم ئایا نازانێت کە ماڵەکەی ئەوەیە بیخوات و لەناو بچێت، یاخود لەبەری بکات و کۆن ببێت و بدڕێت، یا بیبەخشێت و خەرجی بکات، جگە لەوە هەموو ماڵێك دەڕوات و بەجێ دەمێڵرێت بۆ خەڵکی) ( اخرجه احمد) و(مسلم) و (الترمذي) و (النسائي)

بەسییەکانم هەڵکێشا: بزانە بۆچی هاتم، تووشی چی بووم؟ یەکسەر لەخۆشیان چوومە لۆقەنتا و چێشتەخانە، چێشتێکی بەتام و لەزەتم خوارد و بێ ئەوەی بەهیچ لایەکدا بڕۆم، ڕێ و ڕێ گەڕامەوە.

باوکم لێی پرسی : ئەی نەتزانیەوە ئەو شتە چۆن ڕوویدا؟ ئەو شوێنە شوێنی چی بوو؟

مام(ئەوڕەحیم) بەهەڵپەیەکەوە وتی: منیش ئەوەم لێ بووە مەراق ئەو شتە چی بوو؟ ئەو شوێنە کوێ بوو؟ دوای سێ مانگ چوومەوە هەمان شوێن و پرسیارم کرد، بۆم دەرکەوت کە لەو شوێنە زیادکردن( مزایەدە)یێکی بەئاشکرا هەبوو، تەندەرات دەگێڕاوە بۆ شەریکەی ئاخچەم (گەلآبەی مارسیدس) تا ببێتە بریکاری ئەو شەریکە لە باکوری ئێراق، کاتێك منیان بەو جل و بەرگە کەشخە و جوانە بینی، ختوورەی ئەوەیان بەمێشك داهاتبوو منیش بۆ ئەو مزایەدە هاتبم، ترسابوون ئەو تەندەرەیان بۆ دەرنەچێ، بەپەلە کەوتنە ڕاوێژ و ڕاگۆڕینەوە، ڕێکەوتن بەهەموویان ئەو پەنجا هەزار دینارەم پێبدەن، تا لەو مزایەدە بچمە دەرەوە، شوکر بەبێدەنگی لێی دەرچووم.

بەڕاستی دنیایەکی سەیرە بزانە من بۆچی ڕۆیشتم و تووشی چی بووم؟ باوەڕم بەوە هەیە خوای پەوەردگار بیەوێ دەوڵەمەندت بکات بۆ خۆشت نازانی چۆن دەوڵەمەند دەبی، هەر بەو پارەیە کەوتمە تێکەولێکە و ئێستا بوومەتە ئەو کابرایەی هەمووان وەك کەسێکی دەوڵەمەند دەمناسن.

ئادەمیزاد وەکو مانگ وایە دوو ڕووی هەیە تاریك و ڕووناکی ئەو کەسە براوەیە کە ڕووناکیەکە هەڵبژێرێ.

**تێبینی:**

مام ئەوڕەحیم لەدایکبووی ساڵی سییەکانە، لە هەڵەبجە لەدایك بووە و لە دوا دواییەکانی کۆتایی نەوەدەکان لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

* * *

✍✍بەسەرهاتی دووەم:

## هیچی نەبوو، لەچاوتروکانێك بووە خاوەنی سێ سەد دەفتەر دۆلار

🕮 مامۆستا ( فخرالدین صدرالدین) بۆی گێڕامەوە، وتی:

✎ لە شاری ( ئایندەی دوو) ئەندامێکی ئەنجومەنی پارێزگای تکریت دراوسێمە، هاتوچۆ و قسەو باسمان بەیەکەوە هەیە، وەکو دراوسێ ئێمە دەچینە ماڵیان و ئەوانیش دێنە ماڵمان.

شەوێکیان بەسەرهاتێکی کابرایەکی گێڕایەوە کە ئەویش هەر لەو شارەدا خانووی هەیە و تێیدا دەژێت. بەسەرهاتەکە سەرسامی کردم، وتی:

کاتی خۆی لە حەفتاکان وەبەدیاریکراوی لەساڵی١٩٧٥ کابرایەکی خەڵکی (سەماوە) لەگەڕەکی (شۆڕشی هەولێر) پارچە زەوییەك دەکڕێت و بەجێی دێڵێ، زەوییەکە بەڕووتی دەمێنێتەوە بێ ئەوەی بیفرۆشێ یان خانووی لەسەر بکات و بەکرێی بدات.

ئەمساڵ خاوەنی یەك لە نووسینگەکانی خانووبەرە، کە چاویان بەو زەوییە دەکەوێ شوێنێکی بازرگانییە، تەماحیان تێی دەچێ، دوای چوونە تاپۆ و دیتنی فایلەکەی، تەماشا دەکەن بەناوی کابرایەکە کە خەڵکی سەماوەیە، بۆ دۆزینەوەی کابرا دەچنە سەماوە، بەپرس لێرە و لەوێ، پێیان دەڵێن: ئەو کابرایە دەمێکە مردووە.

کە دەپرسن: ئەی خێزانی؟ ماڵ و منداڵەکەی؟

پێیان دەڵێن: خێزانەکەیشی مردووە و هیچ منداڵی لەدوای خۆی بەجێ نەهێشتووە.

دیسان دەپرسن: ئەی خوشك و برا؟

پێیان وت: لە خوشك و برا، ئەوەی لەژیان مابێ، تەنها برازایەکی هەیە، ئەویش لەنەبوونیان لە نانەواخانە ئیش دەکات.

کە ناونیشانەکەی وەردەگرن، بەپرسیار لەم و لەو دەیدۆزنەوە، دەچنە لای، پێی دەڵێن: فلانە مامت زەوییەکەی لە هەولێر هەیە زۆر لەمێژە کڕیوییەتی و ئەوهای بەجێ هێشتووە، ئێستاش هاتووین تۆ وەکو میراتگری ئەو کابرایە بە سێ ملیۆن دۆلار پێمانی دەفرۆشی تاوەکو لێتی بکڕین.

کابرا دەمی بەش بۆوە، کەسێکی نەبوو و نەدار، لەخۆشیان بێ ئەوەی هیچ مامەڵەیەك بکات، ڕەزامەندی خۆی لەسەر فرۆشتنی زەوییەکەدا و سێ سەد دەفتەر دۆلاری لەچاوتروکانێك وەرگرت و بووە کابرایەکی دەوڵەمەند.

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَىٰ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾ الإسراء: ٣٢

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ( موسڵمان برای موسڵمانە ستەمی لێ ناکات و وازی لێناهێنێت کە ستەمی لێ بکرێت، ئەوەی پێویستی براکەی جێبەجێ بکات، خوای گەورە پێویستیەکانی جێبەجێ دەکات. هەر کەسێکیش یارمەتی موسڵمانێك بدات و ناڕەحەتیەکی بۆ سووك بکات، ئەوە خوای گەورە ناڕەحەتیەك لە ناڕەحەتیەکانی ڕۆژی دوایی لەسەر سووك دەکات. هەر کەسێك کەموکوڕی موسڵمانێك بشارێتەوە و دەری نەخات ئەوە خوای گەورە کەموکوڕییەکانی لە ڕۆژی دواییدا دەشارێتەوە)[١٠٢]

# ئەو کچەی بەیەك قسە برایەکەی خۆی بەکوشت دا

✍ مام ( حمید کەریم ) [١٠٣] لەساڵی ١٩٩٢ ئەو بەسەرهاتەی سەردەمی خۆی بۆ گێرامەوە، وتی:

✍ لەشۆڕشی مەزنی ئەیلوول[١٠٤] سەرلق بووم، بەپێی پێویست وەکو بەرپرسێکی سەربازی هەر جارەو دەچووینە ناوچە و دەڤەرێکی ئەم هەرێمە. وەلێ بەسەرهاتێ لەو

١٠٢ - عن ابن عمر(رضي الله عنه): ان رسول الله(ﷺ) قال: المسلم أخو المسلم لا يظلمه ولا يسلمه، من كان في حاجة اخيه كان الله في حاجته، ومن فرج عن مسلم كربة فرج الله عنه بها كربة من كرب يوم القيامة، ومن ستر مسلما ستره الله يوم القيامة).( بخاري/ المظالم/٢٣١٠)



١٠٣ - کاك (حەمید کەریم شریف) ساڵی ١٩٣٩ لە (تەق تەق) لەدایك بووە، کابرایەك بوو خۆشمەند و مەشرەبخۆش و هەمیشە دەم بەخەندە،پێشمەرگەیەکی بوێری شۆڕشی ئەیلوول بوو، لەم ساڵانەی دوایی کۆچی دوایی کردووە.

١٠٤ - لە١١ی ئەیلوولی ١٩٦١ بەڕێبەرایەتی مەلا مستەفا دژ بە جەور و ستەمی حکومەتی ئێراق هەڵگیرسا.

ماوەیەدا بینیبێتم کە تا ئێستا بیری لێ دەکەمەوە بەسەرهاتی ئەو کچە بوو کە بەیەك قسە برایەکەی خۆی بەکوشت دا.

ڕۆژێکیان بەخۆ و پۆلێ پێشمەرگە چووینە یەك لە گوندەکانی سەر سنوور، بارو بنەو بارەگامان لەو دەوروبەرە دانا و نزیکی دوو مانگ شتێ کەم لەو شوێنە ماینەوە.

لەو ماوەیەدا کێشەیەك دروست بوو، بەیانیەکیان دەمەو چێشتەنگاو پیاوێکی بەتەمەنی پشت چەماو لەگەڵ کچ و کوڕەکەی هاتنە لام، لەبەریان هەستام، بەخێرهاتنیانم کرد و ڕێزێکی زۆرم گرتن. کە فەرمووی ئەو هاتنەم لێکردن، باوکیان سەروپۆتەڵاکی بە موسڵمانێکی لەخوا ترس دەچوو، بەهەڵپەیەکەوە زمانی گەڕاند: قوربان ببوورە تووشی گرفتێکی گەورە هاتووین هانامان وەبەر هێناوی تکایە فریامان بکەوە.

کە پرسیم: دەی خوا گەورەیە، ئەوە گوێم لێگرتوون، فەرموو بزانم گرفتی چیتان هەیە؟

هەر ئەو وەڵامی دایەوە: ئەوە کوڕمە و ئەوەشیان کچمە، زگی ئەو کچەمیان پڕ کردووە، کێ ئەو کارەی کردووە؟ نازانم.

لەسەروسیمای کچەکە وردبوومەوە، کیژێکی جوان و بەرچاو بوو. زۆر بەشێنەیی پێموت: کچی خۆم وابزانە مامی تۆم، یارمەتیم بدە بۆ ئەوەی یارمەتیت بدەم نەهێڵم کەس لەگوڵ کاڵترت پێ بڵێ، بەس توخوا درۆم لەگەڵ مەکە و بەڕەوانی وەڵامم بدەوە، وەرە بزانم ئەوە کێ وای لێ کردووی؟

کچەکە بەدەم فرمێسك ڕشتنەوە کە دیاربوو زۆریان لێی دابوو، هەر نەیهێناو نەیبرد، دەستی بۆ برایەکەی درێژکرد و وتی: ئەو برایەم وای لێ کردم.

بیرم کردەوە چۆن برا ئیشێکی ئاوا قۆڕ دەکات؟ لەدڵی خۆم تف و نەحلەتم کرد، چاوم زەق بۆوە: کچێ ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی؟ چۆن برا ئیشی وا دەکات؟ نا، تۆ درۆم لەگەڵ دەکەیت و ناتەوێ ڕاستیەکانم بۆ بدرکێنی.

کچەکە چونکە برایەکەی لەسەر ئەو وەزعە بەدار و شەق و پێلەقە بەربووبووە وێزەی، نیوە مردی کردبوو، لێی داخداربوو، کەوتە درۆبەخشینەوە و تۆمەتە هەڵبەستن بۆی: نەخێر درۆ ناکەم، ڕۆژێکیان لەماڵەوە خەریکی گێسکدانی ژووری بووم، کەس لەماڵەوە نەبوو، ئەوەندەم زانی ئەو برا سندانکوشتیەم هاتە ژوورەوە، لەناوەوە دەرگاکەی لەسەر قەپات کردم و تێمڕوو بوو، توند دەمی گرتم و تەعدای

لێ کردم.

برایەکەی بەو قسانە بووە دڵۆپێ ئاو، ڕەنگی مردووی لێ نیشت، بەجۆرێ تاسا، هەرگیز چاوەڕوانی درۆیەکی شاخداری لەو چەشنەی لێ نەدەکرد، دەمی بەش بۆوە، ورتەی لەدەمەوە دەرنەهات.

باوکی ڕەنگێکی هێناو برد، خەنجەرە دەبانەکەی بەر پشتی هەڵکێشا، وەرگەڕایە سەری، لێدە و لێدە، کوڕەکەی خەڵتانی خوێن کرد ، بەمەش لرخە لرخێکی لێوەهات، گیانی دەرچوو.

تەرمی کوڕەکەیان کفن و دفن کرد و شاردیانەوە بێ ئەوەی پرسەی بۆ دانێن.

عەیامێك بەسەر ئەو ڕووداوە ڕابورد، کچەکە هەستی بە تاوان و ناهەقیەکی زۆر بەرامبەر بەبراکەی کرد، نەیتوانی لەوە زیاتر ئۆقرە بگرێت و ڕووی هەقیقەت و زامی دەروونی بشارێتەوە، دەنگی درۆی دڕی، دانی بەوە دانا برایەکەی بەناهەق بەکوشت داوە لەکاتێکدا براکەی سەروسەبەبی لەهیچ نەبووە و هیچی نەکردووە، ئێستاش نازانێ بۆ کوێ بچێت و چی بکا؟ دەگریێ و سەردولکە دەڵێ و شیوەنی بۆ دەبەستێ،

باوکی بەو دانپێدانە لێی داڕسا، پەلاماریدا ، مارانکوژی کرد ئەوەندەی بەسۆندە و دارو پێلەقە لێی بدات، کاتێك ئەو خەبەرەیان پێدام، بەپەلە ناردمە دوایان، هەردوکیان هاتنە لام، کچەکە لەفیتی خۆی گەیشتبوو، سەری بە ملدا شۆڕکردەوە ڕووی ئەوەی نەبوو سەر هەڵبڕێ، پێموت: دەك بەبەر قارو غەزەبی خوای بکەوی وەکو ئەو گۆبەندە گەورەت نایەوە، وەرە بزانم چۆن دڵت هات بەیەك قسە ئەو برا بێتاوانەت بەکوشت بدەی؟ بەڕاستی ئێستا سزەی منە ئەگەر ڕاستیەکەم پێ نەڵێی، هەر لێرە لەت و پەتت دەکەم، گۆشت و ئێسقانت دەهاڕم و دەتکەمە پەندی زەمانە[١٠٥]

---

[١٠٥] - عن عبيدالله بن عبدالله بن عتبة: انه سمع عبدالله بن عباس (رضي الله عنه) يقول: قال عمر بن خطاب(رضي الله عنه)، وهو جالس على منبر رسول الله(ﷺ): ان الله قد بعث محمدا(ص) بالحق، وانزل عليه الكتاب، فكان مما انزل عليه اية الرجم، قرانا‌ها و وعيناها و عقلناها، فرجم رسول الله(ﷺ) ورجمانه بعده، فاخشى ان طال بالناس زمان ان يقول قائل: ما نجد الرجم في كتاب الله تعالى، فيضلوا بترك فريضة انزلها الله، وان الرجم في كتاب الله حق على من زنى –اذا احصن– من الرجال و النساء، اذا قامت البينة، او كان الحبل او الاعتراف. (بخاري/ المحاربين/٦٤٤٢)

لە (عبيدالله)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (عتبە)وە دەگێڕنەوە: کە لە (عبدالله)ی کوڕی(عباس)ی بیستووە دەیوت: (عمر)ی کوڕی (خطاب) لە کاتێکدا کە لەسەر دوانگەی پێغەمبەری خوا دانیشتووە وتویەتی: بێگومان خوا –محمد–ی بە حەق ڕەوانە کردووە و قورئانی بۆ ناردووە، لەوەی کە خوا ناردبوویە سەری

کچەکە چۆن چووبووە سەر کەڵی شەیتان، نەهاتە خوارەوە و ملی نەدا، لەبەر خۆیەوە دەگریا، شیوەنی دەکرد.

کە ڕووم بەلای باوکی وەرچەرخاند: ئەی تۆ گومانت لەکێ یە؟

باوکی بەسەری زمانی لێوی وشکبووی تەڕکرد و هەڵیدایێ:چا گومانم لەکێ نەبێ؟

پێنج ناوی یەك لەدوا یەکی بۆ ڕیز کردم کە خەڵکی ئەو گوندە و خزمی خۆی بوون.

منیش بە دوو پێشمەرگە ناردمە دوایان، هەموویان دەست بەسەر کرد، بەدەم هەڕەشەوە، چاوم لێ سوورکردنەوە : ئەوە قەت حەیاو شەرمتان بەخۆ نیە لەم گوندە کە هەمووان پشت و پەنا و پەسێر و کەس و کاری یەکن ئەوجا ناپاکی دەرهەق بەیەك دەکەن؟ هێی کیژۆڵە وەرە بزانم ئەمانە کێیان ئەو کەتن و ئەتك و پەتکەی پێکردی؟

ئەویش تووشی واقیعێك ببوو، ناچاربوو شەکرێك بشکێنێ، بۆیە دەستی بۆ یەك لە کوڕەکان درێژ کرد: ئەو کوڕە بوو ئەو ئەتکەی پێ کردم لەکاتێکدا من......

کوڕەکە نەیهێشت قسەکەی تەواو بکات، قسەی لەدەم قۆستەوە، دەستی بۆ یەك لەکوڕەکانی دیکە ڕاکێشاو وتی: ئەوە من قەینا، ئەدی ئەو کوڕەش ئەوێ ڕۆژێ تۆی نەبردە پشت گردەکە و ئەوهای لێ کردی؟

ئەو کوڕەش بەهەمان شێوە بەرگری لەخۆی کرد، وتی: ئەوە منیش قەینا، ئەدی ئەو کوڕەش تۆی نەبردە پشت قەمیشەڵانەکە و ئەوها و ئەوهای لێ کردی؟

هەموویان شاهێدیان لەسەر یەك دا، ڕێك گومانی باوکی کچەکە تەواو دەرچوو کە وتی: گومانم لەم و لەو و لەو هەیە.

بە گوێبیست بوونی ئەو قسانە، ڕقم هەستا، وەرگەڕامە سەریان تا شلکوت بووم بەشەق و پێلەقە لێیانمدا ئەوجا بە پێشمەرگەکانم وت: دەی خێرا بیانبەن، هەموویان

---

ئایەتی بەردبارانکردنی (داوێن پیس) بوو خوێندبوومانەوەو لێیحاڵی بووبووین و تێی گەیشتبووین، پێغەمبەر (ﷺ) خۆی ( پیاو و ژنی) داوێن پیسی بەردباران کردووە و ئێمەیش پاش ئەو کردوومانە، ئەترسم لەوەی گەر ڕۆژگار بەخەڵکی تێپەڕ بکات و درێژ بکێشێت کەسی ئەوتۆیان لێڕاست بێتەوە و بڵێ: لە نامەی خوای باڵادەستا بەردباران کردنی تیا نیە ئینجا سەریان لێبشێوێت و گومڕابن بەوازهێنان لە حوکمێك کە خوا دایبەزاندوە، بەڕاستی بەردبارانکردن لە قورئاندا حەقێکی نەگۆڕە لەسەر کەسێك کە زینای کردبێت، ئەگەر ژنی شووکردوو یان پیاوی ژن هاوردو بێت بەو مەرجەی (چوار ) شایەت هەبێت، یان سك پڕبوون، یان دانپیانان.

لە ئاوەدەست بکەن، نامەوێ تەنانەت نان و ئاویشیان بدەمێ.
بووە مقۆ مقۆ و قسە و قسەلۆك ،کەس و کاری گیراوەکان بەخۆ کەوتن و مشەوەش بوون، خڕبوونەوە چۆن چارەیەکی ئەم وەزعە بکەن، هاتنە لام، تکایان کرد کوڕەکانیان بۆ ئازاد بکەم.
حەوش و ژوورەکان سیخناخە و پڕ بوون لە خەڵکی، پێموتن: ئەو داوایەم لێ مەکەن، من بەئاسانی بەریان نادەم چونکە کارێکی ئەوەندە قۆڕ و خراپیان کردووە بەرامبەر کێ؟ بەرامبەر کەسێکی هەژار و داماوی وا کە هەمووتان کەس و کاری ئەون، فەرموو یەکێك ئەوها بەسەر کچەکانتان بێنێ، چ هەرا و هۆریاو ئاگرێك دەکەنەوە لەکاتێکدا هەموویان دانیان بەوە ناوە کە دەستیان لەو کارەدا هەبووە؟
ئەوانیش بەو قسەیە لەشەرمی ڕووان کەس متەقی لێوە نەهات و لغاوی دەمی هەڵنەپچڕی. ئەوەبوو یەك لەو پیاوانەی یاوەری دەکردن، خاوەنی دوو ژن بوو، تەمەنێکی هەبوو، پیاوێکی دەوڵەمەند و خێرومەند و چاوتێر و پەناگەی لێقەوماوان بوو، ڕووی تێکردم و وتی: قوربان ئەگەر ڕاتان لەسەربێ، تەگبیرێکم پێیە دەتوانم چارەی ئەو گرفتە بکەم.
که لێم پرسی: چ تەگبیرێکت پێیە؟
وەڵامی دایەوە: قوربان گیان تازە کار لەکار ترازاوە، هەرچیەك بکەین شتەکە وەکو خۆی لێ نایەتەوە بەڵام من لەپێناوی ئەو خوایە گەورەی خەڵقی کردووین تا عەیب و عاری ئەو کچە دابپۆشم و نەهێڵم کارەکە لەوە گەورەتر ببێ، ئەگەر ڕازیبن ئامادەم ئەو لەخۆمی مارە بکەم و بیهێنم.
نەختێ لەو قسەیە وردبوومەوە، ڕووم کردە باوکی کچەکەو پێموت: ئەوجا هوون و ئێوە چ دبێژن؟
وتی: تۆ برا گەورەی، هەر بڕیارێك بیدەی لەقسەت دەرناچم.
منیش ڕووم کردە کەس وکاری گیراوەکان، پێموتن: دەبێ ئێوە خوێنی ئەو کچە و کوڕەکەیشی بدەن.
هەموویان بەو داوایە ڕازی بوون.
ئەوجا مەبلەغێ پارەم بۆ دیاری کردن ، پاشان بانگی گیراوەکانم کرد و بەقسە هەموویانم شووشتەوە، دواقسە پێیانموت: تا سەت ساڵی دی هەر هەڵەیەکی دیکەی

لەو شێوەتان لێ ببیسمەوە بەقوربانی مردنتان دەکەم،

بەڵام ئەو کابرایەبن بووە فریادڕەسیئێوە و گیانی ئێوەی کڕیەوە، دەنە خۆم دەمزانی چیم دەکرد!

کە ڕووم کردە کابراکەو پێموت: تۆ ئامادەی جل و بەرگ و تەواوی پێویستیەکانی ئەو کچە دابین بکەی؟

وتی: بەسەرچاو بایی ئەوەندە پارەم هەیە نەهێڵم لەهیچی کەمبێ.

کە پێموت: ئاخر من لەجیاتی باوکی ئەو کچە مەرجی خۆم هەیە.

بەسەرسوڕمانەوە پرسی: مەرجی وەك چی؟

لەخانەی گاڵتەکردنەوە بۆ سوعبەت پێموت: من ئەو کچەت بە گۆلکەوە دەدەمێ، ئایا ڕازی گۆلکەکەیشی بەخێو بکەی؟

وتی: بێگومان ئەویش بەخێو دەکەم.

بەم قسانە بوو بە پێکەنین و کۆتایم بەکێشەکە هێنا، کابرا قبولی کرد ببێتە سەرداری ئەو کچە و بەڵێنم لەکچەکە وەرگرت لەمەودوا ئاگای لەخۆیی و ماڵ و منداڵی ببێت و ناپاکی لەو پیاوە نەکات وەکو بیلبیەی چاوان بیپارێزێ کە ئەوی لەمردن ڕزگار کرد.

* * *

✍ لەوەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ:

۞یەکەم: کاری بەدڕەوشتی شتێکی قێزەونەو سروشتی مرۆڤ هەڵیناگرێ و نایخوازێ.

۞دووەم: کورد وتەنی: بەڵای سەر زمانە، ئەم کچە بەیەك وشە خۆی توشی خەڵتاوی تاوان کرد، بەناهەق براکەی بەکوشتدا.

۞سێیەم: کەسێك لەخوانەترسێ ئامادەیە هەرچی شتێ خراپە بیکات، وەکو چۆن خوێندمانەوە ئەم کارە بەدەی لەگەڵ چەند کەسێك ئەنجامداوە.

۞چوارەم: هەڵویستی ئەو کەسەشمان بۆ دیار دەکەوێ کە قوربانی بە دڵی خۆیان دەدەن لەپێناو کپ بوونەو کوژانەوەی گڵپەی ئاگری کۆمەڵگا.

# 🕮 تووڕەم مەکەن [١٠٦]

✎ ئەوە من نیم،
لەتووڕەیی دەبمە زریان.
تووڕەم مەکەن،
چارتان دەکەم.
ڕەگ و ڕیشەی سەوزی دڵتان،
لەناخەوە دەردەهێنم،
هەر هەمووتان وشك دەکەم

* * *

ئەوە من نیم
لەتووڕەیی دەبمە لافاو
تووڕەم مەکەن
کەس نابینم بەچاو،
خەمتان دەخۆم، ئاوتان بۆ دێنم
دار وبارتان دەشکێنم
هەر بەو ئاوە
هەمووتان دەخنکێنم

* * *

ئەوە من نیم
لەتووڕەیی دەبمە بوومەلەرزە، دەبمە گڕکان
تووڕەم مەکەن
پەشیمان دەبنەوە
وا دەردەچم و دێمە لاتان
وەك قومبەلە

[١٠٦] - شیعری: شاخەوان عەلی

دەتەقمەوە
کەستان ناناسم
دیاری خۆمتان بۆ دێنم
بەگڕی ئەو ئاگرە
هەمووتان دەسووتێنم
* * *

ئەوە من نیم
لەتووڕەیی لەگەڵتانم
دادەنیشم، تووڕەم مەکەن
نەزریانم، نەلافاو، نە گرکانم
بێدەنگبن
بەئاگابن
لەڕێی هات و نەهات
چاوم نایە سەریەك، پڕتاو
ئازارێك بەقاچم داهات
* * *

چەند مێروولەیەکم بینی
هاتووچۆیان دەکرد
ئەو دەهات و ئەو دەچوو
ئەو مێروولەم نەناسی
ئەو مێروولە کامە بوو؟
تووڕەبووم،
دەستم وەشاند
هەموویانم لەخۆم
داتەکاند، ئاااااخ
ئەوجا تێگەیشتم تووڕەیی شێتی و هەڵچوونە
خۆ لەبیرچوون و لەناوچوونە

تووڕەم مەکەن

نا...نا.. نەکەن...نەکەن

تف لەتووڕەیی،

تف لەهەموو ئەوانەی تووڕەم دەکەن.

* * *

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( هەر کەسێك غەشم و تووڕە بوونێك بگرێت و لە هەمان کاتیشدا بتوانێت لەشوێنی خۆیدا تووڕەبوونەکەی خۆی خاڵی بکاتەوە، ئەوا پەروەردگار لەڕۆژی قیامەتدا بانگی دەکات لەبەر چاوی دروستکراوەکانەوە سەرپشکی دەکات لەنێو حۆرییەکاندا بەئارەزووی خۆی کامیانی بەدڵ بێت هەڵی بژێرێت) ( اخرده ابوداود) و( والترمذي وقال حديث حسن)

✍ تووڕەیی ئاگر لەخەرمانەی کەسایەتی مرۆڤ بەردەدات

📖 <u>هەمووومان بەسەرهاتی ئەو باوکە تووڕە لەبیرە ناکەین:</u> کاتێك منداڵەکەی لەماڵەوە شووشەی پەنجەرە دەشکێنێ، لێی تووڕە دەبێ و بەردەبێتە وێزەیی، زۆری لێ دەدات، ئەوجا توند هەردوو دەستی بە گوریس لەپەنجەرە دەبەستێتەوە، سوێندیش لە ژنەکەی دەخوات تا دەچێتە بازاڕ و دەگەڕێتەوە ئەگەر دەستی منداڵەکەی بکاتەوە ئەوە سێ بەسێ تەلاقی بدات.

کابرا پێی هەڵێناو هەنگاوینا چووە دەرەوە، منداڵەکەیش لەتاو ئێش و ژانی دەستی، پڕ بەگەرووی هاواری دەکرد: توخوا دایە گیان دەستم بکەوە، تۆبە چیتر کاری وا دووبارە ناکەمەوە، توخوا وەرە خەریکە دەمرم، خەریکە دەستم لێ دەبێتەوە.

دایکی لەترسی ئەو هەڕەشەی لێی کرا نەوەکو تەلاقی بدات، هەرچەندە لەناخەوە بۆ منداڵەکە سووتابوو، چەندی دەکرد نەیدەوێراو زاتی ئەوەی نەدەکرد لێی بچێتە پێش و دەستەکانی بکاتەوە.

ئێوارە داهات کابرا گەڕایەوە ماڵ، کە چاوی بەمناڵەکەی کەوت ئەوە لەهۆش خۆی چووە، دڵی داخورپا، بەزەیی پێدا هاتەوە، بەپەلە گوریسەکەی لەدەست کردەوە و گەیاندیە نزیکترین نەخۆشخانە، وەلێ دوای پشکنینێکی ورد، پێیان وت: مناڵەکەت حاڵی شڕە، خوێن لەو دەستەی نەماوە ئەگەر دەستی نەبڕینەوە لێی پیس دەکات و دەیکوژێت.

کار لەکار ترازا، تووڕەیی باوکەکە بەو ڕۆژەی گەیاند کە بەناچاری بەدەمی خۆی ڕەزامەندی لەسەر ئەوە دەربڕێ بەس ئەوەندە منداڵەکەی هیچی لێ نەیەت و نەمرێ، دەستی ببڕنەوە..ئەوانیش نەشتەرگەریەکەیان بۆی ئەنجامدا و دەستیان بڕییەوە.

کاتێك منداڵەکە بەنج بەریدا، وردە وردە بەهۆش خۆی هاتەوە، سەیری کرد دەستی بڕاوەتەوە، بەدەم ئاهو ناڵەو پاڕانەوە ڕووی کردە باوکی و وتی: بابە گیان تۆبە، توخوا چیتر لێم مەدە، تەواو چیدیکە شووشە ناشکێنم، توخوا دەستەکانم بدەوە.

باوکەکە جگە لە هەڵکێشانی ئاهێکی قووڵ و دەربڕینی پەشیمانیەکی زۆر، هەنسك لەقووڕگی گیر ببوو، دایە پرمەی گریانێکی بەکوڵ و هیچ قسەیەکی بۆ نەکرا [107]

* * *

## ✍ تووڕەیی کلیلی دەرگا داخراوەکانی تاوانە

### ئەو دەستکەوتانەی لەماننگێك کۆی دەکەینەوە لەتووڕەیی لەچەند خولەکێکدا هەمووی لەدەست دەدەین[108].

---

[107] – دەگێڕنەوە: دوو برادەری گیانی بەگیانی دەچنە ڕاو، ماوەیەکی باش لێرە بۆ ئەوێ دەکەونە گەڕان و سووڕان تا چاو دەدەنە ئاسکێك، یەك لەو دوانە سێرەی تابڕی لێ دەگرێت و فیشەکی تێدەگرێ لە ئاسکەکەی نادات، کە بەرەو ئەو شوێنە شۆڕ دەبنەوە تەماشا دەکەن پیاوێك خەڵتانی خوێن بووە و مردووە، ئەوجا بۆیان دەردەکەوێ ئەو فیشەکە لەجیاتی بەر ئاسکەکە بکەوێ، بەو پیاوە بەستەزمانە کەوتووە، تەگبیر دەکەن، چیبکەن باشە؟ بەجێی بێڵن یاخود بیشارنەوە؟، بڕیار دەدەن تەرمەکەی تەقەت بکەن، دەست لەڕاو هەڵدەگرن، لەنزیك ڕووباری ئەو نزیکەدا زەوی هەڵدەکەنن، بەجلی بەریەوە تەرمی کابرا دەنێنە ژێر خاك و دەیشارنەوە کە ئێوارە داهات وردە وردە ئاو زیادی کرد بەمەیش تەرمەکە ژێر ئاو کەوت.

ئەم دوانە درێژەیان بەژیاندا، ڕۆژێکیان لەئەنجامی دەمەقاڵێیەکی بچووك، ئەو کەسەی ئەفەرەکەی کوشتبوو، شەقازیلەیەك لە هاوڕێکەی دەدات و ترسی لێ دەنیشێ لەسەر ئەو کەتنەی کردی ئەو نهێنیەی لێ ئاشکرا بکات، بەڵام برادەرەکەی خۆی شێڵوو ناکات و پێی دەڵێ: چۆن ئاوەکە بەسەری کەوت دەبێ هەروا بەسەری بکەوێ ( واتا: هەرچیەکم لێبکەی ئەمە نهێنیەکە، مەگەر مردن وەئەگینە کەس لەدەمی منەوە نایزانێ).

[108] - تووڕەبوون: تێکچوونی باری دەروونیە و سنووردارە، لەکاتێکا ڕوو دەدات کە بەپێی ئاڵۆزی و ڕێژەی تووڕەبوونەکە بەردەوام دەبێت و بەپێچەوانەی ویستی مرۆڤ لەڕووی دەربڕینەوە هەستێکی سروشتیە و لەبەشێکی مێشکەوە سەرچاوە دەگرێ کە بە (ئەمیگەدال) ناودەبرێ، بۆیە لەو بەشەی مێشکدا ئاماژەکان وەردەگیرێن و بۆ بەشەکانی دیکەی مێشکی دەنێرن، بۆیە کاتێك یەکێك خۆی لێ تووڕە دەکات، ئەویش دەمودەست کاردانەوەی دەبێ و تووڕە دەبێت.

ئەرِستۆ دەڵێت: کە مرۆڤ تووڕە دەبێت کارێکی ئاسانە بەڵام لەکاتی گونجاو یان لەگەڵ کەسی گونجاو یاخود بۆ ئامانجێکی گونجاو و بەشێوەیەکی گونجاو تووڕە ببێت کارێکی ئاسان نییە.

مرۆڤ هەموو کاتێك بەیەك شێوە نامێنێتەوە، بەواتایەکی دیکە ( هەموو کات ئارام و دڵخۆش نیە، یان دڵتەنگ و تووڕە) لەبەردەم گۆڕانکارییەکان ئەویش تووشی گۆڕان دێ ( گۆڕانی دەروونی و جەستەیی) کەواتە ئەو کاتانە چین تیایدا تووشی هەڵچوون و تووڕەیی دێین، لە گرنگترینیان:

١- کاتێك بەربەست و ڕێگری لەبەردەم حەزو ئارەزووەکانمان دادەنرێ و ناتوانین وەکو پێویست تێریان بکەین.

٢- کاتێك بۆ کارێکی نەخوازراو ناچار دەکرێین بێ ئەوەی ویستمان لەسەربێ، وەك ( ڕاو و ڕووت و ڕێگری – بەزۆر تەعدا کردن – سووکایەتی پێکردن و...هتد).

٢- کەسێکی خۆشەویست لە ( خزم و دۆست و هاوڕێ) یانمان لەدەست بدەین کە لەژیاندا پێیان سەرسامین و کاریگەرییان بەسەرمانەوە هەیە.

٣- لەناکاو پلەو پایەمان بەرز بکرێتەوە یان لەپلە و پایەکەمان دابماڵن بێ ئەوەی هیچ هەڵەیەکمان کردبێ کە هەستکردن بەسووکایەتی تووشی بێ هیوامان بکات.

٣- لە چاوەڕوانی شتێکبین و تووشی شتێکی دیکە بێین، بۆ نموونە ( بۆ کارێکی خراپ دەڕۆین کەچی کارێکی خێرمان بێتە پێش و بەپێچەوانەوە، یاخود قوتابیەك کە ئەزموونی کردووە، دڵنیایە و دایناوە چونکە خراپ وەڵامی داوەتەوە لەو ئەزموونە دەرناچێ، کەچی نمرەکانی وەردەگرێتەوە بەنمرەیەکی باش دەرچووە، چاوئەبڵەق دەبێت و بەپێچەوانەوەش کاتێك نمرەکانی وەردەگرێتەوە لێی کەوتووە.

کەواتە هەرکاتێك پاڵنەرەکانمان بەهێزبێ، هەڵچوونەکانمان بەهێز دەبن، بەپێچەوانەوە پاڵنەرەکانمان سست و لەسەرخۆ و لاوازبێ، ئەوا هەڵچوونەکانمان لاواز و سست و لەسەرخۆ دەبێت.

❀ پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: دوو ڕەوشت هەن خوا و پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێت(هێمنی و لەسەرخۆیی)لەگەڵ(پشوودرێژی و درەنگ تووڕەبوون)

✎ چوار جۆرە تووڕەبوون هەیە:

❀یەکەم: زوو تووڕەبوون و زوو ئاشت بوونەوە.

❀دووەم: زوو تووڕەبوون و درەنگ ئاشت بوونەوە.

❀سێیەم: درەنگ تووڕەبوون و درەنگ ئاشت بوونەوە.

❀چوارەم: درەنگ تووڕەبوون و زوو ئاشت بوونەوە.

باشترین شت بۆ ئەوەی لەتووڕەیی بەدووربین، یان تووڕەیی ناخمان بخۆینەوە:

☒ یەکەم: جێهێشتنی ئەو شوێنە لە ژوورێکەوە بۆ ژوورێکی تر، یا پیاسەیەکی دەرەوە بکەین بەتایبەت چوون بۆ پارك یان ماڵە خزم و برادەرێ یاخود هەر شوێنێکی تر کە هێمن و ئارامی لێ بەدەست بێنێت.

لە فەرموودەیەکدا هاتووە: دوو کەس بەشەڕ هاتن، جنێویان بەیەك دەدا، یەکێکیان لە تووڕەییان دەماری ملی ئەستوور ببوو، پێغەمبەر فەرمووی: وەرن شتێك هەیە بیڵێن تووڕەییەکەتان نامێنێ..فەرموویان: ئەو شتە چیە؟ وتی: بڵێن (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم )ئەو تووڕەییە نامێنێت.

ئەو بەسەرهاتانەی مشتێکن لەخەرواری ئاگری تووڕەیی و هەڵچوونی مرۆڤەکان:-

✍**بەسەرهاتی یەکەم:**

**هەندێ جار مرۆڤی بەش مەینەت لەتووڕەیی بەدەستی خۆی هەقی خۆی دەسووتێنێ.**

📖 مەلا ڕەئوف شوانی بۆی گێڕامەوە، وتی:

✎ له (دەشتی کۆیە) دوو بنەماڵە هەبوون ( عومەر) و (فازل)، ڕۆژێکیان منداڵەکانیان لەدەرەوە بەشەڕ دێن، لەوەوە ئەو دوانە بەگژ یەك دادەچن و له دەمەقاڵێی نێوانیان قسەیەك لەم و قسەیەك لەو، پەلاماری یەك دەدەن.

عومەر کەسێکی خڕیلەی کورتە باڵابوو، ئەوەندەی خۆی هێناو برد و دەستی لێ ڕاشەقاند هیچی پێ نەکرا. ئەو خەڵکەی ئەوێ لێکیان کردنەوە.

فازل بەجۆرێ وەرگەڕابووە سەرو گوێلاکی عومەر و لەبنەخۆی نابوو، سەری لەدوو لاوە شکاند، بەپەلە عومەریان گەیاندە نەخۆشخانەی کۆیە و سەریان شەش حەوت تەقەڵ دوورییەوە، حیرس دایگرتبوو، نەیکردە نامەردی هەر ئەو دەمە چووە لەلای حاکم و شکاتی کرد، ئەویش بەپۆلیس تەبلیغیان ناردە دوای فازل کە بەیانی ڕۆژی پاشتر سەعات -١١ - له دادگا ئامادەبێ.

فازل ڕۆژی دوایی پێش سەعات ١١ ی سەر له بەیانی بەخۆو دەستی تەبلیغەوە چووە دادگا و لەبەردەم ژووری حاکم وەستا، عومەر هات لەتەکیەوە وەستا.

فازل کەسێکی ئاقڵمەند بوو، دەیزانی بچێتە ژوورەوە ناتوانێ بەرگری له خۆی بکات، لەجێوە کەوتە جووڵە جووڵی ئەوتۆی ناشیرین و قسە پێ وتن بۆ ئەوەی پەتی ئارامی عومەر بپچڕێنێ و تووڕەی بکات. هەرواش دەرچوو لەتووڕەییان، ئەو کوڕە جوانخاسە چۆن سیما و ڕوخساری زەرد هەڵگەڕا، وەکو شێر نەڕاندی و پەلاماری دا، بەبەرچاوی

---

سوننەتە یان (اعوذ ) بکەی یان لەوێ بڕۆی، یان ئەگەر دانیشتبووی هەڵسیە سەرپێ یان هەڵسای، دانیشیەوە.

☒ دووەم: هەناسەیەکی قووڵ هەڵبمژین و هەناسەمان بگرین، پاشان هەناسە بدەینەوە و هەمان شت چەند جارێك دووبارە بکەینەوە تا دەبێتە خوویەکی باش تا بەتەواوی خاو دەبینەوە.

☒ سێیەم: دەستی ڕاست یان چەپمان توند بنووقێنین و هەناسەیەکی قووڵ هەڵبمژین، چەند چرکەیەك بوەستین، ئەوجا دەستمان شل بکەینەوە لەگەڵ هەموو لەشمان.

☒ چوارەم: زۆر کەس دەتوانن جڵەوی خۆیان بگرن کە هەست بە تووڕە بوون دەکەن، دەست بەجێ له ١ هەتا ١٠ دەژمێرن، بەمەیش کە گەیشتنە (١٠) تەواو خاو دەبنەوە..

ئەو خەڵکە و پۆلیسەوە بەمست و شەق و پێلەقە بەربووە ویژەیی، ئەویش دەستی نەکردەوە تا هەموو سەرو پۆتەلاکی بریندار کرد.

کاتێك هەردوکیان بانگی ژوورەوە کران، حاکم چاوی بە فازڵ کەوت ئەوە خوێن لەدەم و چاوی دەچۆڕکێ و ناوچەوانی شین و مۆر بۆتەوە، پرسیاری لێ کرد: ئەوە کێ وای لێ کردووی؟

بەدەم ئیشارەتەوە: قوربان ئەو کابرایەی شکاتی لێکردووم و تۆش تەبلیغت بەدوادا ناردووم.

حاکم بەتووڕە بوونەوە رووی کردە عومەرو پێیوت: هێێێێی ئەوە ئیش بوو تۆ کردت؟

وەڵامی دایەوە: ئاخر قوربان جنێوی پێدام.

ئەویش وتی: چما جنێودان ئەوەندە دێنێ ئەوەهای لێبکەی؟ تۆ کە نەتوانی بەسەر تووڕەیی خۆت زاڵبی، ئەوە بەدەستی خۆت مافی خۆت خوارد.

هەر دەم و دەست بڕیاری لێخۆشبوونی بۆ فازڵ دەردەکات و عومەریش بەنابەدڵی و دڵی شکاوەوە دادگای بەجێ دێڵێ و دەگەڕێتەوە گوندی.

* * *

## ✍✍ بەسەرهاتی دووەم:

هەندێ جار تووڕەیی سەر بۆ زوڵم و جەور و ستەم دەکێشێ، تووڕەیی دەیکاتە مرۆڤێکی بێ ئەقڵ، ئەوەی زولم بکات بێ ئەقلە چونکە ئەگەر بزانێ لەدواڕۆژ چ لێپرسینەوەیەکی دەرهەق دەکرێ، قەت زوڵمی نەدەکرد.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( هەر کەسێك بەئەندازەی بستە زەوییەك ستەم بکات ئەوا بەئەندازەی حەوت قاتی زەوی کۆت دەکرێتە گەردن و ملی) (متفق علیه)

### ١- بۆ تۆپەڵە بەفرێ، منداڵێکی کوشت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( پەروەردگار مۆڵەتی ستەمکار دەدات، بەڵام هەر کات گرتی ئەوا لەژێر چنگی دەرناچێت) (متفق علیه)

ببە کەلاك سەگ بتخوا، مەبە بەسەگ کەلاك بخۆی، بەواتایەکی دیکە: زوڵمت لێ بکرێت باشترە لەوەی زوڵم بکەی.

✍ لەم هەرێمەی خۆمان کەم کەس هەیە بەبیستنی ئەو بەسەرهاتە نەتاسێ! ڕووداوێکی ڕاستەقینە: وەرزی زستان بوو، بەفر کلو کلو دەباری، دەشت و دەری ئەو سنوورەی سەرتاپا سپی کردبوو، خەڵك دەستە دەستە بۆ شێرە بەفرینە لەماڵەوە بەرەو دەر و دامێنی چیاکان دەڕۆیشتن، گەورە و بچووك تێکچڕژابوو، منداڵێکی ئاسایی تەمەن پێنج شەش ساڵان بە دەستی تۆپەڵەوە کەوتبووە دوای برا گەورەکەی تا بەفرڕێژی بکات، تەواوێ کەوتە دوای، هەستی بەماندووبوون کرد، لەجێوە وەستا و تۆپەڵە بەفرەکەی تێ گرت، بەڵام بەبراکەی نەکەوت و لە جەستەی کابرایەکی دەستڕۆیشتوویدا کە بەخۆو خێزانەوە هاتبووە ئەو شوێنە، کابرای بەرپرس ئەو تۆپەڵە بەفرەی بە ئیهانە و سووکایەتی وەرگرت، تووڕەیی باڵی بەسەر کێشا بێ بیر کردنەوە کە ئەو کەسە منداڵە و بەدەستی ئەنقەست تێی نەگرتووە، لەجێوە دەست بۆ دەمانچەی بەر پشتێنی دەبات و بە فیشەکێك منداڵەکە سارد دەکاتەوە.

**ب- بۆ جنێوێ، برادەرەکەی کوشت:**

✍ دوو کەس برادەری یەك بوون، بێ یەك هەڵیان نەدەکرد، ببوونە پشت و پەنای یەکدی، زۆرجار لە خانەی گاڵتە و سوعبەتەوە دەستیان لەیەك دەوەشاند، جوێنی ئاساییان بەیەك دەدا و تووڕە نەدەبوون.

ڕۆژێکیان لە شەڕە شەق و مست لێدانی یەکتر، یەکێکیان ئازارێکی زۆری پێ دەگات، هاواری لێ هەڵدەستێ و جوێنێکی پیس بەدایکی دەدات، ئەویش وایەری مێشکی شۆرتی کرد، پەلاماریداو دایە بەر چەقۆ، لەجێوە ساردی کردەوە. ( گەنجەکە لێوی پەشیمانی گەست کاتێك بیری لەو کارە خراپەی کردەوە، ئەوەش بێ مفایە)[١٠٩]

[١٠٩] – کابرایەك لەماڵەوە ژنەکەی لەگەڵ پیاوێکی نامەحرەم دەگرێ و نایکاتە نامەردی لەجێوە هەردووکیان دەکوژێ، پۆلیس کابرای بکوژ دەسگیر دەکات و حاکمیش بە رەبتی کەفیل بەری دەدات، کابراکە پارێزەرێکی زیرەك دەگرێ کە ڕاو تەگبیری بۆ بکات ، ئەویش ڕاوتەگبیری بۆ دانا کە لەڕۆژی دادگایکردنەکەیدا پێش ئەوەی بچێتە ژوورەوە، قایشی پانتۆڵەکەی داکەنێ، و بچێتە ژوورەوە، کەچووە ژوورەوە ڕووی کردە حاکم وتی: قوربان ببوورە بێ ئەدەبیەکم بەرامبەرتان کردووە دەرفەت دەدەن ئەو قایشە لەپانتۆڵەکەم بخەمەوە؟ حاکم لێی پرسی: بێ ئەدەبی وەك چی؟ وتی: ئەگەر لەقەلبت ناخۆش نەبێ پێش ئەوەی بێمە ئێرە لەلای ژنەکەت بووم، کارێکی بێ ئەدەبانەم دەرهەقی کرد.

حاکم تووڕە بوو، دەستی بۆ دەمانچەی بەرپشتی برد، دەریهێنا و سواری کرد بیکوژێ.-پارێزەرەکە لێی چووە پێش، دەستی گرت و هێوری کردەوە، پێی وت: جەنابی حاکم تۆ بەوەندە قسە ئەوها تووڕەبووی

## ✍✍✍ بەسەرهاتی سێیەم:

**توورەیی ئەهامەتی دێنێ کە ڕەش و ڕووتەکە باجی بدەن و ببنە قوربانی حەزە شێتەکان.**

**(عبدالرحمن)ی کوڕی (ابو بکرە) دەڵێ: باوکم نامەی نووسی کە من بۆم نووسی بۆ (عبیداللە ی کوڕی ابو بکرە) قازی سجستان: لەکاتی توورەییدا دادگایی دوو کەس مەکە، من لە پێغەمبەر(ﷺ)م بیستووە فەرموویەتی: ( با کەس دادگایی دوو کەس نەکات ئەگەر تووڕە بوو).[110]**

✍ لەسەدەی بیست بوو، یەك لە وڵاتە ئەوروپییەکان بەهۆکارێکەوە ڕووبەڕووی قات و قڕیی و قەیرانی دارایی هات، کاریگەری خراپ و دژواری بەسەر ژیانی هاوڵاتیانەوە دروست کرد، دزیکرد پەیدا بوو، جەردەیی و ڕێگری پەرەی سەند، لێرە و لەوێ دوکان دەبڕدرا و پیاوکوشتن بووە ئاوخواردنەوە، دام و دەزگا پەیوەندیدارەکان ڕێگە نەما نەیگرنە بەر تاوەکو بەر بەو تاوان و هەڕەشە و کوشت و بڕ و دزیکردنە بگرن، بێ سوود بوو.

سەرۆکی وڵات بابایەکی دیکتاتۆری تڕوتووڕە جیقن بوو، بەبچوکترین شت هەڵدەچوو، تەنگەتاویی لەتەقینەوەی ئەو بارودۆخە ڕاگەیاند و داوای بەپەلە کۆبوونەوەی نائاسایی ئەنجومەنی وەزیرانی کرد.

کۆبوونەوەمنیا گری دا و کۆمەڵێ پرس و ڕایان دەرخست بۆ ئەوەی کاریگەری ئەو قەیرانە کەم بکەنەوە، سەرۆکی وڵات ئەقڵی هیچ کام لەوانەی نەگرت، بەپۆزەوە وتی: لەکۆی قسەکانتان گەیشتم کە ئێوە لەئاست گەورەیی ئەم قەیرانە نین، بۆیە خۆم چارەی ئەو بارودۆخە دەکەم.

پرسیاریان لێی کرد: کەواتە چۆن دەتوانین ئارامی بۆ هاوڵاتیان بگەڕێنیتەوە؟

---

دەستت دایە دەمانچەی بەر پشتت بیکوژی، ئەی ئەگەر وەکو ئەو کابرایە کەسێك لەسەر ژنەکەت بگری ئەو کاتە چیت دەکرد؟ ئەوە سیناریۆیەك بوو ڕێکمان خست بۆ ئەوەی بزانین لەکاتی تەنگانەدا کە شتێکمان بەسەردێ، چۆن بتوانین کۆنترۆڵی خۆمان لەدەست نەدەین.. حاکمەکە نەختێ ئارام بۆوە، کابراکەی تەبریە کرد.

[110] - عن عبدالرحمن بن ابي بكرة قال: كتب ابي و كتبت له الى عبيدالله بن ابي بكرة، وهو قاض بسجستان: ان لا تحكم بين اثنين و انت غضبان، فاني سمعت رسول(ﷺ) يقول: • لا يحكم احد بين اثنين وهو غضبان).( بخاري/الاحكام/٦٧٣٩)

دایە قاقای پێکەنین و هەڵیدایێ: نامەوێ کەس قسەم لەقسە بکات و بڵێ ناڕازیم، من گەڵاڵەی پرۆژەیەکم بۆ دروست بووە ئەوەی بەم بڕیارە قایل نییە و ناڕازییە چاری دەکەم چ بەندکردن بێت یا دوورکەوتنەوە لە پۆستەکەی، گوێ بگرن بڕیارمدا: کەسێك تەمەنی لە حەفتا ساڵ یەك ڕۆژ زیاتر بێ، ئەوانە تەمەنێکیان بەڕێکردووە ناتوانن خۆیان بژێنن و بوونەتە نانخۆری جێگر، بارگرانن بەسەر دارایی وڵاتەوە، بەفەرمی هەموویان لەشوێنێ کۆ دەکەینەوە، نانێکی خۆش و بەلەزەتیان پێ دەدەین هەست بکەن لەدوا ساتەکانی تەمەنیان بەئیسراحەت نانێکی باشیان خواردووە، ئەوجا هەموویان لە دۆڵەی پێشتەوە کۆمەڵکوژ دەکەین و هەر لەوێش دەیانشارنەوە، ئەوەش بڕیارێکە و پاشگەزبوونەوەی بۆ نیە

وەزیری ناوخۆ وتی: قوربان ببوورە ئاخر ئەو بڕیارە شتێکی باش نیە.

سەرۆك ناوچەوانی لێ گرژ کرد، بانگی پاسەوانەکانی کرد و فەرمانی پێدان: دەی خێرا ئەو ترسنۆکەم بۆ ببەنە دەرەوە و بەندی بکەن.

قۆڵبەستیان کرد و بردیانە دەرەوە.

وەزیری ڕۆشنبیری بەجواب هات: قوربان منیش لەگەڵ بیرو ڕای وەزیری ناوخۆم، ئەو بڕیارە پەشیمانی و پاشگەردانی بەدواوەیە [111]

---

[111] - لە ڕۆژنامەیەکدا ئەو هەواڵەم خوێندەوە: ژن و پیاوێك لەماڵەوە سەگێکیان ڕاگرتبوو، منداڵێکیان هەبوو منداڵەکە بۆ سەگەکە بەجێ دێڵن ئاگای لێبێ کە بۆ هەندێ ئیشی تایبەت بەیەکەوە دەچنە دەرەوە.
ژن و پیاوەکە ماڵەوە بەجێ دێڵن، دوای تەواوبوونی ئیش و کارەکان کە دەگەڕێنەوە ، تەماشا دەکەن سەگەکە هەموو دەم و چاوی بەخوێنە و لەشی بریندار بووە، پیاوەکە وا دەزانێ سەگەکە منداڵەکەی کوشتووە و خواردوویەتی، لەجێوە دەست دەگەیەنێتە دەمانچە و بەچەند گوللەیەك سەگەکە سارد دەکاتەوە، سەگەکە بەڕاکردن دەچێتە ژووری منداڵەکە و لەتەنیشت منداڵەکە بۆ دواجار چاوەکانی لێك دەنێت و دەتۆپێ، ئەوانیش کاتێك چوونە ژووری منداڵەکە و تەماشا دەکەن منداڵەکەیان هێشتا زیندووە و هیچ شوێنەوارێکی برینداربوونی بە جەستەوە دیار نیە و سەگەکەیان بەرگری لە منداڵەکەیان کردووە کاتێك سەگێکی دڕندە دێتە ئەو ماڵە تا منداڵەکە بخوات و ئەو سەگەش تا دوا هەناسە لەگەڵی دەجەنگێت و هەر لەوێ ساردی دەکاتەوە.
کابرا هەست دەکات لە بڕیاردانی بەپەلەی خۆیدا تاوانێکی گەورەی ئەنجامداوە، هەر لەوێ گوللەیەك بە مێشکی خۆیەوە دەنێت و خۆی دەکوژێ.

ئەو قسانە هێندەی دیکە سەرۆکیان تووڕە کرد، بەهەڵچوونەوە: ئەوە چیە؟ واتان لێهات بە زمانی زبر، زمانتان بەرامبەرم درێژ بکەن؟ دەی خێرا ئەوەش ببەن و بەسزای بگەیەنن، فەرموو بزانم کێی تر قسەی هەیە؟

ئەوانیتر کریان چنی و دەستیان بەکلاَویانەوە گرت با نەیبات، ئەویش بڕیارەکەی واژۆ کرد، وێنەیەك لە بڕیارەکەی دایە سەرۆك وەزیران: دەی سەرۆك وەزیران تۆش هەر ئێستا دەست بەکاربە.

ئەویش بەدەسەلاَتێکی زۆرەوە یەکەم ئیش کردی، فەرمانی بە پاسەوانەکانی دا سەرۆکی وڵات دەستگیر بکەن. ئەوانیش گەمارۆی سەرۆکیان دا.

سەرۆك بە تاسەوە لغاوی دەمی ترازاند: سەرۆك وەزیران ئەوە چی دەکەی؟ تۆش دەڵێی مێشکت لەدەست داوە و شێت بوویتی؟

بەهەڵپەیەکەوە وتی: نەخێر زۆر لەسەر خۆمم، بەلاَم ئەوە تۆی بەهۆی تووڕەبوون و هەڵچوونەوە بڕیار دەدەی کە بە من دەڵێی ئەو بڕیارە جێ بەجێ بکە دەبێ یەکەمجار لەتۆوە دەست پێبکەم چونکە خۆت لەبیر چوو تەمەنت حەفتا و یەك ساڵە.

سەرۆك چاوئەبڵەق بوو، بەپەرۆشەوە وتی: ئاخر ئەوە نابێ، ناکرێ.

سەرۆك وەزیران وتی: منیش دەڵێم نابێ، ناکرێ، بۆیە ئەگەر بمانەوێ یاسا سەروەربێ و ئارامی و ئاسایش بگەڕێنینەوە دەبێ هەمووان بەیەك چاو سەیر بکەین، لەوەشدا نابێ جیاوازی لەنێوان سەرۆکێك و کەسێکی بێ دەسەلاَت یا هەژار و دەوڵەمەند بکرێ.( بڕیارەکەی بۆ یەکەمجار لەسەر سەرۆکەکە جێ بەجێ کردو توانی بەزیرەکی خۆی وڵات لەو قەیرانە ڕزگار بکات)[112]

**✍✍✍✍ بەسەرهاتی چوارەم:**

## نەرم و نیانی جێ بە تووڕەیی لەق دەکات

**📖 عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی:**

**( ئەی عائیشە، بەڕاستی خوا نەرم و نیانە و نەرم و نیانیشی خۆش دەوێت، ئەوەی لە نەرم و نیانیدا دەیبەخشێت، لە توندڕەویدا نایبەخشێت لە هیچ بارودۆخێکی**

---

[112] - پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( گوێڕایەڵی پەروەردگار بکەن گەر بە لەتە خورمایەکیش بێت، ئەو کەسەشی نەدار بوو ئەوا بە قسەی چاك و باش گوێڕایەڵی پەروەردگار بکات)( متفق علیه)

تریشدا نایبەخشێت)[113]

**عوسمان عەزیز برادۆستی برادەرێکی نزیکمە و کەسێکی خواناس و پابەند، بەسەرهاتێکی خۆی بۆ گێڕامەوە وتی:**

✍حەز دەکەم پێش ئەوەی بەسەرهاتی هەڕەتی لاویەتی خۆمت بۆ بگێڕمەوە، بەسەرهاتی کابرا سەر خڕەکەت بۆ باس بکەم، گوتیان: ڕۆژێکیان لە باخێکدا کابرایەکی پرچ ڕووتاوی سەرخڕ لەژێر سێبەری دارێکی زل و ناقۆلا دانیشتبوو، تاو نا تاوێ دەستی بەسەر سەرە خڕو لووسەکەی دادێنا، لەبەر خۆیەوە دەیوت: تاوەکو خاوەنی ئەو ئەقڵەبم، ئەو سەرە خڕەم ناشکێ.

کابرایەکی قۆشمەچی لەم ئان و ساتە بەو دەرە گوزەری دەکرد، گوێی لەو قسانە بوو، بێ ئەوەی هیچ کێشە و ناخۆشیەکی لەگەڵ کابرای سەرخڕ هەبێ، لە خت و خۆڕایی کوڵی هەستا، لەناخەوە هەڵچوو، لێی بەڕکداچوو بڕیاریدا بچێ بەگژیا و تەشقەڵەی پێ بکات کە ئەگەر دەستی کردەوە، یەکسەر سرە خڕەکەی بشکێنێ و پێی بسەلمێنێ قسەکانی تەواو نیە، ئەوە سەرە خڕەکەتم شکاند.

داهاتەوە، بەردێکی دەست دایێ، بەهەوای هەوەس تێیگرت، بەردەکەی بەقاچ کەوت، ئازاری پێگەیاند بەڵام کابرای سەرخڕ تەنها تیلەنیگایەکی کابرای قۆشمەچی دا و بۆی خنایەوە.

کابرای قۆشمەچی تەماشایەکی ئەو دەوروبەری کرد، خاکەنازێکی بەرچاو کەوت کە لەسەر زەویەکە فڕێدرابوو، دەستی دایێ، ڕێڕەوی ئاوەکەی بەلایەکی دیکە شکاندەوە، ئاوەکە لەجیاتی بچێتە بن دارەکانی کابرای سەرخڕ، بەو گۆڕە وەربوو، کابرای سەرخڕ دووبارە تیلە نیگایەکی دایێ، سەری لێ بادا و هیچی نەگوت.

کابرای قۆشمەچی بە تووڕەبوونەوە وتی: ئەوە سەر لەمن بادەدەی؟

ئەویش بەدەم زەردەخەنەیەکەوە پێی وت: بمبەخشە مەبەستم تۆ نەبوو.

کابرای قۆشمەچی نەیدەزانی چۆن لەوە زیاتر تەشقەڵەی پێ بکات، بەناچاری پێی وت: ببوورە من ئەمەم بۆ تاقیکردنەوەی تۆ بوو کە لەبەر خۆتەوە دەتوت: تا خاوەنی

[113] - عن عائشة(ر.ع) زوج النبي(ص): أن رسول الله(ص) قال: (يا عائشة، ان الله رفيق يحب الرفق، ويعطي في الرق ما لا يعطي على العنف وما لا يعطي على ما سواه).(بخاري/ الادب/٥٦٧٨).

ئەو ئەقڵەیم سەرم ناشکێ، بەڕاستی سەلماندت تاوەکو خاوەنی ئەو ئەقڵەبی، سەرت ناشکێ.

جا مامۆستا گیان: وەکو ئەو کابرا ئاسا سەرخڕە لەهەڕەتی لاوێتی دایك و باوکم بەردەوام لەسەر چەنەبازی و بێعاری لێیان دەدام، لەشم بەجارێ غارا بوو، لەگەڵ لێدانیان بەدار و سۆندە و لینگە نەعل ڕاهاتبووم، تەقەی سەرم دەهات، کە زانیان لێدان چارەسەر نیە و پێی باش نابم، وازیان لێ هێنام، باوکم بۆ لەکۆڵ خۆکردنەوەی خۆی، مێگەلە پەزێکی کڕی و کردمیە شوانی مەڕەکان، بەحیسابی خۆی منی بەستایەوە ئیتر ناتوانم سەری خۆم بخورێنم چونکە بەیانی زوو مێگەلە مەڕم بەرەو ئەو دەشت و دەرە پێش دەدا و بەرە بەری ئێوارە دەگەڕامەوە ، ئێوارەش لەبەر شەکەت و ماندوێتی خۆم نەکاتی ئەوەم هەبوو بەگژ ئەم و ئەودا بچم، نەهیچم پێ دەکرا، حەزیشم لەوە بوو کەسێك هەبێ لێم بدات، دەق خۆمم وەکو ئەو شێتەی لەمەڕ خۆمان دەهاتە بەرچاو:- لە گوندەکەمان شێتێك هەبوو ڕۆژ نەبوو منداڵانی ئاوایی لێی کۆنەبنەوە و پێی ڕانەبوێرن، بەردی تێنەگرن و لێی نەدەن، ئەویش لەتاوا زۆرجار ڕایدەکرد، زۆر جاریش دادەهاتەوە بەردێکی دەست دەدایێ، ڕایدەهاوێشت و دەکەوتە جوێندان پێیان، سەیرەکەی لەوەدابوو ئەو شێتە ئەگەر ڕۆژێك بهاتایەتە دەرەوە و منداڵێکی نەبینیایە، سەری بۆیان دەیەشا و لەشی بۆ لێدان و پێڕابواردنی منداڵەکان دەخورا، لەبەر خۆیەوە دەیوت: ئەوە ئەو گەوادانە بۆ دیارنین، بۆچی نایەنە دەرەوە؟

منیش وەك ئەو شێتە تامەزرۆی لێدان و کوتان بووم، ڕۆژێکیان بەخۆ و پەزەوە لە گوندی دەرچووم، ڕۆیشتم گەیشتمە نزیك باخچەیەکی تەلبەندکراو کە لەتەکیدا پووش و پەلاشێکی زۆری لێ بوو، مەڕم لەپووش و پاوانی کابرا بەردا، خاوەنەکەی لەدوورەوە کە چاوی بەو دیمەنە کەوت، دەستی گۆچانی لێ بەرز کردەوە، بەدەم هەڕەشەوە وتی: هۆۆۆۆی کاکی شوان، ئەوە ئەو مەڕانە بۆ دەخەیە ئەو پووش و پاوانە، ئەوە موڵکی منە؟ دەی مەڕەکانت لەو شوێنە دوورخەرە.

منیش لەشم بۆ لێدان دەخورێ، بێباکانە وەڵامیم دایەوە: بەڵێ بەڵێ باش دەزانم هی تۆیە بۆیە بەبێ منەتانە مەڕی تی دەکەم.

کابرا ڕاست بۆوە بەرەو ڕووم هات، لێم نزیك بۆوە تا هێزی دەبەدەندابوو دوو سێ گۆپاڵی خاسی لەتریقەی پشتمدا.ئەوجا وتی: خۆ ئێستا بوویە پیاو؟ هاااااا، جارێکی تر ناماقوڵی وا دووبارە نەکەیەوە؟

بە زەردەخەنەیەکەوە پێموت: بەتەمای ئەوە مەبە بەم لێدانە ئەو مەڕانە لێرە دەربکەم، چونکە من حەددو وجودت نازانم چیە، لێمدەدەی، لێمدە، من باکم بە لێدان نیە.

کابرا هێندەی دیکە دەهری بوو، گۆچانێکی تری خەواندمێ، کەوتە جنێودان: هەی تەرەس، بێ نرخ، بە کەر بڵێم هۆش ڕادەوەستێ، بەڵام تۆ لەکەر کەرتری.

منیش بۆی خنامەوە، پێموت: ئاخر کەر لەم دنیایە هەبێ ، هیچ کەرێك بە تۆ ناگات.

هێندەی دیکە ڕقیم کردەوە، بەرچاوی تاریك داهات، سێ چوار گۆچانی هێند بەهێزی لەلاقمدا، خۆم بۆ نەگیرا بوەستم، بەربوومەوە، کە وتی: هااااا، ئێستا بووی بە پیاو؟

وتم: بەڵێ بوومە پیاو، بەس تۆ پیاونی.

کابرا بەدەستمەوە گیری خواردبوو، ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا، نەختێ سەری لێ بادام، کە زمانی هێنایە گۆ : بزانە لەگەڵ کێ لێمقەوماوە؟ من لەژیانمدا کەللە ڕەقی وەکو تۆم نەدیوە، فەرموو گەردنت خۆش و ئازابێ هەتا ئێوارێ با مەڕەکانت لەم پووش و پاوانە بلەوەڕن بەس توخوا چیتر بەری دڵم مەگرە، دەترسم هەروا بڕوات لەبن دەستم دەرنەچی و بمری.

کابرا ئەو قسانەی کرد و ڕووی وەرچەرخاند، چووەوە ناو باخەکەی، منیش تا ئێوارە مەڕەکانم لەو شوێنە لەوەڕاند و بەرەبەری مەغریب مەڕەکانم پێشدا و ڕێ و ڕێ گەڕامەوە ماڵ[114]

* * *

✎ لەوەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ:

❁ **یەکەم:** تووڕەیی: گەردەلوول و ڕەشەبایەکە سۆز و بەزەیی ناناسێ و ڕووی ڕاستەقینەی مرۆڤ دەگۆڕێ کەئەگەر بەئاگایانە لەتووڕەبوونی خۆیدا تەماشای نەینۆك و ئاوێنە بکات، لە وانەیە بە تەواوی واز لە تووڕەبوون بێنێت چونکە بۆی دەردەکەوێ سەروسیماو ڕوخساری چۆن گۆڕاوە کە حەز بەبینینی خۆی نەکات.

---

[114] - تاخاوەنی ئەو ئەقڵەبم سەرم ناشکێ- ئا: شاخەوان عەلی - گ: نواڵەی نوێ-ژ۹۹ -س ۲۰۱۱ -ل۱۰

❁دووەم: بیرو هۆش لە کەللە سەری مرۆڤ دەردێنێت بەکلۆجێ بەلایەوە ئاساییە ئەوەی بێتە پێشی، دەستی لێ بوەشێنێ.

❁سێیەم: ختوکەی گیانی دەدات بڕیاری نابەجێ بدات کە لە شێنەییدا هەرگیز ئامادە نیە خۆی لەقەرەی بڕیاری وا بدات.

* * *

📖 سەرنج بدە...

✍لەم ڕۆژگارە سوێندخواردن بەگۆڕی شەهیدان و باب و باپیر و سەرکردە و پیاوچاکان و خودی فەخری کائینات بووەتە باوی سەردەم، با ئاگامان لەسوێندخواردن بێت و بزانین چۆن سوێند دەخۆن؟ پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ: ( ان الله تعالی ینهاکم ان تحلفوا بآبائکم فمن کان حالفا فلیحلف بالله (و لیصمت) رواه بخاري و مسلم.

واتە: بەڕاستی خوای بەرز لێی قەدەغەکردوون کە سوێند بەباب و باپیرانتان بخۆن، جا کێ سوێند دەخوات با سوێند بەخوا بخوات یان بێدەنگبێ.

لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ: ( من حلف بغیر الله فقد کفر او اشرك) رواه الترمذي.

واتە: هەر کەسێك سوێند بەغەیری خوا بخوات ئەوە کافر بووە یان هاوبەشی پەیدا کردووە.

دیارە سوێندخواردن بەغەیری خوا، عادەت و خوو و خدەی بێ باوەڕ و هاوبەشپەرستانە، کەواتە بەو سوێندخواردنە یەکێك لە خەسڵەتەکانی ئەوانی تێدا هاتۆتە دی، هەرچەندە مەرج نییە مرۆڤ بەخەسڵەتێکی کافران کافربێ و لەئیسلام دەرچێ، بەڵام تاوانبار و لاڕێیە.

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

﴿ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُوا۟ فَتَفْشَلُوا۟ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ ۖ وَٱصْبِرُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾ الأنفال: ٤٦

# 📖ئارامگرتن گرنگترین بنه‌مای ڕۆیشتنه به‌ره‌و خوای مه‌زن📖

✍ **ئارامگرتن: گرنگترین بنه‌مای ڕۆیشتنه به‌ره‌و خوای مه‌زن و گرنگترین سیفه‌تی پێغه‌مبه‌ران و پیاوچاکانه، پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی: ( اشد الناس بلاء الانبياء ثم الصالحون ثم الامثل فالامثل) رواه الترمذي: سنن الترمذي، كتاب الزهد، رقم٥٧**

**پێغه‌مبه‌ران له‌هه‌موو که‌سێك زیاتر تووشی به‌لاَ ده‌بن، ئینجا پیاو چاكان ئینجا هاووێنه‌ی ئه‌وان.**

**ئارامگرتن سێ جۆره: ئارامگرتن له‌سه‌ر گوێڕایه‌ڵیكردنی خودا، ئارامگرتن له‌سه‌ر گوناه، ئارامگرتن له‌سه‌ر به‌لاَ و ناخۆشی.**

✍ **ئارامگرتن: كۆكه‌ره‌وه‌ی گشت كردارێكی باشه و چاكه‌یه.**

✍ **ئارامگرتن: شاردنه‌وه و قوتدانه‌وه‌ی ده‌روون و به‌رگه‌گرتنی ناڕه‌حه‌تیه‌كانه، چونكه ئارامگرتن له‌سه‌ر ناڕه‌حه‌تیه‌كان تاقیكردنه‌وه‌ی خوای په‌روه‌ردگاره، ده‌رچوون لێی بردنه‌وه وسه‌ركه‌وتنی زامنی خۆشنوودی دنیا و قیامه‌ته.**

**پێویسته به‌ڕه‌هایی ئه‌وه بزانین كه هه‌موومان له‌به‌رده‌م ئازمایشی خوای په‌روه‌ردگارین( وما خلقت الجن والانس الا ليعبدون) الذاريات/ ٥٦ بۆیه به‌رده‌وام پێویستیمان به ئارامگرتن هه‌یه، ئه‌وه‌ش بنچینه‌ی باوه‌ڕه، چونكه باوه‌ڕ دوو وشه‌یه به‌شێكی سوپاسكردن و به‌شه‌كه‌ی تری ئارامگرتنه[١١٥]**

✍**ئارمگرتن له بێده‌نگیدایه، كه‌س له‌بێده‌نگی په‌شیمان نه‌بۆته‌وه چونكه قسه‌یه‌كی نه‌كردووه ببێته جێی ڕه‌خنه[١١٦]**

---

[١١٥] - دیزرادئیل ده‌ڵێ: نهێنی سه‌ركه‌وتن له خۆڕاگریدایه.

[١١٦] - ئه‌نیشتاین ده‌ڵێت: زۆر زیره‌ك نیم، ته‌نیا ئه‌وه‌یه كه من واز له كێشه‌كانم ناهێنم بۆیه سه‌ركه‌وتوو ده‌بم، ئایا ئێوه ئه‌وه‌نده به‌سه‌برن كه خۆتان نه‌خشه‌تان بۆ كێشاوه بۆ ئه‌وه‌ی به مه‌به‌سته‌كانتان بگه‌ن؟

✍ئارامگرتن بەری شیرینەو بەخۆداچوونەوەیە لەبەرگەگرتنمان بۆ شتە ناخۆشەکان و هەموو ئەو شتانەی تۆوی دووبەرەکی و تووڕەیی لە ناخمان دەچێنن.
✍ئارامگرتن بەر بە کەوتن و دۆڕان و لادانمان دەگرێت، دەستمان لە ژووری ڕەشبینی و خەیاڵە تاریکییەکان بەرەو دنیای ڕووناک و داهاتوویەکی گەش پەلکێش دەکات.

ئەوانەی لێوی پەشیمانیان گەستووە هەمیشە ئەو کەسانەن کە نەیانتوانیوە لەبەردەم دژواری ڕۆژگارە سەخت و هەڵوێستە نەخوازراوەکاندا ئارامبگرن، هێمنیان بە دامرکاندنەوەی کانگای تووڕەیی و ڕق و کینەی هەڵچوونیان گۆڕیوەتەوە، لەمێژووی مرۆڤایەتیدا کەسێك نابینین لە ئارامگرتن پەشیمان بێ، مەگەر ئەو کەسە هەر لەبنەڕەتەوە باوەڕی بەو چەمکە نەبووبێت[117]

لەو ڕوانگەوە بەسەرهاتەکان گەلێ زۆرن، گوڵمێك لەو بەسەرهاتانە:-
✍بەسەرهاتی یەکەم:

**لە ئارامگرتن ڕاستیەکان دەناسینەوە[118]**

---

[117] - مامۆستایەکی ئاینی لەڕۆژی هەینی وتاری دەدا: باسی ئارامگرتن و خۆڕاگری بۆ دەکردن، تا لە وتارەکەی بۆوە چەند جارێ دووپشك پێیەوەدا و ئەویش خۆی لە گوورە نەبرد و تێك نەچوو.
کاتێ وتارەکەی تەواو کرد بەپەلە کەواکەی بەری دادەتەکاند و دووپشکەکەی ناوی کوشت، وتیان: قوربان لەوە نەترسای ئەو دوو پشکە پێتیەوە بدات؟ بەدەم زەردەخەنەیەکەوە پێیوتن: نەخێر نەترسام لەکاتێکدا لەجیاتی جارێ، چەند جار پێمیەوەدا.
وتیان: بەڕاستی بوێر و خۆڕاگری، چۆن بوو هاوارت نەکرد؟.
پێیوتن: من باسی ئارامگرتنم کرد، ئەگەر بەوای ئەو دووپشکەوە هاوارم بکردبایە و ئارامم نەگرتایە، ئەو خەڵکەی دەیبینی کەسیان قسەم لێ وەرناگرن. پێم دەڵێن: تۆ کە باسی ئارامگرتن دەکەی و ئامۆژگاریمان دەکەی ئارامگرین، ئەی بۆ خۆت ئارام نەگرت؟
ڕۆژێکیان باوکێ لەگەڵ خۆی کوڕەکەی دەباتە لای خەلیفەی موسڵمانان( عومەری کوڕی خەتاب) (ﷺ) بۆ ئەوەی سەرزەنشتی بکات ئەوەندە خورما نەخوات، لەو کاتەدا خەلیفەی موسڵمانان خورمای دەخوارد، بەباوك و کوڕەکەی وت بەیانی بێنەوە.
ڕۆیشتن و بۆ ڕۆژی دواتر هاتنەوە لای، ئیمامی عومەر پێش هەر ئامۆژگاریەك، بەباوکی کوڕەکەی وت: دوێنێ بۆیە ڕەوانەی ماڵەوەتانم کرد سبەی بێنەوە،چونکە من ناتوانم ئامۆژگاری یەکێك بکەم خورما تەرك بکات لەکاتێکدا خۆم لەپێش چاوی دا خورما بخۆم؟

[118] - ئارامگرتن کەسی بوێری گەرەکە. .ڕۆژێکیان باسی کابرایەکی ئازا لەلای لوقمانی حەکیم دەکەن گوایە کەس ناتوانێ خۆی لەشان و شەوکەتی بدات چونکە زۆر جەربەزەیە. لوقمانی حەکیم سەری کاسی هەڵگرت و

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (ئەو باوەڕدارەی تێکەڵ بەخەڵکی دەبێت و ئارام دەگرێت لەسەر ناڕەحەتیەکانیان باشترە لەو باوەڕدارەی تێکەڵ بەخەڵکی نابێت و ئارام ناگرێت) (اخرجه الامام احمد)

پێغەمبەر موسا(علیه السلام) بۆ زیاتر ناسینی سیفەتی بابای ئارامگر کاتێك دەیەوێ باسی مرۆڤی خۆڕاگرمان بۆ بکات: ئاخۆ حیکمەت لە ئارامگرتن چیە؟ خوای پەروەردگار فەرمانی پێ دەدات بچێتە شوێنێك و لێی بوەستێ، هەر لەو شوێنە هەست ڕابگرێ و قسە نەکات.

پێغەمبەر موسا(علیه السلام) هەنگاو دەنێ، پەیتا پەیتا دەڕواتە ئەو شوێنەی فەرمانی پێ دەکەن. لەجێیەکی لاپەرگە دەوەستێت و دەکەوێتە چاوەڕوانی..تەماشای کرد لە دوورەوە کابرایەك پەیدابوو، هات لە لەسووچێکی ئەوناوە دانیشت، ئەوەندەی نەبرد بەدوایەوە کابرایەکی دیکە هات، کە لەو کابرایە نزیك بۆوە چووە لای، سەلامی کرد، پێکەوە دانیشتن، دوای تاوێ قسەوباس،کاتێ کابرای دووەم هەستا ئۆغر بکات، کیسەیەك زێڕی پێبوو کەلەتەنیشت خۆی دانابوو لەبیری چوو لەگەڵ خۆی بیبات و بڕوات.

پێغەمبەر موسا(علیه السلام) کە ئەمەی بینی ویستی بانگی کابرا بکات بێ کیسە زێڕەکەی بباتەوە، بەڵام فەرمانی پێکراوە نابێ قسە بکا تاوەکو لەحیکمەتی ئارامگرتن تێ بگات، بەناچاری دەمی خۆی گرت و قسەی نەکرد.

---

بەو ناونیشانەی پێیاندا، چووە لای کابرا. تاوێ دوان لای مایەوە، کاتێ کابرای جەربەزە پرسیاری ئەو هاتنەی لێ کرد، لوقمانی حەکیم خۆی پێ ناساند و بێ پەروا پێی وت: تۆ لەناو خەڵك ناوت بەکەسێکی ئازا و جەربەزە ڕۆیشتووە، هاتووم بزانم نهێنی ئەو بوێریەت لەچی دایە؟

کابرای جەربەزە پێی وت: وەرە پێش پەنجەت بخەرە دەمی منەوە، منیش پەنجەم دەخەمە دەمت، ئەوجا بەتوندی دەست بە گەستنی پەنجەی یەکدی دەکەین، دوای ئەوە نهێنیەکەت پێ دەڵێم.

پەنجەیان خستە دەمی یەکەوە، پەنجەی یەکیان گەست، کابرای جەربەزە خۆی شێلو نەکرد و تەقەی سەری دەهات، بەڵام لوقمانی حەکیم لەحەشمەتان هات و هاواری لێ هەستا.

کە وازیان لەو گەمەیە هێنا، لوقمانی حەکیم پرسی: ئەوە پەنجەی یەکمان گەست و تۆ بردتەوە، دەی ئێستا نهێنیەکەم پێ بڵێ، نهێنیە ئازایی و بوێر و جەربەزەیی تۆ لەچیدایە؟

ئەویش پێیوت: نهێنیەکە ئەو پەنجەیە بوو، لەوەدا بینیت من بەسەبربووم کەواتە ئازام و توانای ئازارگرتنم هەیە بەڵام تۆ هاوارت کرد و ئەو توانایەت نەبوو ئارام بگری.

کابراکە ڕۆیشت، کابراکەی تر کە لەو شوێنە مایەوە خەو بەرچاوی گرت، لەجێوە ڕاکشا سەرخەوێ بشکێنێ، هێندەی پێ نەچوو منالێ هات وەکو چاوی بەکیسە زێڕەکە کەوت و کابرای بینی ئەوە خەوتووە، بەهێواشی لێی چووە پێش، دەستی بۆ کیسەکە درێژکرد و بردی.

پێغەمبەر موسا(علیه السلام) دیسان ئەوە فەرمانە ناکرێ بەجواب بێت و دەنگ لەمنداڵەکە هەڵبڕێ تاوەکو ئەو دزیە نەکات، بەناچاری خۆی بێدەنگ کرد.

ئەوەندەی پێ نەچوو کابرای خاوەن کیسە زێڕ گەڕایەوە کە لەو شوێنە لەبیری کرد هەڵیبگرێ، هات بەکابرای وت: ببوورە من پێش ئەوەی لێرە بڕۆم کیسەیەك زێڕم پێبوو لەتەك خۆمم دانا، کە هەستام لەبیرم چوو لە گەڵ خۆمی ببەم، لەنیوەی ڕێ بەبیرم هاتەوە

کابرا کە تەماشایەکی دەوروبەری خۆی کردو هیچی نەبینی: ببوورە من کیسە زێڕی تۆم بینیوە و نەدەستم لێی داوە؟

وتی: درۆ دەکەی، تۆ کیسەکەمت بردووە و شاردۆتتەوە.

لێیان بووە دەمەقاڵێ، قسەیەك لەم و قسەیەك لەو، کابرای خاوەن کیسە زێڕەکە دەستی خەنجەی لێ هەڵکێشا و کابرای کوشت.

پێغەمبەر موسا(علیه السلام) دیمەن بەدیمەن ئاگای لە ورد و درشتی ڕووداوەکەیە کە ئەو کابرایە نەیبردووە و بێتاوانە نەدەبوو لەسەر کیسە زێڕێ بیکوژێت چونکە ئەو بەچاوی خۆی منداڵێکی بینی هات کیسە زێڕەکەی برد و ڕایکرد.

لەوەڵامی ئەو بەسەرهاتە بۆ ئارامگرتن کە هەندێ شت هەیە نایزانین و دەیزانین وادەزانین ڕاستە و ڕاست نیە. خوای پەروەردگار هەقیقەتی ئەو بەسەرهاتە بە پێغەمبەر موسا(علیه السلام) ڕادەگەیەنێ کە ئەو کەسەی کوژرا کاتی خۆی باوکی ئەوی کوشتوە ئەویش تۆڵەی خۆی لێ کردەوە، ئەو کیسە زێڕەی منداڵەکەش بردی، کیسە زێڕی باوکی خۆی بووە و ئەو کابرایە کاتی خۆی لەباوکی ئەوی دزیوە.

* * *

✍بەسەرهاتی دووەم:

**ئەو بەسەرهاتەی پەندە بۆ مرۆڤایەتی، پێغەمبەر ئەیوب( علیه السلام ) بە نموونە**

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( بەڕاستی باری موسڵمان سەرسوڕهێنەرە، پەروەردگار هەر بارێکی دەهێنێت بەسەردا بەخێر و چاکە دەشکێتەوە بەسەری دا،

ئەگەر ناڕەحەتی بێت ئەوا سوپاسگوزار دەبێت بۆ پەروەردگارەکەی و ئەمەش هەر بەخێر دوای دێت) (متفق علیه)

✍ پێغەمبەر ئەیوب (علیه السلام) خوای پەروەردگار ناز و نیعمەت و بەخششێکی زۆری بەسەردا ڕژاندبوو، لەو بەخششانە بوونی کوڕو کچ و زەوی و زارێکی زۆر و ئاژەڵێکی بێشومار، سەرباری ئەوەی پلەوپایەی بەرز کردەوە کردیە پێغەمبەر، ئەویش بەردەوام بەخششەکانی لەخزمەت میوان و هەژاران خەرج دەکرد وەك دەگێڕنەوە: هیچ جەمێك بێ میوان نەبووە، بەردەوام بانگەوازی بەگوێی خەڵك دەدا و ڕێگری خراپەی لێدەکردن. لەو کاتە زێڕینەی پڕ لەنازو نیعمەتدا، خوای گەورە بەلاَ و تاقیکردنەوەی گەورەو گرانی بەدوای یەکدا بۆ نارد:

ڕۆژێکیان کارگەرێك بەهەڵەداوان خۆی گەیاندە لای، پێی وت: قوربان جەردە و ڕێگر و پیاوکوژان هەڵیان کوتایە سەرمان هەرچی جوتیار و شوانمان هەبوو هەموویان کوشت وئەوەی بۆیان بردرا لەئاژەڵ و ئەو شتانە هەموویان برد.

ئەویش فەرمووی: (انا لله وانا الیه راجعون) هەموومان بۆ خوداین و هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە، خودای گەورە ویستی وایە تاقیم بکاتەوە.

ڕۆژێك دوای ئەو کوشت و بڕو تالاَنە، بەهۆی هەورە بروسکەوە کێڵگەی دانەوێڵە و کشتوکاڵەکەی گڕی گرت، هەموو ڕەزەکەی سوتاند.

هێندەی نەبرد، ئەوجارەیان خانوو بەسەر مناڵەکانی دا ڕووخا، هەموویان کەوتنە ژێر خانووەکە و مردن، ئەوەی لەوەشیاندا گەلێ دژوارو پڕسوێتر بوو، جەستەی لێری لێهات و تووشی بەڵەکی بوو، بەجۆرێ لەسەر ڕوومەتی دەردەکەوت خەڵکەکە خۆیان لێی بەدوور دەگرت، تەنها هاوسەرە بەئەمەکەکەی لەلادا مایەوە خزمەتی دەکرد.

هەموو ئەو شتانە لە سووتانی ڕەزو باخ و بەتالاَچوونی ئاژەڵ و مردنی منداڵەکانی بیروباوەڕی هێندەی دیکە پتەوتر کرد کە ئەوە تاقیکردنەوەی خوای گەورەیە و لەو ڕوانگەوە هانی هاوسەرەکەی دەدا ئەویش لەئاست ڕووداوەکاندا خۆڕاگرو ئارامگربێ.

کە پێغەمبەر ئەیوب(علیه السلام) بەهۆی ئەو نەخۆشیەوە توانای ئیش و کارکردنی نەماو بەیەکجاری پەکی کەوت، هاوسەرەکەی ناچاری کارکردن بوو لە ماڵان و ژیانیان ڕۆژ بەڕۆژ سەخت و دژوار دەبوو، کە بەناچاری پرچی خۆی فرۆشت تا نانی پێ بکڕێ و بیخۆن، ئەو دیمەنە پێغەمبەر ئەیوبی دڵگران کرد و لەهاوسەرەکەی زویر بوو،

ڕووی لەئاسمان کرد و وتی: خودایە، ئەی بەئاگا لەحاڵی بەندەکان، من دووچاری زەرەرو زیان هاتم، تۆ میهرەبانی و هەموو کارەساتێك لەژێر چاودێری و زانیاری تۆدایە، ئێمە لاوازین و تۆش بەسۆز و توانای، خۆت دەزانی چی باشە و چی لەبەرژەوەندی ئێمەدایە.

خوای پەروەردگار فریشتەی ناردە لای، پێی وت: داواکەت لای خودا قبوڵ بووە و پاداشتی خۆڕاگریت بۆ نووسراوە، دەی پێت بەزەوی دابدە، لەو ئاوە سازگارەی هەڵدەقوڵێ، جەستەتی لێ بشۆ و لێی بخۆوە، پێستت لە بەڵەکی ڕزگاری دەبێت و چاك دەبیەوە.

ئەیوبی ئارامگر ئەوەی ئەنجامدا و چاك بۆوە، بەروبوومەکەیشی جارێکی دیکە دەرکەوتن و گەشانەوە، وەکو دۆخی جاران باری دارایی بۆ گەڕایەوە ، هاوسەرەکەی کە بەهۆی نیگەرانی و دڵتەنگی ئەیوبەوە لێی دوورکەوتبۆوە، گەڕایەوە لای، بەبینینی نەیناسییەوە کە کەسێکە ئێستا تەندروستیەکی باش و پێستێکی پاك و خاوێن و ڕووخسارێکی گەش و نوێی هەیە، هەواڵی ئەیوبی لێپرسی، وتی: من ئەیوبم.

دیمەنەکە سەرسامی کرد، ئەویش پێی فەرموو کە لەهەمان سەرچاوەی ئاو خۆی بشوات و ئاوەکەی بخواتەوە، بەو شێوەیە هەردوکیان گەڕانەوە تاف لاوێتی و خوای گەورە دووبارە منداڵی پێ بەخشینەوە، ئەوەش پاداشتی پشوودرێژی و خۆڕاگری بوو بەرانبەر بە دەرد و بەڵا و تاقیکردنەوەکانی خوای پەروەردگار.

*    *    *

✍✍ بەسەرهاتی سێیەم:

## ئارامگرتن لەشەڕوشۆمان دەپارێزێت

✎ یادی بەخێر ( کازمی مام مارف) برادەرێکی گیانی بەگیانی سەردەمی منداڵیم بوو، پێکەوە لەیەك قوتابخانە و یەك پۆل دەمانخوێند.

تەمەنی پێنج ساڵان بوو، لە شەڕە بەردی گەڕەکی (سەربەستی) و (ڕزگاری)، بەردێك بەچاوی دەکەوێ، چاوی ڕاستەی لەدەست دەدا و نابینای دەکات.

(عەزین ناوێ هەبوو منداڵێکی بزێوی چەتوون و چەنەباز بوو، ئامۆژگاری کەسی وەرنەدەگرت، کازمی مام مارف کردبووە بنێشتە خۆشەی سەر زاری، بەبانگ کردنی (کازە کوێر) هەستی بریندار دەکرد، بەڵام کازم ئەوەندە هێمن بوو، بەرگەی هەموو

قسه‌یه‌کی ده‌گرت ، ڕقی خۆی ده‌خوارده‌وه و خۆی شێلوو نه‌ده‌کرد وه‌کو ئه‌وه‌ی هیچ نه‌بووبیٚ.

گاڵته‌جاڕییه‌کانی عه‌زیز درێژه‌ی کێشا تا ڕۆژێکیان له‌گه‌ڵ باوکی به‌سه‌یاره‌وه به‌ره‌و هه‌ولێر ده‌ڕوات، له‌نیوه‌ی ڕیٚ تایه‌یان ده‌ته‌قیٚ و سه‌یاره‌که وه‌رده‌گه‌ڕیٚ، باوکی به‌سووکی زامدار ده‌بیٚ و عه‌زیزیش چاوی ڕاسته‌ی له‌ده‌ست ده‌دات و نابینای ده‌کات.

له‌و ڕۆژه‌وه که ده‌هاته ده‌ره‌وه ڕووی ئه‌وه‌ی نه‌بوو گاڵته به‌ئه‌قڵی کازم و ئه‌م و ئه‌و بکات، ئه‌وجاره‌یان خۆی بووه گاڵته‌جاڕی ده‌ستی ئه‌م و ئه‌و، به (عه‌زه کوێر) بانگیان ده‌کرد، ئه‌ویش هێنده بیٚ ئۆقره بوو، ڕقی ده‌بۆوه ده‌ستی ده‌وه‌شاند، ئه‌وه‌ی به‌رچنگی بکه‌وتبایه‌ته ، وه‌رده‌گه‌ڕایه سه‌رو گوێلاکی و لێی ده‌دا.

ڕۆژێکیان من و کازم به‌یه‌که‌وه وه‌ستابووین قسه‌ی خۆشمان ده‌کرد، عه‌زیز هاته لامان و به‌کزۆڵیه‌وه ڕووی کرده کازم و داوای لێبوردنی لیٚ کرد، وتی: من سه‌رسامم به‌هه‌ڵسوکه‌وته جوانه‌کانت، تۆ که‌سێکی خۆڕاگر بووی بزانه ئه‌و هه‌موو قسه‌یه‌م پیٚ وتی، خۆت تێك نه‌ده‌دا، نازانم حیکمه‌ت چییه ئێستا ئه‌و خه‌ڵکه هه‌مان ئه‌و قسانه‌م پیٚ ده‌ڵێن، ناتوانم دان به‌خۆما بگرم، ده‌ست ده‌وه‌شێنم، جنێوی پیس ده‌ده‌م، به‌مه‌یش ئه‌وان هێنده‌ی دیکه گاڵته‌م پیٚ ده‌که‌ن و پێمڕاده‌بوێرن.

ئه‌ویش به‌ده‌م زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌که‌وه پێیوت: له‌هه‌ر شتێك ئارام بگرین، ئارامگرتن له‌شه‌ڕوشۆمان ده‌پارێزیٚ.

* * *

ئیمامی عه‌لی(ﷺ) ده‌ڵێت:

له دوو قسه‌دا که دژی یه‌ك بوون، ناحه‌قی له یه‌کیاندا خۆی ده‌رده‌خات، چونکه حه‌ق یه‌که.

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

﴿ وَيَٰقَوْمِ ٱعْمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَٰمِلٌ سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَمَنْ هُوَ كَٰذِبٌ وَٱرْتَقِبُوٓاْ إِنِّى مَعَكُمْ رَقِيبٌ ﴿٩٣﴾ ﴾ هود: ٩٣

## 🕮 کامێرای چاودێری ژنێکی بەتەڵاقداندا!!

✍ئێوارەیەکی درەنگ، دەتوانم بڵێم کاتی ئەوەبوو بچیە سەرجێ و لێی بخەوی. ڕاکشابووم، خەواڵوو ببووم، چاوەکانم نابوونە سەر یەك خەو بۆ خۆیم بباتەوە، کتوپڕ لە زەنگی تەلەفۆنەکەیماڵەوە ڕاچڵەکیم، چاوەکانم کردنەوە، ترس هەوزەڵی بۆ هێنام، ترسام شتێکی ناخۆش لەو خزم و ئەو خزم ڕوویدابێ. بەپەلەپرووزێ خۆم گەیاندە تەلەفۆنەکە و هەڵمگرت: ئەلو.

هاوڕێیەکی خۆشەویستم بوو: ئەلو ئەوە منم، ئەرێ لەماڵەوەی؟!

وتم: بەڵێ، خێرە بەم شەوە تەلەفۆن دەکەی؟ هیچ بووە؟!

وتی: ئەوە دێم و لەوێ هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم.

بەبێ خواحافیزی تەلەفۆنەکەی لەڕوو داخستم و منیش بەدوایەوە تەلەفۆنەکەم داخست، چووم لەهۆڵی دانیشتن لەسەر یەك لەکورسیەکان دانیشتم ، کەوتمە چاوەڕوانی، ئەوەندەی نەبرد لە جەرەسی دەگای دا، خۆم گەیاندێ و دەرگاکەم لێی کردەوە، تەماشام کرد لەسەروسیما و ڕوخساریدا شڵەژان و پەشۆکی پێوە دیار بوو، فەرمووی هاتنە ژوورەوەم لێی کرد.

ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا، بێ سەلام و کەلام بەپێشم کەوت و بۆ سەرەوە هەڵکشا تا لەهۆڵی پێشوازی لەسەر یەك لەکورسیەکان دانیشت.

چووم گلاسێ ئاوی ساردم خستە سەر سینیەك و لەپێش دەمی داچەمامەوە، ئاوەکەم بۆی ڕاگرت، ئەویش بەقووڵی تێمڕاما، بەدەستێکی لەرزۆکەوە دەستی گەیاندە گلاسەکە و بەیەکبێن هەموو ئاوەکەی هەڵلوشی و گلاسەکەی لەسەر سینییەکە دانایەوە.

کە سینییەکەم لەسەر تەپڵەکی نێو هۆڵەکە دانا، بەهێواشی چووم لەتەکیەوە دانیشتم، ڕووم بەلایدا وەرچەرخاندو وتم: یاخوا بەخێربێی، وەکو مـــن بتخوێنمەوە

شتێکت لێ قەوماوە، بڵێ بزانم چ ڕوویداوە؟

ئـەویش تفـی گـەرووی قووتـدا و بەتەوسـەوە سـەیری کـردم و بەشـڵەژاویەوە وتی:ئەمڕۆ ژنەکەم تەڵاقدا.

موچڕکەیەکم بەلەش داگەڕا، بەهەڵپەیەکەوە پێموت: شوکر خێزانەکەت تا بڵێـی خزمدۆست و بەئەدەب بوو، ڕێـزی هـەموو کەسێکی دەگرت، خـۆ ئەگـەر هەڵەیـەکی کردبێت وشتێکی لەدەست قەومابێ، تووڕەبوون لەسەر شتی بچووك حەوجە بەوە دەکات تەڵاقی بدەی؟

هەناسەیەکی هەڵکێشا و زمانی گەڕاند: خۆزگە سەد خۆزگە هەر ئەو شتە بچووکانە بوایە.

لێمپرسی: من هەر بیرم بۆ ئەو شتانە دەڕوا، دەقسە بکە بزانم چی کردووە؟

وتی: ئەوەی ئەمڕۆ بینیم دەتوت خەوە! بڕوا دەکەی لەنیوەڕۆوە مێشکم بەو باسەوە خەریکماوە، خەریك بوو لەداخان بتەقم و لەپێستی خۆم دەربچم، ڕەنگە باوەڕ نەکەی چەند جارێ ئەوەم بەخەیاڵ داهات خۆم بکوژم و کوشتنی خۆم زۆر بەلاوە باشتربوو نەك ئەو شتە ببینم.

بەحەپەساویەوە پێموت: سەیرە، ئێ ئەو شتە چی بوو؟

وتی: تۆ ئاگاداری ئـەوەی بەهـەمووی دوو مـانگ دەبێ و نـابێ سـەیارە (هۆنـدا)کەم فرۆشـت و لەنۆژەنـدا سـەیارەیەکی (کیـا)م کـڕی، بـەحوکمی ئیشـەکەم بـەو سـەیارەیە ئەگەر زۆر ماندووبوومایە پێی دەچوومە دوکان و دەهاتمەوە، وەئەگینا هەر لەماڵـەوەم ڕاگرتـووە و بـەپێیان هاتوچۆ دەکـەم. دوێـنێ تەلـەفۆنم بـۆ خـاوەنی (کیـا)کـە کـرد بـۆ سبەی کە دەکاتە ئـەمڕۆ بەڵکو لەگـەڵم بێتـە دایـەرەی مـروور و سـەیارەکەی بەناومـەوە بکەم، کە هات منیش فایلم کڕی لەگەڵ هەندێ لە پێویستیەکان، چەند ژوورێکیان پێ کـردم، کاتێـك فـایلم بـردە بەشـی سەرپێچـیەکان، تاسـام کـە مفەوزەکـە ژمـارەی سەیارەکەمی لەکۆمپیوتەرەکەدا و وتی: لەماوەی ئەم مانگـەدا سێ سەرپێچیت لـەڕێی دەرەوەی شار ئەنجام داوە.. سـەیرم پـێ هـات، بەهەڵپەیەکەوە پێموت: کاکەگیان ئـەو ژمـارەت بەهەڵـە لێـداوە مـن لەوەتـەی ئـەو سـەیارەم کڕیـوە هـەتا ئێسـتا نەمبردۆتـە دەرەوەی شـار، مەگـەر چۆن دەنـا هـەر لەماڵـەوە ڕامگرتـووە، منداڵی گـەورەم نیـە بڵێم ئەوان بردبێتیانە دەرەوە، خێزانیشم ئەئیجازەی هەیە و نە هیچ لە سایەقی دەزانـێ تاوەکو بڵێم ڕەنگە ئەو سەیارەی بردبێتە دەرەوە..کابرای مفەوەز وتی: من لەخۆمەوە

قسە ناکەم ئەوە کۆمپیوتەرە و کۆمپیوتەر غەلەت قبوڵ ناکات، کامێرای چاودێری وێنەی سەیارەکەی گرتووی کە لە چ کات و شوێن و بەخێرایی چەندیش ڕۆیشتووە.

پێم سەیر بوو وتم: دەترسم بەهەڵە وێنەی سەیارەیەکی دیکەتان گرتبێ؟

دایە قاقای پێکەنین و وتی: یەك خولەك، ئێستا ڕەسمەکانت نیشان دەدەم..

لەجێوە ڕەسمەکانی ڕاکێشا و بۆی ڕاگرتم: فەرموو ئەوەش ڕەسمەکان

.ڕەسمەکانم لەدەستی وەرگرت و لێی وردبوومەوە تەماشام کرد، قسەکەی تەواو بوو، ڕاستی دەکرد، لەسەیارەکەدا زەلامێکی نەدی و نەناس لەشوێنی سایەق و ژنەکەیشم لەتەنیشتیەوە دانیشتووە، ئەوجا بۆم دەرکەوت ئەو ڕۆژانەی تەلەفۆنم بۆی دەکرد و دەموت: چاوەڕێم مەبە نیوەڕۆ نایەمەوە، یان بەئێشەوە دەردەچم و دەچمە موسڵ ڕەنگە بۆ شەو لەوێ بمێنمەوە، چوزانم ژنەی چەمبەریم ئەوەی بەدەرفەت زانیوە لەگەڵ چاوبزربوونی مندا یەکسەر تەلەفۆنی بۆ ئەو زەلامە کردووە و ئەویش هەر بەو سەیارەی من ئەوی بردۆتە دەرەوەی شار، بزانە بردویەتیە چ چۆڵەوانیەك و لەگەڵیدا ڕابیواردووە، نەمتوانی بەرگەی ئەو بارودۆخە بگرم، تەواوی ڕەسمەکانم خستە ناو فایلێکەوە و بەخاوەنی سەیارەکەم وت: قوربان تەلەفۆنێکی بەپەلەم بۆ هات، براکەم مردووە، ئەگەر لێم ببووری لە دەرفەتێکی دیکەدا پەیوەندیت پێوە دەکەم و ئیشەڵلاّ کارەکانی بەناوکردن تەواو دەکەین، ئەویش وتی: کێشە نیە برا، هەر خۆتان سەلامەتبن، کەی حەزت کرد تەلەفۆنێکم بۆ بکە یەکسەر دێم و سەیارەکەت بەناو دەکەم.سوپاسیم کرد و گەڕامەوە ماڵ، ئاگرم لەناوچەوان دەباری کاتێك ڕووم کردە ژنەکەم و وتم: ئافرەت تۆ دەزانی غەرامەیەکی زۆر کراوم، خۆ کەس ئەو سەیارەی نەبردۆتە دەرەوە؟ ئەویش ڕەنگی دەموچاوی زەرد هەڵگەڕا، بە زمانێکی پچڕ پچڕەوە وتی: ن...ن...نە...نەخێر کەس ئەو سەیارەی لێ نەخوڕیوە، من شۆفێری نازانم تا بیبەمە دەرەوە و لێی بوخڕم.. کە وتم: قەت کەس نەیبردۆتە دەرەوە با تۆش سایەقی نەزانی یەکێکی دیکە هاتبێت و بۆی هاژووشتبێ؟ بەدەم زەردەخەنەیەکی درۆزنەوە وتی: ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی، لەوەدەچێ متمانەت بەمن نەبێ؟ من دەڵێم سایەقی نازانم و دواتر چۆن لێ دەگەڕێم کەس بێپرسی تۆ سەیارە بباتە دەرەوە.

هەمان پرسیارم لێی دووبارە کردەوە، تەماشام کرد بەوپەڕی تووڕەییەوە پێمدەڵێ: بە چلو چوار هەزار پێغەمبەر سەیارەم نەبردۆتە دەرەوە، تەواو خۆ ئێستا بەو سوێندە دڵت داکەوت؟ لەحەشمەتا خەریك بوو بتەقم، بەرك و قینەوە ڕەسمەکانم نیشانیدا :

دەی جوان سەیری ئەم وێنانە بکە، وەرە پێم بڵێ ئەو زەلامە کێیە؟ دەمی وەك تەڵەی تەقیوی لێ هات، تا کەف و کوڵی خۆمم دامرکاندەوە بە لینگە نەعل وەرگەڕامە سەری، ئەوجا سێ بە سێ تەلاقیم دا و لەماڵەوەم دەرکرد، ئێستاش کە هاتمە ئێرە زۆر دڵم توند بوو نەمدەزانی چیبکەم.

ئەو بەسەرهاتە لەناخەوە منی هەژاند، پێموت: تازە هەرچییەك بکەی کار لەکار ترازاوە، وا باشە بەزیرەکی خۆت مامەڵە لەگەڵ ڕووداوەکە بکەیت.

پێکەوە تا وەختانێکی درەنگ دانیشتین، گەلێ دڵیم دایەوە، زۆریشم لێی کرد ئەو شەوە لەماڵمان بمێنێتەوە، بەڵام سووربوون لەسەر ڕۆیشتنەوە و ڕۆیشت..هەر دوای ئەوە چوومە سەر جێگەکەم و بەر لەنووستن بیرم لەو ڕووداوە دەکردەوە، دەموت: کامێرای چاودێری ئەو شتە بچووکانە کەشف دەکات، ئاخۆ مرۆڤ لەبەردەم کامیرای ئیلاهی چ جوابی خۆی دەداتەوە لەکاتێکدا ورد و درشتی تاوانەکان دەگرێت.

بەدەم ئەو داڵغانەوە ئەو شەوق و جۆش و خرۆشەم نەما، وردە وردە پێڵوی چاوانم گران داهات، ئاگام لەخۆم بڕا، نەمزانی کەی و چۆن خەو بۆ خۆی ڕاکێشام[119]

*      *      *

حەسوودی وەکو مێش وایە، هەر شوێنێك لە
جەستەت ساخ بێت واز لەو شوێنە ساخانەت
دێنێ و بە برین و زامەکەتەوە دەنیشێت.
(چایمەن)

---

[119] - ئا: شاخەوان علی- گ: نوالەی نویَ-ژ:١٠٨-س:٢٠١٢- ل١

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُوا۟ مِمَّا فِى ٱلْأَرْضِ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ ﴾ البقرة: ١٦٨

# شەیتان چاکە دەکات؟

**بەسەرهاتی یەکەم:**

## شەیتان چاکەی لێ ناوەشێتەوە[١٢٠]

**ئەم فەرموودەیە بەجۆرێ کار لەناخ و هەست و نەستی ئەو هاوەڵە بەڕێزە دەکات، نە گەرما و نەسەرما ڕێی مزگەوتی لێ ناگرێت، بەردەوام نوێژەکانی بە جەماعەت دەکات.**

**بەیانییەکی تووشی باوبۆرانی زستان بوو، کاتێك لەخەو بێدار دەبێتەوە، دەست نوێژێکی جوان دەگرێ، لەگەڵ بیستنی بانگی بەیان لەماڵەوە دەردەچێ، باران بەلێزمە دەبارێ، بەڵام تەڕبوونی لەش و سەرماو سۆڵی کاتەکە لەچوونە مزگەوتی پاشگەز نەکردەوە، هەنگاو هەڵدەگرێ، لەڕێگەدا کتوپڕ دەکەوێتە چاڵێکەوە، قوڕاوی دەبێت. کە هەڵدەستێتەوە هەڵوێستی خۆی ناگۆڕێ، بیر لەوە ناکاتەوە مادام جلەکانی بەری بەقوڕ بووە ڕووەوەربگێڕێ و بگەڕێتەوە، لەسەر ڕۆیشتنی بۆ مزگەوت سوورەدەبێ تا لەوێ نوێژەکەی بەجەماعەت بکات، لەو کاتەدا گەنجێك دەستی دەگرێت دەیگەیەنێتە مزگەوت، ئەوجا پێی دەڵێ: فەرموو نوێژەکەت بکە.**

**کابرای نابینا نزای خێری بۆ دەکات و پێی دەڵێ: ئەی گەنج تۆ کێی؟ ناوت چیە؟ حەز دەکەم بتناسم؟**

**ئەویش وەڵامی دایەوە: کاکە بڕۆ نوێژی خۆت بکە، واباشە هەر نەمناسی!**

**ئەویش وتی: ئاخر هەر دەبێ بتناسم، دەی پێم بڵێ تۆ کێی؟ ناوت چیە؟**

**ئەویش لەوەڵامدا کە پێی وت: دەی کە حەز دەکەی بمناسی، من شەیتانم.**

---

[١٢٠] - وتیان کابرایەکی گێل پرسیار لەمامۆستایەکی ئایینی دەکات، پێی دەڵێ: مامۆستا ئەرێ شەیتان ژنی هەیە؟

ئەویش لەوەڵامدا پێی دەڵێ: وەڵا لە زەماوەندەکەی ئامادەنەبووم تاوەکو بزانم ژنی هەیە یان نا؟

کابرای نابینا دەمی بەشبۆوە: چیییی؟

وتی: چ چی؟ من شەیتانم، شەیتان.

کابرای نابینا بە تەوسەوە لێی پرسی: سەیرە من قەت نەمبیستووە شەیتان چاکە بکات، دەڵێن: هەرگیزچاکە لە شەیتان ناوەشێتەوە، ئەی بۆ دەستت گرتم؟

وتی: تۆ کە لە ماڵ هاتیە دەرەوە باوبۆران دەستی پێکرد، دڵخۆش بووم بەوەی کە ڕەنگە یەکسەر بگەڕێیەوە بڵێی سەرمام ببێ نەخۆش دەکەوم و جلەکانیشم تەڕ دەبن، بەڵام هەر هاتی، کاتێك کەوتیە چاڵەکە، دیسان دڵخۆش بووم وتم وا کەوتە ناو ئەو قوڕاوە بێشك جلەکانی پیس بووە و دەگەڕێتەوە، بەڵام هەر نەگەڕایەوە، بەناچاری دەستم گرتی بەسەلامەتی بتگەیەنمە مزگەوت، چونکە تۆ کە لەپێناوی خودا هاتی و کەوتیە چاڵەکەوە، خودا لەهەموو گوناهەکانی ڕابردووت خۆش بوو، بۆیە دەستم گرتی چونکە ترسام ئەوجارە بکەویت، خوا لە هەموو گوناهەکانی داهاتووت خۆش ببێ، بۆیە نەمویست ئەو قازانجەت پێ بگات، بۆ من زەرەر لەنیوەی بگەڕێتەوە قازانجە.

* * *

✍✍بەسەرهاتی دووەم:

بینینی شەیتان لەخەویش زەرەرە...

لە (براء)ی کوڕی (عازب)ەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕنەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا فەرمووی: (ئەی فلان، هەر کات چوویتە سەر جێگەکەت بڵێ: پەروەردگارا نەفسی خۆم بەتۆ سپاردووە و، هەموو کاروبارەکانم داوەتە دەستی تۆ، پەناو پشتیشم هەر بە تۆیە، هیچ پاسێر و ڕزگارکەرێك نییە بگەڕێمەوە بۆ لای خودی تۆ نەبێت، خوایەگیان باوەڕم بەو کتێبە هێناوە کە بۆت ناردووم و لەگەڵ ئەو پێغەمبەرەی ڕەوانەت کردووە، خۆ ئەگەر ئەو شەوە مردیت ئەوا لە پاکی و خاوێنی مردوویت، ئەگەر مایت و ڕۆژت لێ بوویەوە خێرت دەبێت بەنسیب) (رواه بخاري و مسلم)

🕮 برادەرێکم بۆی گێڕامەوە وتی:

✎ شەیتان هەر بەڕۆژی ڕووناك و لەئاگایی مرۆڤ کاری نابەجێ ناکا، بگرە لە خەویشدا بیبینی هەر نەگبەت و بەدفەڕییە.

کە وتم: چۆن؟

وتی: شەوێکیان نووستبووم، کەوتمە خەوێکی قووڵەوە، خەونم بینی لەجێگایەك بووم حەشاماتێکی زۆری لێ خڕببوونەوە خەریکی زیکر و یادی خوا بوون، خێریان لەپێناوی خوا دەکرد.. نازانم چۆن بیرۆکەیەکی بۆگەنم بەمێشك داهات هەڵگەڕامەوە کەوتمە خێرکردن بۆ شەیتان ، هەر لەو بیرۆکەدا بووم هێندەم زانی کەسێك لەبەردەمم قوتبۆوە، وتی: ئەوە بەتەمای چی؟ لێرە چی دەکەیت؟

وتم: بڵێم چی؟ من کەسێکی جیاوازم، جیاواز لەو خەڵکەی ئێرە کە هەموویان خێر لەپێناوی خوا دەکەن، من لەپێناوی شەیتان خێر دەکەم.

وتی: دەنە ئەو کەسەی خێری بۆ دەکەی، ئەوە منم.

وتم: تۆ کێی؟ بۆچی ناتناسم؟

وتی: هەموو دنیا من دەناسێ، کەس نیە نەمناسێ، من شەیتانم شەیتان.

وتم: ئەی بۆچی ئەوها لەناکاو دەرکەوتی؟

وتی: هەر کە ئەو بیرۆکەت بەمێشك داهات، وتم تاوەکو زووە پاداشتی بە چاکەیەی بدەمەوە.

وتم: جا پاداشتی تۆ بۆ من چییە؟ دەتەوێ چ پاداشتێکم بدەیتەوە؟

وتی: وەرە بکەوە دوام گەنجینەیەکت نیشان بدەم و پێتی بدەم، ئیدی هەتا ماوی بۆ خۆت بحەسێیتەوە.

وتم: گەنجینەکەت چی یە؟

وتی: ئەوەندە پرسیارم لێ مەکە، وەرەو بکەوە دوام، ئێستا دەتبەمە شوێنێ کوپەیەك لیرەی لێ حەشار دراوە، کوپە لیرەکەت پێ نیشان دەدەم کە بەو گەنجینە وەها دەوڵەمەند ببی، بەژیانی خۆت نەبوونی نازانی چییە!

لەخۆشیان پێم زەوی نەدەگرت، کەوتمە دوای شەیتان، هێندە دڵخۆش ببووم نەبێتەوە.

ڕۆیشتین و گەیشتینە دەشتاییەك، لەنزیك سێ کۆمەڵە خۆڵ وەستاین، شەیتان دەستی بۆ یەك لە کۆمەڵە خۆڵەکان درێژکرد، وتی: ئێستا شەوە، ئێرەش نەختێ تاریکە بەڵام دەتوانی سبەی بێیەوە ئێرە و گەنجینەکە لەژێر ئەو کۆمەڵە خۆڵە دەربێنی، هاااااا، ئامۆژگاری من بۆ تۆ ئەوەیە ئەگەر هەڵە بکەیت لە هەڵکۆڵینی ئەو کۆمەڵە خۆڵە، ئەوا ناتوانی دوو کۆمەڵەکەی تر هەڵکەنی.

کە تەماشای هەر سێ کۆمەڵە خۆڵەکەم کرد وەکو یەك بوون، پێموت: شەیتانگیان چارەم چیە؟ چیبکەم بۆ ئەوەی ئەگەر بەیانی هاتمەوە ئێرە بزانم گەنجینەکە لەژێر کامە کۆمەڵە خۆڵدایە و شوێنەکەم لێ تێك نەچێ؟

شەیتان حریت حریت پێکەنی و وتی: تەنها یەك ڕێگەچارەت لەبەردەمە، ئەویش ئەوەیە شەرواڵی بەرت داکەنی و (پیسایی) لەسەر بکەیت.

ستایشی قسەکانیم کرد : بەڕاستی هەموو بیرۆکەیەکی تۆ جوان و پڕ حیکمەتن، بەڕاستی شەیتانی، سوپاست دەکەم شەیتانگیان.

وتی: دەی ئێستا کاتی ئەو قسانە نییە، خێرا شەرواڵەکەت داکەنە و پیسایی لەسەر بکە.

منیش دۆخینی شەرواڵەکەم کردەوە و دامکەند، هەڵقونجام، تین و تاوم دایە بەرخۆ پیسایی لەسەر بکەم، وەلێ ئەفسووس لەتەڕایی ژێر خۆم بەخەبەر هاتم، سەیرم کرد پیسایم بەخۆما کردووە، هەزار و یەك جار شەیتانم بەنەعلەت کرد، بەو شەوە ساردە، بەدزی ماڵەوە خۆم خزاندە حەمام و بەئاوی سارد خۆم پاککردەوە، دوای خۆ گۆڕینم بەهێواشی چوومەوە سەر جێیەکەم و لێی نووستمەوە[١٢١]

* * *

---

[١٢١] - کابرایەکی خواناس لەژێر سێبەری دیوارێك نووستبوو، دیوارەکە لار ببۆوە بەسەریدا بکەوێت، شەیتان بەخێرایی بەخەبەری هێناو پێی وت: هەستە دەی هەستە ئەم دیوارە خەریکە بەسەرت بڕوخێ.
ئەویش لەشوێنەکەی خۆی هەستا و نەختێ لەو شوێنە دوورکەوتەوە، ئەوەندەی نەبرد دیوارەکە داتەپی .
کابرای خواناس وتی: تۆ کێی؟ بۆچی ناتناسم وا ئەو چاکەیەت لەگەڵدا کردم؟
وتی: من شەیتانم.
کابرای خواناس وتی: چۆن بوو یارمەتی منتدا لەکاتێکدا من ڕۆژ نییە بەسەدان جار بەنەعلەتت نەکەم؟
شەیتان وتی: ئەوە چاك دەزانم، بەڵام ترسام ئەو دیوارەت بەسەردا بڕمێت شەهیدبی.

# من پیاوی صولحبم، چۆن پارە وەردەگرم!

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: ( جوبرەئیل (روح القدس) نیگای بۆ هێنام و پێی ڕاگەیاندم: هیچ نەفسێك نامرێت و گیان ناسپێرێ هەتا ئەجەلی نەیەت و تەواو ڕزق و ڕۆزی خۆی نەخوات، بۆیە گوێڕایەڵی خودا بکەن و بەجوانترین شێوە دوعا و پاڕانەوە بکەن) (ابو نعیم لە (الحلیة)دا گێراویەتیەوە)[١٢٢]

ئەگەر کەسێك بیەوێ ئامۆژگاری یەکێك بکات، دەبێ هەر قسەیەك بیکات ئەو قسانە لەخۆیدا بەرجەستە بووبن و لەخۆیدا ڕەنگیاندابێتەوە.. بابای جگەرەکێش ناتوانێ ئامۆژگاری منداڵەکەی بکات جگەرە نەکێشێ تا خۆی جگەرەی بەدەمەوەبێ، بۆ شتەکانی تریش بەهەمان شێوە.

مرۆڤە بەهەڵوێستەکان لێرە و لەوێ زۆرن، زۆرانگەلێکمان هەن قسەکانیان وەکو نەخشی سەر بەرد وایە، نەشتەر ئاسا جێی خۆیان لەسارێژی زامەکان دەگرن ، لەدیدەنیەکدا کاك تاهیر مستەفا* ڕووداویکی ڕاستەقینەی بۆ گێرامەوە:



حاجی (خدر حەمەد) لەدایکبووی ساڵی ١٩٢٧، کەسایەتیەکی دیار و بەرچاوی سنووری قەزای کۆیە بوو، تاوەکو لەژیاندا بوو، ڕۆڵی جوامێرانەی لەچارەسەرکردنی زۆر لەو کێشانە دەبینی کە ڕوو بەڕووی دەبۆوە و ڕوویان لێی دەنا، ئەفسووس لە ٢٠٠٤/٢/٤ کاتێك دەیەوێ لە جادەی سەت مەتری نزیك لەنگەی ئێستا (لەهەولێر) بپەڕێتەوە و بچێتە پرسەی ناسیارێکی، سەیارەیەك خۆی پێدا دەکێشێ و بە نەخۆشخانە ڕاناگات، گیانی پاکی دەسپێرێ.

تەواوی بنەماڵەکەیان بەم کارەساتە پڕتاو و جەرگبڕە دڵتەنگ و نیگەران دەبن، هەمووان ئیتقان و باوەڕی نەبڕاوەیان بەقەزاو قەدەری خوای پەروەردگار هەیە کە هەر

[١٢٢] - فەرهەنگی ئاسان- هەمان سەرچاوە- ل١٥

یەك لەئێمە ڕۆژێكی دیاریكراوی هەیە لەو ڕۆژەدا سەعات و چركەساتێك هەن تیایدا بۆ تا هەتایە دەفتەری كردەوەكانی لەسەر دنیا دادەخرێ و كۆتایی بەژیانی كاتی سەر دونیای دێت وەكو چۆن بە ئەمانەت هاتۆتە سەر زەوی، دەبێ ئاوا ئەو ئەمانەتە بۆ كردگارەكەی بگەڕێتەوە.

له گەرما و گەرمی ئەو ڕووداوە، خزم و كەس و كاری حاجی خدر كۆدەبنەوە، كاك جەوهەر ناسراو بە (جەوهەرە سوور) كە پرسیاری شوفێرە نەدی و نەناسەكە دەكات كە لەباوكی داوە و كوشتوویەتی.. پێی دەڵێن: لەلایەن پۆلیسەوە گیراوە، ئێستا دەست بەسەرە.. ئەویش مەردانە دەنگ هەڵدەبڕێ و سوێند دەخوات تاوەكو ئەو كابرایە بەر نەدات نابێ تەرمەكەی باوكی بشۆن و تازیەی بۆ دابنێن.. بەپێیەكانی خۆی دەڕوات، دەچێتە بنكەی پۆلیس و كەفیەتی كابرای شوفێر دەكات و دەگەڕێتەوە.

دوای بەڕێوەچوونی ڕێ و ڕەسمی پرسەكە بەشێوەیەكی ئاسایی، لەدوا ڕۆژی پرسەكەیدا كاتێك كەس و كار و ئاسیاوەكانی كۆدەبنەوە كۆتا بڕیار لەمەڕ چارەنووسی ئەو كابرایە بدەن: لێی خۆشبن یان بڕە پارەییەكی باشی لێ بسێنن؟ لەم نێوەندە مشت و مڕ پەیدا دەبێ، هەندێ دەڵێن: تا كابرای شوفێر ببێتە پەند و عیبرت دەبێ پارەیەكی وای لێ بسەنین لەژیانیدا بیرای بیڕ هەڵنەستێتەوە چونكە لەڕووی یاساییەوە بەدەر لە شەرع، ڕۆیشتنی بەو شێوەیە كە سەرپێچی هاتووچۆیە كەواتە ئاساییە داوای خوێنی لێ بكەین.

جەوهەرە سوور لەم ئان و ساتە بەبیستنی ئەم قسانە تووڕە دەبێت و پێیان دەڵێ: ئەوە دەڵێن چی؟ دەتانەوێ باوكمان لەقەبریشدا لێمان خۆش نەبێ لەكاتێكدا ئیشی ئەو تا مردیش هەمیشە لە صولح و صولكاری بوو، ئەوە بڕیاری خۆمە، من یەك دینار چییە لەو شوفێرەی وەرناگرم، كێ لەئێوەش داوای پارە دەكات و چەندی دەوێ ئەوە من ئامادەم لە باخەڵی خۆمدا پارەی بدەمێ، بۆ من شوورەییە ئەگەر پارە لەو كابرایە وەربگرم چۆن دەتوانم بچمە صولحێك و دوو قسەی خێری تێدا بكەم، لەكاتێكدا بەموێ بڵێم: توخوا لەو ماڵە ببوورن، لەو ماڵە خۆشبن هیچیان نیە، ئەوا بێ یەك و دوو ئەوەم بەدەم چاو دا دەدەن، دەڵێن: تۆ كە تەكلیفێكی لەو چەشنە لەئێمە دەكەیت، ئەی بۆ لەو ڕووداوە ئەوەندە پارەت وەرگرت؟

هەمووان بەم وتە جوانانەی كاك جەوهەر ئەو بابەتە بۆ تاهەتایە دادەخەن و لـــە

## كابرای شوفێر خۆش دەبن[١٢٣]

*   *   *

### سەرنج:

•جەوهەرە سوور لە١/٧/١٩٥٤لەدایك بووە ،لە٢٨/٧/٢٠٠٧ لەمەولێر لە ماڵی عەزیزی مامی دەبێت، كاتێك بانگی عەسر دەدات، دەستنوێژ دەشوات و لەسەر دووگرد (بەرماڵ) خەریكی نوێژكردن دەبێت، ئەفسووس لە سوجدەدا جەڵتەی لیّ دەدات و ناگاتە نەخۆشخانەی ڕزگاری كۆچی دوایی دەكات.

•تاهیر مستەفا ئەمین: لەدایك بووی ساڵی ١٩٧٣ی گوندی سماقوڵی گرتكە، خاوەنی ٤منداڵە و ژیان لە سێبەردان بەسەر دەبات.

پێغەمبـــەری خـــوا(ﷺ) دەفـــەرموێت: ( پـــەروەردگار دەفـەرموێت: ئـەی نـەوەی ئـادەم هـەركات تـۆ نـزا و پاڕانەوەم لێبكەیت ئەوا من لێت خۆش دەبم و باكم نـی یـە، ئـەی نـەوەی ئـادەم، گـەر گونـاهو تاوانـەكانت بەئەنـــدازەی نێـــوان ئاســـمـــان و زەوی بێـــت بـــەڵام بگەڕێیتەوە بۆ لام و داوای لێخۆشبوونم لیّ بكـەیت ئـەوا بێگومـان لێـت دەبـوورم، ئـەی نـەوەی ئـادەم: گـەر تـۆ بەئەنـدازەی خـاك و خـۆڵی سـەر زەوی گونـاه بكـەیت و پاشـان داوای لێخـۆش بـوونم لـیّ بكـەیت، ئـەوا منـیش بەهەمان ئەندازە لێت خۆش دەبم بەمـەرجێك هـاوەڵم بۆ پەیدا نەكەیت)( اخرجه الترمذي وقال: حديث حسن)

---

[١٢٣] - ئا: شاخەوان عەلی، گ: چرای ڕووناكی، ژ:(٧٠)، س: ٢٠١٤، ل١٢

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

﴿ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ وَهُوَ كُرۡهٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٢١٦ ﴾ البقرة: ٢١٦

# بەیەك نووكە، ژنێكم بەمل داهات...

**بەسەرهاتی یەكەم:**

## ژنێكی خواناسم بەنسیب بوو...

**برادەرێكی موسڵمان و خواناس ئەو بەسەرهاتەی خۆی بۆی گێڕامەوە، بەڵام حەزی نەكرد ناوی بێنم، منیش ئاماژەم بەناوی نەدا، وتی:**

**تازە مۆبایل[١٢٤] هاتبووە هەرێمەكەمان ، خەڵك پێی سەیر بوو لەرێی ئامێرێكی بچووكەوە بێ ئەوەی بەهیچی ببەستیەوە كێت[١٢٥] بوێ بیدوێنی هەر ئەوەندەت بەسە**

---

[١٢٤] - ئەم وشەیە لەوەوە هاتووە كە ناوی شارێكە بەناوی موبایل كە لە ولایەتی ئەلبامایە و دەكەوێتە خوارووی ئەمریكا و لە رووی زۆری دانیشتوانەوە لەو ویلایەتە سێیەمین شارە و شارێكی دێرین و مەڵبەندی رۆشنبیری و فكرییە.

بیرۆكەی دروستكردنی مۆبایل بۆ سەرەتای جەنگی جیهانی دووەم دەگەڕێتەوە بەهۆی بەكارهێنانی لاسلكی رادیۆ لەناو كەشتیەكانی كەناری شاری موبایل و ساڵی١٩٤٦ یەكەم جۆری مۆبایل لە شاری سانت لویسی ئەمریكی دروست كرا كەبەسیستەمی بیل لەناو ئوتومبێل كاری دەكرد ئەوە بووە دەسپێك كە هەر بەوە نەوەستا یەكەم ئامێری مۆبایلی دەستی و سەربەخۆ لەلایەن (مارتن كوبەر)ەوە دروست كرا كە بە دۆزەرەوەی مۆبایل دادەندرێ كاتێ لە كۆمپانیای مۆتۆرولا وەك توێژەر كاری دەكرد هەرچەندە ئامێرەكە بەشێوازێك دروست كرابوو كێشەكەی قورس بوو(كێشەكەی دوو پاوەند بوو) بەڵام تواندرا یەكەمین پەیوەندی تەلەفۆنی پێ لەساڵی١٩١٩٧٠ بكرێ.

مارتن دەڵێت: یەكەم جار كە بە مۆبایلەكە قسەم دەكرد لەگەڵ ڕادیوی نیویورك كاتێ بەشەقامەكاندا گوزەرم دەكرد هەموو خەڵك بەسەرسوڕمانەوە تەماشایان دەكردم.

بۆ ئەو كاتە نرخی ئامێرەكە زۆر گران بوو كە ٣٩٩٥دۆلار$ نازناوی the brickی پێ بەخشرا، ئەگەر بەراوردی نرخی مۆبایلی ئەم سەردەمە لەگەڵ ئەو كات بكەین نرخەكەی ئێستا هەرزانە. زۆری كۆمپانیاكانی وەبەرهێنان وایكردووە لەم ڕۆژگارەدا زۆرینەی خەڵك بەدوای نوێترین جۆری مۆبایل بگەڕێن.

[١٢٥] - كێت: هەر كەس

ژمارەکەی بۆ لێبدەیت و ئەویش هەڵیبگرێ، ئیدی بەئارەزووی خۆت ئەو کەسە لەهەر شوێنێکبێ و بەس شەبەکە هەبێت، دەتوانی قسەی لەگەڵدا بکەی.

بەتاسەوە سیمکارتێکم دەستخست و هاندێکی گرانبەهام کڕی، وەکو نەدیتکە دەچوومە هەر شوێنێ، بۆ پۆزلێدان هاندەکەم بەدەستەوە دەگرت، دەمهێنا و دەمبرد و دەمسووڕاندەوە، خۆ ئەگەر مۆبایلیشم بەدەست کەسێکی ناسیار ببینیایە، داوای ژمارە مۆبایلەکەم لێی دەکرد و ژمارەکەی خۆمم پێی دەدا کە زۆر جار لەبەر بێ ئیشی و دەستبەتاڵی خۆم کە ئەوەندە هاندەکە لەنێو دەستمدا ئەم دیو و ئەو دیوی پێ بکەم و سەیری شاشەکەی بکەم بەڵکو یەکێك تەلەفۆنم بۆ بکات، لەبێزاربوونی خۆما، دەستم دەگەیاندە سەر لیستی ناوەکان و ژمارەی ئەو کەسانەی لەسەر هاندەکەم خەزن کردبوون، ئەقڵم کێ ی بگرتبایە، بەناوی هەواڵپرسینەوە تەلەفۆنم بۆی دەکرد.

هەندێ لەدۆست و ئەحباب، ئەوانەی ژمارەکانیانم لەسەر دەفتەرێکی بچووکی تێبینیەکان تۆمار کردبوو، ناوە ناوە لە لێدانی ژمارەکاندا هەڵەم دەکرد، بەمەش زەنگەکە بۆ کەسێکی تر دەڕۆیی، بۆیە دەبوو یەکسەر پۆزش بهێنمەوە یان گومانم بېردبایە هەر ئەو کەسەیە وا بەئاسانی یەخەیم بەرنەدەدا، دەمووت: توخودا سوعبەتم لەگەڵ مەکە با ئەوەندە سەنتم لێ نەڕوات..ئەگەر بیوتبایە : من ئەو کەسە نیم، بابەکەم هەڵەی.

دەمووت: توخوا درۆم لەگەڵ مەکە.

ئەگەر بەهەڵچوونەوە قسەی بکردبایە، داوای لێبوردنم لێی دەکرد و بەنابەدڵی مۆبایلەکەم بەڕووی دادەخست.

جار جار بەهەڵە لەپێش و پاشخستنی ژەمارەیەکدا جەرەس بۆ کەسێك بڕۆیشتایە، هەر زوو دوگمە سوورەکەم دادەگرت و نەمدەهێشت بۆی بڕوا، خۆ بڕۆیشتبایە، کە هەڵیگرت، یەکسەر دەمووت: ببوورە ژمارەکەم بەهەڵە لێداوە.

ڕۆژێکیان ئەوها زەنگەکەم بەهەڵە ڕۆیشت، ئافرەتێك هەڵیگرت، پۆزشم بۆی هێنایەوە لێم ببورێ، بەچەند خولەکێك دوای ئەو تەلەفۆنە، تەلەفۆنێکم بۆ هات نەمزانی کێیە، وتم: فەرموو.

+ ببوورە کارێکی زۆر گرنگ هەیە پێویستە بتبینیم.

* بەسەرچاو، بێمە کوێ؟

+ وەرە سەر ڕێی کەرکوك، نزیك دایەرەی مروور؟

* ئیشەڵلاّ دوای دە دەقە، چارەگێکی تر دەگەمە لات، ئەی چیت پێیە؟

+ سەیارەیەکی سپی سیدریك، لەسەرەوەی مروور چاوەڕوانم بەس توخوا زۆر دوا مەکەوە.

* خەمت نەبێ، ها بزانە گەیشتمە لات.

دەنگی ئەو کابرایە دەق لەدەنگی ئەنوەری ئامۆزام دەچوو، بۆیە هیچ پرسیارێکم لێی نەکرد، خۆم گۆڕی، سولفم لەسەیارەدا و بەڕێ کەوتم، ئەوەندەی نەبرد گەیشتمە ئەو شوێنە کە لەپێش سەیارە سپییەکەدا زەلامێکی دیکەم بینی نەك ئەنوەری ئامۆزام، لەدڵەوە بەخۆمم وت: تۆ بڵێی شتێك ڕوویدابێت و لێی بێئاگابم؟

سەیارەکەم ڕاگرت و دابەزیم، دوو گەنج کە خۆیان لەناو سەیارەکە شاردبۆوە، کتوپڕ هاتنە خوارەوە، چواردەورەیان گرتم.

کابراکە وتی: من ئەوەم کە تەلەفۆنم بۆ کردی، فەرموو لەگەڵمان سەرکەوە.

ترس هەوزەلّی بۆ هێنام، لەدەروونەوە بەخۆمم وت: ڕەنگە ئەمانە ئاسایشبن، قسەکردن لەگەڵ ئاسایش بێسوودە، هەرچەیك بپرسم جواب نادەنەوە، خۆ ئەگەر دزو جەردەشبن، ئەوە سویچی سەیارەکەم لێ دەستێنن و لێمی دەبەن.

بەهەڵپەیەکەوە وت: بێزەحمەت دەکرێ سەیارەکە لەگەڵ ڕۆخی شۆستەکە تەبگ بکەم؟

وتی: ئەی بۆ نا، فەرموو، فەرموو.

چوومە ناو سەیارەکە، لەتەنیشتمەوە یەك لەو دوو گەنجە سواربوو وەك بترسێن لەگەڵ سلف لێدان پێ بەبەنزینەوە بنێم و هەڵبێم، بەهێواشی سەیارەکەم لەتەك شۆشتەکە ڕاگرت و دابەزیم، دڵم لە سەد لێیدەدا، زمانم وشك ببوو، زاتی ئەوەم نەدەکرد بڵێم: ئەرێ بۆ کوێم دەبەن؟ جا ئەگەر وابڵێم وەلاّم نەدەنەوە؟ چاوئەبلەق بووم، کاتێك بەجادە خۆڵەکە بەرەو دەشتاییەکی کاکی بەکاکیان بردم چۆلەوانیەك بوو، دەنگی جۆلەکەیەکت بەر گوێ نەدەکەوت، سەیارەیان ڕاگرت و لێرەدا سیناریۆکە دەستی پێکرد، کابرا بەتووڕەییەوە وتی: هەی بێ ڕەوشت، دەی وەرە خوارەوە.

دابەزیم و ئەوەندەم زانی شەقێکیان تێهەڵدام، دەستکردنەوە بەرامبەر سێ کەس شەڕی خۆبەرەیە، ڕووم تێیکرد، بە زمانی گوڵەوە پێموت: ئەرێ بێزەحمەت چیم کردووە؟ بۆ لێم دەدەن؟

لەهەموو لایەکەوە بەمست و پێلەقە وەرگەڕانە سەرم ، بوورامەوە، لەهۆش خۆم چووم

دەبەیەك ئاوی ساردیان بەدەم و چاوم داکرد، ڕاچڵەکیم، بەزەلیلیەوە چاوم هەڵێناو پێموتن: توخوا چیم کردووە؟ ئاخر بۆ لێم دەدەن؟

کابراکە وتی: هەی تەرەسی بێ ئابروو، وەرە بزانم بۆچی تەلەفۆن بۆ خوشکم دەکەی؟ چما وادەزانی دایك و باوك و برایە؟

کەوتم: خوا ئاگادارە ئەگەر ئەمەم کردبێ ئەوە هەڵەیەك بووە و هیچی تر، خۆ ئەگەر مەبەست لەو تەلەفۆنەی ئەمڕۆبێت، ئەوە نەدەزانم کێیە و ناوی چیە؟

کابرا وتی: بۆ ئەوەی حەیامان نەچێ، بەپیاوانە وەرە پێش و بیخوازە.

کە پێموت: ئاخر من نەخوشکی ئێوەم بینیوە، نەدەزانم چیە و چۆنە؟ بە چ هەقێك بیهێنم؟

کابرا ئاگری دەکردەوە، وتی: کەی هاتیە پێش و مارەت کرد ئەوجا دەیناسی و دەیبینی

منێکی لەخوا ترس گومانی هەزار و یەك شتم بەمێشك داهات، لەناخەوە بەخۆمم وت: ئەگەر ئەوانە خوشکەکەیان بکوژن، چ جوابی خۆم بدەمەوە؟ ئەی دەبێ خەڵك چیمان پێ بڵێن؟ هەر پاساوێك بهێنمەوە کەس باوەڕم پێ ناکات کە ئەوە لەسەر نووکە تەلەفۆنێك بووە، دەڵێن: ئەوە مرۆڤە لەخواترسەکەمان بوو ئەو کچەی ئەتك کرد بۆیە کوشتیان، خۆ ئەگەر منیش بکوژن ئەوە عوزر لە قەباحەت خراپترە، دوای من ئەو شتە بۆ بنەماڵەکەمان دەبێتە پەڵەیەکی ڕەش و بەچاوی سووکەوە سەیر دەکرێن، نابەدڵی وتم: کاکە بۆ ئەوەی حەیامان نەچێ، ئێوە چی دەڵێن ئەوە دەکەم.

کابرا وتی: دەفەرموو سەرکەوە.

سواری سەیارەیان کردمەوە، بردمیانەوە بەردەم سەیارەکەم و وتیان: فەرموو بەرەو بەردەم ماڵتان پێشمان بکەوە، هەر هەڵەیەکیش بکەی، بتەوێ ڕاکەی، خۆت بدزییەوە، دەبێ باجەکەی بدەیت.

سوار بووم و ڕۆیشتم، ئەوانیش بەدوامەوە هاتن، کاتێ گەیشتمە پێش ماڵی خۆمان، کابراکە ناونیشانی خۆیی و ناوی خوشکەکەی دامێ لەگەڵ ژمارە مۆبایلەکەی، وتی: ئەمشەو دێینە پێش و چاوەڕوانتان دەکەم.

بێ ئەوەی بیری ژنهێنانم هەبێ، چوومەوە ماڵ، دوای پشوویەکی کورت بەڕوویەکی خەندە ئامێز چوومە لای دایکم و ڕووم لێینا کە بەباوکم بڵێ و ڕازیبکات ئەمشەو بۆم بچنە خوازبێنی ئەو کچە.

ئەویش قەناعەتی بەباوکم هێنا، هەر ئەو شەوە چووینە پێش، کچەم مارە کرد و گواستمەوە، ئەوە بۆ یازدە ساڵە من و ئەو کچە ژن و مێردی یەکین و چوار پێنج منداڵمان هەیە، زۆر لەبەری خۆشحاڵم کە تا بەئەمڕۆ ڕادەگا لەخانەی سوعبەتەوە جار جار بەو کوڕە خەزوورەکەم دەڵێم: ئەگەر دەمزانی خوشکەکەتان ئەو ئافرەتە چاك و جوان و خواناسەیە، هەر زوو ئەو نوکەیەم بۆ دەکردی. ئەوەش نهێنیەکە تا ئێستا حاڵەتی شەڕەکە و نووکەکە لە بەینی من و ئەو کوڕە خەزوورەم بترازێ، کەسی تر پێی نازانێت.

✍✍بەسەرهاتی دووەم:

**چۆن کچەکەی بەمۆبایل لەخشتە برد؟**

**🕮 مامۆستا کاوە عەلی تاڵەبانی بەسەرهاتێکی بۆ گێڕامەوە، وتی:**

✎ گەنجێکی سەرەڕۆ دەناسم، لە بێ ئیشی خۆی تەلەفۆن بۆ ئەم و ئەو دەکات بەبێ ئەوەی بزانێ ئەو کەسە کێ یە و کێ نیە! ئەگەر ئەو کەسە پیاو دەرچوو، هەر لەخۆیەوە ناوی کەسێك دێنێت و پێی دەڵێ: بێ زەحمەت ئەوە تەلەفۆنی فلان کەسە.

ئەگەر بڵێ: نا برا، هەڵەی ، من ئەو کەسە نیم.

بە وشەی: ببوورە، داوای لێبوردن دەکەم، کۆتایی بە پەیوەندیەکەی دێنا.

خۆ ئەگەر کچ بووایە، بەچەند قسەیێ بۆ دەچوو، خۆ ئەگەر زانیبای ئەو کەسە هەڵدەچێ، هەمان قسەی بۆ دووبارە دەکاتەوە: ببوورە، داوای لێبوردن دەکەم.

ڕۆژێکیان بەو تەلەفۆن و تەلەفۆنکاریە، بەکچێکی وتبوو: من ناوم عەزیزە و کەسێکی عەزیزم، خوێندکارم لە قۆناغی سێی کۆلێژی پەروەردە دەخوێنم، ماڵمان لە گەڕەکی دۆلاراوەی هەولێرە، خانوویەکی پان و پۆڕی ئەوتۆمان هەیە سەروبنی دیار نییە.

لەکاتێکدا ئەو قسانەی دەکات ناوی عەزیز نیە، ماڵیان لە کەسنەزانە نەك دۆلاراوە، بێ خانوون و کرێچین، تەنانەت بەجۆرێ ئەو درۆ شاخدارەی دەکرد گوایە کەسێکی نەخوێندەوارە کەچی نازانێ ناوی خۆی بنووسێت.

بەو قسە زل زلانەی قەناعەت بەکچەکە دێنێت بەڕاستی خۆشی دەوێ، دوای ڕۆژێك و دوان و دە ڕۆژ قسە کردن ، مەوعید دەدەنە یەکدی و لە پارکی (سامی عەبدولرەحمان) یەکتر دەبینن، کوڕەکەش دەچێتە لای برادەرێکی خۆی، سەیارەیەکی (بی ئێم)ی بۆ چەند سەعاتێك لێ وەردەگرێ و دەچێتە ئەو شوێنە، کە لەسەیارەکە

دابەزێ، وەها خۆی نیشانی کچەکەدا گوایە برایەکەی لەماڵەوە لاندگرۆزەکەی ئەوی بردۆتە دەرەوە و ئەو سەیارە خراپەی بۆ بەجێ هێشتووە.

تاوێ دوان بەیەکەوە قسە دەکەن، دوای گەڕانەوە، کوڕەکە هەست دەکا کچەکە ئەوەندە جوان نیە، یەکسەر ئەو سیم کارتەی دەسووتێنێت و سیمکارتێکی تر دەکڕێ.

کچەش ئاخۆ دوای ئەوە چەند تەلەفۆنی بۆ کردووە و هیچ دەنگێك نیە وەڵامی بداتەوە[١٢٦]

---

[١٢٦] – کوڕە فەرمانبەرێك، مەسیجێکی بۆ ژنە فەرمانبەرێکی دایەرەکەیان دەنێرێت و بۆی دەنووسێ: ئەگەر دێی لەماڵەوە بەتەنیام.

ژنەکە بە خوێندنەوەی نامەکە تێك دەچێ و دەست دەکاتە هەڕەشە و گوڕەشە: بزانە ئەو هیچ و پووچە چی بۆ نووسیوم؟ وادەزانێ بێ ئەخلاقم، دەبێ هەر ئێستا پیاوەکەمی تێبگەیەنم و تەمبێخواردووی دنیای بکەم.

یەك لە فەرمانبەرەکان پێی دەڵێ: ئێستا تەلەفۆن بکەی لەگەرماو گەرمی باروبرخەکە ئەگەر پیاوەکەت چوو ئەو کوڕەی کوشت؟ ئیدی کێشەکە هێندەی دیکە گەورە دەبێت، تۆ ئارمبە و ئەوە بۆ من لێ گەڕێ، خۆم ئێستا قسەی لەگەڵ دەکەم.

کاتێك تەلەفۆنی بۆ دەکات و لەناوەڕۆکی ئەو ڕیسالەی ئاگادار دەکاتەوە، کوڕە فەرمانبەرەکە پێی دەڵێ: بەو خوایە هیچ نیەتێکم لەو قسانە نەبووە، ئەو بۆ خۆی دەزانێ من خاوەن ژن و ماڵ و منداڵم و ماوەی چەند ساڵێکە لەگەڵ ماڵی باوکم لەیەك خانوودابین، شوکر ماوەیەکە خانووی خۆم کردووە و چەند ڕۆژێکە چوومەتە ناوی کە نووسیومە ئەگەر دێی لەماڵەوە بەتەنیام مەبەستم ئەوەیە بەماڵ و منداڵەوە سەربەخۆ و ئێستا بەتەنیاین.

کە ئەویش ئەو قسانەی بۆ ژنە فەرمانبەرەکە باس کرد، ژنەکە هەستی بە دڵنیایی کرد و تووڕەییەکەی نەما.

# 🕮ڕەخنە لەکاری خوا مەگرن، هیچ شتێك بێ حیکمەت نییە!

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( وازبێنن لەزۆر پرسیارکردن، نەتەوەکانی پێش ئێوە بەهۆی پرسیار زۆری و جیاوازیان بەرامبەر پێغەمبەرانیان تیا چوون، بۆیە هەر کات فەرمانم پێکردن ئەوا بەپێی توانا جێ بەجێی بکەن، خۆ ئەگەر ڕێگریشم لێ کردن هەر زوو دەست هەڵبگرن و وازبێنن)( رواه مسلم)

✍ مەلا حوسێن خۆشناو بۆی گێڕامەوە، وتی:

✎ کابرایەك هەبوو ڕۆژێکیان بەشوێنێ گوزەر دەکات، لەناکاو قالۆنچەیەك دەبینێ ئەوە قەرسەقوڵی[127] گوێدرێژی خڕ کردۆتەوە، کردوویەتە تۆپەڵەیەکی خڕ و بەرەو شوێنێکی نادیاری دەبات. لەبەر خۆیەوە دەڵێت: خوایە گیان ئەوە چیە دروستت کردووە؟ ئەو قالۆنچە پیسە بەکەڵکی چی دێ؟ ئەگەر هەبێ چیە و ئەگەر نەبێ چیە؟

ئەوەندەی نەبرد کابرا تووشی نەخۆشیەك بوو، چ لوقمان و حەکیمێك نەما نەیبەنە لای، بێسوود بوو، چاك نەدەبۆوە. نەخۆشیەکەی درێژەی کێشا، بردیانە لای کابرایەکی دانا کە لەنەخۆشیەکەی ورد بۆوە، پێی وتن: چارەسەری ئەم نەخۆشیە تەنها ئەوەیە بچن قالۆنچە و ئەو پیسایەی خڕی دەکاتەوە بەیەکەوە بیکوتن، ئەوجا بیهاڕن و بیدەنێ.

ئەوانەی لەگەڵی بوون بە حیرسەوە وتیان: قوربان ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی؟ خۆ ئەوە حەیوان نیە.

کابرای نەخۆش سەری بۆ لەقاندن و وتی: قسەی ئەم دانایە ڕاست و ڕەوانە، من باش دەزانم کە قسەکەی تەواوە و دەبێ وابێ.

قالۆنچە و پیسایی گوێدرێژیان تێکەڵ بەیەك کرد و هاڕییان، ڕۆژانە ئەو شتە پیسەیان دەرخواردی دەدا، لەماوەیەکی کەم، چاك بۆوە.

ڕۆژێکیان لەگەڵ چەند کەسێك لەهاوڕێکانی لەدەرەوەی شار پێکەوە دانیشتبوون، یەك دەیوت: هەق وایە باران بباری کاتی خۆیەتی.

یەکێکی تر دەیوت: بریا ئەو شاخە ئەوەندە بەرز نەبوایە.

ئەوی دی دەیوت: فلانەکەس زۆر جوانە بەڵام بەژن کورتە.

ئەوان ئەو قسانەیان دەکرد، ئەو هیچ شەکرێکی نەشکاند، یەکێکیان بەهەڵپەیەکەوە

---

[127] – قەرسەقوڵ: تەرس، قەستەقوڵیشی پێ دەوترێ.

ڕووی تێ کرد: کاکە گیان ئەی تۆ بۆ قسەیەك ناکەی؟

ئەویش بەدەم زەردە زەردەخەنەیەکەوە وتی: بەخودای ئەوەی قسەیە لەدەمی منەوە دەرناچێ، من یەك جار ڕەخنەم لەکاری خوا گرت، قالۆنچە و قەرسەقولی کەری دەرخوارد دام، جارێکی تر قسەی تێدا ناکەم[128]

✍لەوەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ:

❁یەکەم: هیچ شتێك لەدروستکراوەکانی خوای پەروەردگار بێ حیکمەت نیە، ئەوە ئێمەین لە نهێنیەکانی ئەو حیکمەتە تێ ناگەین و ڕەخنەی لێ دەگرین.

❁دووەم: مشتێك نموونەی خەروارێکە دەرهەق بەتەواوی دروستکراوەکانی.

عائیشە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێت[129]: ئافرەتێك هات بۆ لام و دوو کچی لەگەڵدابوو، داوای یارمەتی لێکردم، منیش هیچم لا نەبوو تەنها یەك دەنك خورما نەبێت، دەنکە خورماکەم دایە و ئەویش کردی بەدوو لەتەوە، دابەشی کرد لەنێوان هەردوو کچەکەیدا و خۆی هیچی لێ نەخوارد، پاشان هەستاو لەگەڵ دوو کچەکەیدا ڕۆشتە دەرەوە، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە، ئەم بەسەرهاتەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ( ئەگەر کەسێك خوا تاقی بکاتەوە کچی پێ ببەخشێت، ئەویش بە چاکی ڕەفتاری لەگەڵدا بکات، ئەوە ئەو کچانە دەبنە بەربەست بۆی لە ئاگری دۆزەخ).

❁سێیەم: لە سۆنگەی ئیسلامەوە خواردنی گۆشتی گوێدرێژ یاساغەو قالۆنچەش پیسەو دروست نیە خواردنی، بەس ئەمە بەسەرهاتەو بەم شێوە ڕوویداوە و پەندو عیبرەتی تێدایە.

---

[128] – ئەنشتاین لەبەر بوونەوەی سێوێك هێزی کێشکردنی زەوی دۆزیەوە، دەڵێت: ئیمان گەورەترین سەرنجە کە لێکۆڵینەوەی زانستی پێی دەکات) فلیمینچ کە ڕۆژنامەنووسێکە لە دیمانەیەکدا بە ئەنشتاین دەڵێت: من سەرم لەزانایەکی بەرزی وەکو تۆ سوڕماوە، تۆ (وزە)ت بەستەوە و لە هاوکێشەیەکدا داتنا و لەخوداش دەترسیت؟)ئەویش لەوەڵامدا پێی دەڵێت: فلیمینچ دەمت داخە، من بێباوەڕ و مولحید نیم، من ئیمانم بەخوا هەیە.

ئەنشتاین زانایەکی بەرزی ئاڵمانیە و خاوەنی بیردۆزی نسبی یە لە١٨/٤/١٩٥٥کۆچی دوایی کردووە.دەڵێ: ئاینی بێ زانیاری کوێرە و زانیاری بێ ئاین شەلە.

[129] – عن عائشة(رضي الله عنها) زوج النبي(ﷺ) قالت: جاءتني امراة ومعها ابنتان لها، فسألتني فلم تجد شيئا غير تمرة واحدة، فاعطيتها اياها، فأخذتها فقسمتها بين ابنتيها ولم تأكل منها شيئا، ثم قامت فخرجت وابنتاها، فدخل على النبي(ﷺ) فحدثته حديثها، فقال النبي (ﷺ): ( من ابتلي من البنات بشيء، فأحسن اليهن، كن له سترا من النار).( بخاري/ الزكاة/ ١٣٥٠)

✍بەسەرهاتی یەکەم:

## ڕازی نەبوون بەکاری خوا، ڕەخنەگرتنە لەفەرمانەکانی

## ✍ بەسەرهاتی ئەو پیاوەی چونکە ژنەکەی کچی بوو، پیاوەکەی تەلاقیدا

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ:( ابغض الحلال الى الله الطلاق ) واتە: تووڕەترین حەلاڵ لەلای خودا تەلاقدانە.

📖 ئەو بەسەرهاتەی لەنزیکەوە بینیم:

کاتێك ژنم هێنا، هەنگاوەکانی سەرەتای دوای هاوسەرگیریم بەکرێنچێتی دەست پێکرد، کە ماڵم لە( کەسنەزان) بار کردو چوومە هەولێر- گەڕەکی (گلکەند) لەخانووی مام (برایم کونەفلوسی) گیرسامەوە، کە دوای دوو ساڵ بێ منداڵی، گەلاوێژی خێزانم بە (شایەن)ی نۆبەرە، زگی پەیدا کرد.

ئەوەی ژانی نەبێ، نازانێ ژانی گەورە چەند قورس و گران و بەسوێیە؟ لەسەروحەدی نزیك بوونەوەی چاوهەڵێنانی یەکەم نۆبەرەدا، من و مامۆستا (بەنان) بەپەلە گەلاوێژمان بەرەو نەخۆشخانەی لەدایکبوون ڕفاند و داخیلمان کرد.

فەرمانبەرانی ئەو دایەرە ئاسانکاریان دەنواند، لەهۆڵی ناوەوە ڕێیان دەدا لێی بمێنینەوە، تەنانەت بۆ هەر داخوازییەکی نەخۆشەکە توند و تیژ نەبوون ڕقیان لێ هەڵبگری نەخاسمە ئەو دەمانەی چاوی دکتۆری گەورەیان لێ بزر بوایە، وەئەگینە نەیاندەهێشت کەس لەو شوێنە بوەستێ نەوەکو تووشی لێپێچینەوە و سزا بێن، لەهۆڵەکەیان وەدەردەنایین.

بەرامبەر دەرگای سەرەکی فریز بوو خەڵکەکەی ئەوێ، دوو دوو، دەستەو پۆل پۆل و سێ سێ ئەوەی هاتبووە ئەو شوێنە لێی دەوەستا و لەبێزاربوونی خۆیان لەجێوە ڕۆدەنیشتن، کەسێکیش شەکەت و کەیل و کەنفت بوایە، لەسەر فریزەکە تەخت دەبوو، سەرخەوێکی دەشکاند.

ئەوەی لەو شوێنە گوێیەکانی هەڵبخات، شتی سەیرو سەمەرە دەبینێت و دەبیستێ، شتانگەلێ سەرنجی ڕاکێشام، کچێك هاوەڵی دایکی بوو تاوەکو بەردەستی و چاودێری بکات و ئاگای لێبێ، لەناکاو بزر بوو، کەس نەیزانی عەرد قووتی دا، ئاسمان هەڵیکێشا، ئەو ڕۆیشتنەی ڕۆیشت کەس نەیبینیەوە، کاتێك دایکی کچەیان بەخۆ و منداڵە تازەبووەکەی لەقاوشی نەشتەرگەری دەرێنا، پیاوەکەی بەدەم هەڕەشە و گوڕەشەوە دەیوت: کچەکەت نەمرد ئەنناخری ڕەدوو کەوت؟ وەڵڵاهی ئەگەر هەتا

بەیانی ئەو سەر بەهەشە نەدۆزمەوە دەبێ تۆش بارو بنەت تێکنێی، بچیەوە ماڵە باوانت.

ژنەی بەستەزمان لەتاو ژان و ئازاری خۆی ئاگای لەهیچ نەبوو، هۆن هۆن فرمێسک بەچاوانی فواری بەست، بەدەم گریانەوە هاواری دەکرد: گوناهی من چیە؟من چیبکە؟

ئەویش بە یەك دوو قسەیەکی کورت باسەکەی لەگەڵ بڕاندەوە: ئێرە جێی قسە نیە لەماڵەوە چارەت دەکەم.

ئەو شوێنەیان جێ هێشت، لەوەوە ئاگام لێیان نەما، نەمزانی دوای چوونەوە کچەکەیان دەدۆزنەوە، یا ئەوەتە چۆن خۆی ون کردبوو، دەرنەکەوتەوە؟ ئەگەر کچەکە نەگەڕایەوە چارەنووسی ئەو ژنە بەکوێ دەگا؟

هەر لەو شوێنە پیاوێکی لووتبەرزی لەخۆڕازیم بینی، بەدەنگە کرخنەکەی قسەی بۆ پیاوێکی هاوتەمەنی خۆی دەکرد: سەرێکەو هێناومە، لەقسەی خۆم پەشیمان نابمەوە، سوێندێکە و خواردوومە، ئەگەر کچی ببێ تەلاقی دەدەم.

ئەویش سەرزەنشتی دەکرد: براکەم ئەوەندە ناشوکر مەبەو ڕەخنە لەکاری خوا مەگرە، گوناهی ئەو ژنە چیە؟

بەحیرسەوە وەڵامی دایەوە: گوناهی زۆرە، من داوای کوڕی لێ دەکەم، ئەو کچم دەداتێ، فەرموو چوار کچم هەیە! هەست بەشەرمەزاری دەکەم کە برادەرەکانم پێم دەڵێن: چەند کوڕو کچت هەیە؟ دەڵێم: تەنها چوار کچ، نازانم لەوە ناخۆشتر چیە کە بڵێن: چما وجاغت کوێرە بۆ ناچی ژنێکی تر بێنی؟ کچ و کچ، من هەرچیەك بۆ ماڵەوە بکەم دواجار دەبێ لەمستی زاوای مل مل پانی بنێم. بەم قسانە ناخی خۆم دەخۆمەوە، دەهەژێم ئاهێکی قووڵ بۆ نەگبەتی و بەدبەختی خۆم هەڵدەکێشم کە چاوم بەکوڕێك دەکەوێ ، خوا یەکەو نابێ بەدوو بەس ئەو منداڵەی کچبێ، هەر لێرە هەموو هەق و حیسابێکی لەگەڵ دەبڕێنمەوە.

من لەلای خۆمەوە موچڕکەیەکم بەلەش داگەڕا، بیرم لەکەللە پووچی ئەو پیاوە لەخۆباییە کردەوە کە ئەوەندە نەزان و کاڵفامە، نازانێ منداڵ چ کچ بێت یا کوڕ خوا دەیدا و هەر حاڵەتێکیش لەدروستبوونی منداڵەکە پەیوەندی بەخودی پیاوەکەوە هەیە نەك ژنەکە.

مامۆستا نەباز بەرە بەری بەیان هەواڵی لەدایکبوونی یەکەم نۆبەرەی پێدام و وتی، دڵخۆش بووم ، شوکرانەی خوای پەروەردگارم کرد و چاوەڕوانی ئەوەبووم بێنە

دەرەوە و بیانبەمەوە ماڵ، کە دواجار هاتە دەرەو: بڕۆ تەکسیەك بێنە و وەرەوە.
بەخێرایی چووم تەکسیەکم لەسەر جادەی سەرەکی گرت و هاتمەوە، ئەفسووس تا ئەوان لەقاوشەکە هاتنە دەرەوە بەچاوی خۆم پیاوە لووت بەرزەکەم بینی کە هەڕەشەی تەڵاقدانی دەکرد کاتێ ژنەکەیان هێنایە دەرەوە، وتیان: منداڵەکەت کچە.
کابرا سەروسیماو ڕوخساری ڕەش داگەڕا، بەڕق و قینەوە ڕووی کردە ژنەکەی کە لەسەر عارەبانەیەکدا منداڵەکەیان لەسەر کۆشی دانابوو، پێی وت: ئەوە سێ بەسێ تەڵاقمدای، ئەوجا بۆ خۆت ئیسراحەت بکە.
ژنەکەی بەدەم گریان و فیغانەوە کەوتە پاڕانەوە: پیاوەکە بۆ خۆت شێت دەکەی؟ خوا لێت هەڵناگرێ وام لێ دەکەی، ئاخر تاوانی من چیە؟ منیش حەزم دەکرد کوڕم بوایە بەڵام ئەوە خوایە کوڕ و کچ دەدات، نەوەکە من و تۆ.
ئەویش لێی داڕسا و بێ ئەدەبانە: چما دەڵێی خوا لێت هەڵناگرێ؟ فەرموو ئەوە من سێ بەسێ تەڵاقمدای.
ڕووی وەرگێڕا، بۆ سەرەوە هەڵکشا.. ژنەکەیشی فرمێسك لەچاوانیدا وشك نەدەبوو.
کاتێ گەلاوێژ و منداڵە تازە بووەکە و مامۆستا بەناز سواری سەیارە بووین، لەپێش خۆماندا لەسەر جادەی سەرەکی قەرەباڵغیەکم بینی، هەر لەناو تەکسیەکەوە سەیرم کرد، بینیم پیاوە لووت بەرز و ناشوکرەکە لەجادەکە کەوتووە و مێشکی پرژاوە، نەمزانی سەیارە لێیدا، یان لە شەڕ وایان لێی کرد! یەکسەر قسەکانیم بیر کەوتەوە کە چ ناهەقیەکی بەرامبەر بەو ئافرەتە بەستەزمانە کرد، پێی وابوو خوا سەببە تا بەبەر غەزەبی خوای پەروەردگار کەوت و نەگەیشتەوە ماڵ، بەهەقی خۆی گەیشت.

* * *

✍ لەوەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ:

❑ یەکەم: کچ و کوڕ خوا دەیدا، وەکو چۆن بەهەندێکی نادات.

❑ دووەم: زانست سەلماندوویەتی لە مێ یەدا دوو کرۆمۆسۆمی X هەیە، بەڵام نێرە یەك کرۆمۆسۆمی X و یەك کرۆمۆسۆمی Yی تێدایە..لەکاتی کەمە دابەشبووندا کرۆمۆسۆمێك لەهەر جووتە کرۆمۆسۆمەکان دەچێتە توخمە خانەیەکەوە، لە مێ یەدا دوو کرۆمۆسۆمی X دەچێتە هەر لەشە خانەیەك. بۆیە لەکاتی بەرهەمهێنانی هێلکە لە کەمە دابەشبووندا هەر هێلکە خانەیەك کرۆمۆسۆمێکی X وەردەگرێت و لەکاتی

بەرهەمهێنانی تۆودا لە کەمە دابەشبوون تۆو یان کرۆمۆسۆمی X یان کرۆمۆسۆمی Y وەردەگرێت.

ئەو هێلکەییەی کە دەپیتێنرێت بە تۆوە ئەگەر ئەو تۆوە کرۆمۆسۆمی X ی تێدا بێت، مێ یە دەردەچێت. وە ئەگەر ئەو تۆوە کرۆمۆسۆمی Y ی تێدا بێت ئەوا نێرە دەردەچێت.

کەواتە ئەو بابەتە کۆتایی هاتووە کە ژن هەڵگری (XX) و پیاویش هەڵگری (XY) یان (XX)ە، لەوەشدا هۆکارە بۆ دروست بوونی کچ یان کوڕ نەك ژنەکە.

❑ سێیەم: بێزێزی نواندن بەرامبەر دروستکەری دنیا و هەموو ئەوەی تێیدایە، ئاقیبەتی مرۆڤ باش ناکات، وەك لەپێشەوە ئامارژەمان پێی دا.

❑ چوارەم: نەهێشتنەوەی هیچ بەهایەك بۆ خۆشەویستی نێوان ژن و پیاو لەکاتێکدا هەر ژن و پیاو پەناگەی یەکن کە ئەگەر خاوەنی چەندین منداڵبن، لەدواساتەکانی تەمەنیان ئەوە ژن و پیاوەکە خۆیانن سێبووریان بەیەك دێ و دڵیان لەلای یەك لەنگەر دەگرێ، ئەوەش بەو مانایە نیە حسێب بۆ منداڵەکانی نەکات و خۆشیانی نەوێت.

❀ ❀ ❀

عن ابي هريرة(ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال: ( سبعة يظلهم الله في ظله يوم لا ظل الا ظله: الامام العادل، و شاب نشأ بعبادة الله، و رجل قلبه معلق في المساجد، ورجلان تحابا في الله، اجتمعا عليه و تفرقا عليه، و رجل دعته امراة ذات منصب و جمال، فقال: اني اخاف الله، و رجل تصدق بصدقة فأخفاها، حتى لا تعلم يمينه ما تنفق شماله، و رجل ذكر الله خاليا ففاضت عيناه). (بخاري/ الجماعة و الامامة/ ٦٢٩٤)

(ابوهريره)(رەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ( حەوت جۆر کەس هەن کە خوا دەیانخاتە ژێر سایە و سێبەری خۆیەوە لەو ڕۆژەدا کە هیچ سایە و سێبەرێك نیە جگە لە سایە و سێبەری ئەو زاتە: پێشەوایەکی دادپەروەر، لاوێکە کە لەسەر خواپەرستی گەورە بووبێت، کەسێکە کە دڵی پەیوەستی مزگەوت بێت، دوو کەس کە لەبەر خوا یەکتریان خۆش بوێت و لەسەر ئەو بنچینەیە بەیەك گەیشتبن، دوای دوورکەوتنەوە و جیابوونەوەشیان لەیەکتر خۆشەویستیان بەردەوام بێت، کەسێك کە ئافرەتێکی جوان و ناودار بانگی بکاتن ئەویش بڵێت: بەڕاستی من لەخوا دەترسم، کەسێکە کە خێر دەکات و دەیشارێتەوە، هەتا دەستی ڕاستی نازانێت دەستی چەپی چی بەخشیوە، کەسێکە بەتەنهایی یادی خوا بکات و چاوەکانی ئەسرینیان لێ ببارێت).

# ✪با تەماشای خوار خۆمان بکەین✪

خاتوو عائیشە بە عەروەی وت: کوڕە براکەم! لەماوەی سێ مانگ لەماڵەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئاگر بۆ چێشتلێنان نەکراوەتەوە! عەروە گوتی: پووری خواردنات چی بوو؟ ئەویش گوتی: خورماو ئاو، بەڵام ئەوە نەبێ کە پێغەمبەر (ﷺ) دراوسێیەکی ئەنصاری هەبوو مەڕیان هەبوو دەیاندا بۆ خواستن(الاستعارة) تا سوود لە شیرەکەی وەربگرن، جا لەشیری مەڕەکان بەشی پێغەمبەریان دەدا[١٣٠]

هەروەها خاتوو عائیشە دەڵێت:( ماڵ و خێزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا ئەو کاتەش کە پێغەمبەر گیانی سپارد، دوو ڕۆژ بەدوای یەك لەنانی جۆ تێر نەبوون).

پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: خوایە ڕزق و ڕۆزی ماڵی خێزانەکەی محەمەدﷺ هەر ئەوەندەبێ نە زیاد لە پێویستی بێت و نەکەمیش.

ڕۆژێکیان فاتیمە هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) تا سکاڵای ئەوەی لەلادا بکات کە بەهۆی دەستاڕەوە دەستی تلۆقاوە، پێشی گەیشتووە پێغەمبەر کۆیلەی بۆ هاتووە تا بەندەیەکی بداتێ ئیشی بۆ بکات، بەڵام پێغەمبەر لەوێ نەبوو، ئەمەی لەلای خاتوو عائیشە باس کرد، خاتوو عائیشەش ئەم هەواڵەی بەپێغەمبەر ڕاگەیاند...ئیمامی عەلی ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ماڵمان، ئێمەیش ڕاکشابووین، جا کە هات هەستاین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی، هەڵمەستن هەر لەشوێنی خۆتان بن، ئینجا لەنێوان من و فاتیمە دانیشت هەتا ساردایی پێیەکانی لەسەر سکم هەست پێ کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: شتێکتان لەوە چاکترە پێ بڵێم؟ ئەگەر چوونە سەر جێگەی خەوتن و ڕاکشان ٣٣جار بڵێن سبحان الله، ٣٣ جار بڵێن الحمدلله، ٣٣جار بڵێن الله اکبر، ئا ئەم وێردانە بۆ ئێوە لە خزمەتکار باشترە.

ئەمە ئەوەیە ئەگەر ئومەتێك بیەوێ بەنەمری و سەربەرزی بژێت، بیەوێ لاپەڕەکانی لە مێژوودا پرشنگدار و ڕووناکبێ، دەبێ سەرکردەکانی ژیانێکی وایان نەبێ خەڵك برسی بن و خۆشیان تێر. ئەمە فێری سەرکردە و بەرپرسان دەکات کە بەرامبەر

---

[١٣٠] - ( یا ابن اخي! انا کنا ننظر الی الهلال ثم الهلال، ثلاثة اهلة في شهرين، وما اوقدت في ابيات رسول الله نار! فقلت: يا خالة ما کان عيشکم؟ قالت: السودان التمر والماء! انه کان لرسول الله(ﷺ)جيران من الانصار لهم منائح وکانوا يمنحون رسول الله (ﷺ)من البانها فيسقينا) رواه البخاري.

سامان و ماڵی گەل خۆیان پاك ڕابگرن، چۆن دەبێ پێغەمبەر و خێزانەکەی لەوپەڕی خۆشی و تێریدابن، هەژارانی موسڵمانیش بەبرسیەتی ژیان ببەنە سەر؟ خۆ پێغەمبەر دەیتوانی بەهۆی ماڵی موسڵمانانەوە لە غەنیمەدا خۆی دەوڵەمەند بکات، بەڵام ئەوە سیفەتی نەبووە.

پێغەمبەر(ﷺ) زۆرجار دەچووە ماڵەوە داوای خواردنی لەخێزانەکانی دەکرد، گەر خواردنیان نەبوایە دەیفەرموو: من بە ڕۆژووم. ( ڕۆژووی (تطوع) ).

هەرکەسێك خۆی بەبۆنی ڕەوشت بۆنخۆش بکات هەرگیز بۆنی خۆشی لێ نابڕێ. لەچەند بەسەرهاتێکدا:-

✍بەسەرهاتی یەکەم:

### موسڵمان بۆ پارە درۆ ناکات

مامۆستا فارس قەرەنی[131] بۆی گێڕامەوە وتی:

✏ برایەکەم (دکتۆرای) لە (ئەندازیاری شارستانی) هەیە شەوێکیان هاتە لام بۆ کارێکی زۆر پێویست چونکە ئێمە لەزۆربەی کارەکان پرس و ڕا بەیەکتر دەکەین و دوای ڕاوێـژکردن لـەنێو خۆمانـدا ئینجـا بڕیـار وەردەگـرین، پێـی وتم: کابرایـەکی مرۆڤدۆستی خواناس تاقە کچێکی هەیە، کۆلێژی پزیشکی تەواو کردوە، دکتۆرەیە و لەخانوویەك دەژین، خانوویەکی گەورەی پان و پۆڕی دوو نهۆمی، کە بەهەموویان لەماڵەوە سێ کەسن. ڕۆژێکیان ئەو کابرا جوامێرە منی بینی و بانگی کردم، دوای چاك و چۆنی، جیای کردمەوە، وتی: دکتۆر من بتخوێنمەوە تۆ کوڕێکی چاك و باش و خواپەرستی، کچەکەی منیش دکتۆرەیە و لێی ڕازیم کە مولتەزیم و بەدینە خوای ڕووی سپی بکات و لەهەموو لایەکمان خۆشبێ. خۆت دەزانی لە ماڵەوە خۆ و خێزان و ئەو کچەین، وەکو دەمبینی چوونەتە ساڵەوە، حەز دەکەم بەبێدەنگی ئەگەر نیازی

---



مامۆستا (فارس قەرەنی عزیز خەیلانی ) لەدایکبووی ١٩٦٥/٧/١، خاوەن خێزانە و سەرپەرشتیاری پەروەردەییە.

زەواجت هەیە و حەز دەکەی پێمخۆشە کچەکەمت بدەمێ، نەك لەبەر ئەوەی تەماحم لەوەدایە تۆش وەکو کچەکەم دکتۆری، نا ئەوە بیرکردنەوەی من نیە، وەرە پێش هەر لەم خانووەدا بۆ خۆتان لەقاتی سەرەوە بژێن، هیچم لێ ناوێن تەنها ئەگەر پێویستیەکمان هەبوو کە شوکر هێشتا ساغ و سەلامەتین و پێویستیمان بەکەس نیە، بەلاَم ئەوە سوننەتی ژیانە، نەخۆشیەکە، پێویستیەکە ئاگایەکتان لێمانبێ و هیچی تر، بۆ دوارۆژیش خوا کەریمە کەس نازانێ کێ لەپێش کێ دەمرێ و تەمەن شەرمی لەکەس نەکردووە، ئەوە دنیایە ئێمە نەماین بەگەردەن ئازاییەوە خانووەکە بۆ خۆتانبێ.

منیش پێموت: خوا پاداشتی بەخێرت بداتەوە بۆ ئەو هەڵوێستە جوانەت، باوکی ڕاستەقینە دەبێ ئاوا بیر بکاتەوە، بەو شێوەیە لە خەمی کچەکەی دابێ، ئەوەش سەربەرزییە بۆ جەنابتان، بەلاَم حەز دەکەم دەرفەتم پێ بدەی هەر لەو یەك دوو ڕۆژە وەلاَمت دەدەمەوە.

برایەکەم هەموو ئەو قسانەی بۆ گێڕامەوە کە ڕای من وەربگرێ.

منیش نەختێ سەرم بۆی لەقاندو وتم: کاکە مەمنوونی تۆ و ئەو کابرا بەڕێز و خواناسەم، لەلایەنی خۆمەوە زۆر زۆر پێم باشە لەگەڵ خێزانێکی ئاوا تێکەلاَوبی، هەروەکو خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێ:

﴿ ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ وَٱلۡخَبِيثُونَ لِلۡخَبِيثَٰتِۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِۚ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَۖ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٢٦﴾ ﴾ النور: ٢٦

ڕۆژی دوایی تەلەفۆنی کرد و هاتە لام، تەواوێك لەماڵمان مایەوە، کە پرسیاری دوا بڕیاریم لێی کرد، وتی: ئەمشەو بە دیقەت بیرم لەیەکە یەکەی قسەکانت کردەوە مەمنوونی ئەو کابرایەشم کە ئەوەندە متمانەی بەمن هەیە، بەلاَم هەقیقەتێك هەیە ناتوانین نکوڵی لێ بکەین، ئەویش ئەوەیە نامەوێ بۆ دەوڵەمەندبوونی خۆم زوڵم لەو ژن و پیاوە بکەم و بڵێم: مامەگیان لەخزمەتدام و نەتوانم خزمەتیان بکەم لەکاتێکدا ئەگەر من و کچەکەی بچینە دەوام و کچەکەی دوای دەوام تا درەنگی شەو بچێتە عیادە کەواتە چۆن دەتوانم خزمەتیان بکەم؟ دووبارەی دەکەمەوە گەلێك لێی مەمنوونم بەلاَم نامەوێ لەپێناو خانوویەکی ئەوها گەورە و دووڕۆژێتر ئەو سەروەت و سامانەی لەدوایان بەجێ دەمێنێ، درۆیان لەگەڵدا بکەم و بەڵێنێك بدەم نەتوانم جێبەجێی بکەم.

✍️ لەوەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ:

❁ یەکەم: موسڵمان چی بۆ خۆی پێ خۆشە، دەبێ ئەوەیشی بۆ بەرامبەرەکەی پێ خۆش بێ.

❁ دووەم: لەپێناو خانووبەرەو سەروەت و سامانی دنیا دەستەمۆی واقعێك نابێ ئەگەر نەتوانێ بەڵێنەکانی جێ بەجێ بکات و خزمەت بە بەرامبەرەکەی بگەیەنێ.

❁ سێیەم: باوکی ڕاستەقینە حەز دەکات کچەکەی بداتە کەسێك، بەر لەهەر شتێك خووڕەوشت بەرز و خواپەرستبێ.

✍️✍️ بەسەرهاتی دووەم:

**بۆ پارە خوشکەکەی بەکوشت دا**

**خوشکە گەورەکەم بۆی گێڕامەوە، وتی:**

✍️ لە کۆڵانەکەمان ژنێکم ناسی بەخوڵق و خۆ و گفت شیرین بوو، بەڕووکەش لەئافرەتێکی بێزەڕی نەرم و حەلیم دەچوو گومانت نەدەبرد پێی لە مێرووستانێك نابێ، خاوەنی سێ کچ و دوو کوڕ بوو، تەنانەت پیاوەکەیشی چاولەدەر و کەسێکی خراپ نەبوو.

خوشکێکی عازەبی هەبوو ڕەدووی کوڕێ کەوت و بەرەو ناوچەیەکی دوورە دەست ڕایانکرد، خۆیان دەخیلی سەرۆك عەشیرەتێکی ئەو دەڤەرە کرد، ئەویش دڵدەیدان و بەڵێنی پێدان تاوەکو لەماڵی ئەودابن بیانپارێزێ.

کەس و کاری کچە ( باوك و براکانی ) بەپارەیەکی زۆر تەماحگیری ئەو ئافرەتەی دراوسێمان دەکەن تاوەکو بەتەلەفۆن پەیوەندی لەگەڵ خوشکە بەدووکەوتووەکەی بکات و بەناوی سەردان و دیدەنیەوە لەدەرفەتێکدا بچێ قەناعەتیان پێ بێنێ لەگەڵی بێنە دەرەوە بۆ ئەوەی بەسەریان بدەن و بیانگرن، ئەویش لەپێناو ژیان و گوزەرانێکی خۆش بۆ ماڵ و مناڵەکەی، لەجیاتی ئەوەی پارێزگاری لەخوشکەکەی بکات و نەهێڵێ بەکوشت بچێ، بەو داوایە ڕازی بوو چووە لای باوك و براکانی، دوو دەفتەر دۆلاری کاشی لێ وەرگرتن ، ئەوجا تەلەفۆنی بۆ خوشکە ڕەدوو کەوتووەکەی کردو پێی وت: خوشکەکەم دەمێکە نەمبینیوی، گەلێ بیرت دەکەم، دەمەوێ بێمە لات.

ئەویش لە دڵساڤی خۆی لەو پیلانگێڕیە بێ ئاگایە پێی دەڵێ: منیش غەریبیت دەکەم، دەوەرە بەس ئاگات لەخۆتبێ کەس بەم کەین و بەینەی نێوانمان نەزانێ.

بەدەم پێکەنینەوە پێیدەڵێ: بەدڵنیاییەوە ناهێڵم کەس پێی بزانێ، بەڵام بۆمن خۆش

نیە بێ پرس و ڕای پیاوەکەم بەهیچ لایەکدا بڕۆم، هەوڵدەدەم هەر ئەمڕۆ بەدزییەوە قسەی لەگەڵ بکەم، ئەگەر زانیم ڕازییە، تەلەفۆنت بۆ دەکەمەوە.

بەئەنقەست خۆی دواخست، دوای تێپەڕبوونی دوو سەعات، تەلەفۆنی بۆ کردەوە، پێی وت: خوشکەکەم شوکر قەناعەتم بەپیاوەکەم هێنا، ڕوخسەتی دوو سێ ڕۆژم لێی وەرگرت لەماڵەوە ئاگای لەمناڵەکان ببێ و منیش دوای قەدەرێکی دی دەچمە گەراج و دەکەومە ڕێ، کەی گەیشتم پەیوەندیت پێوە بۆ دەکەم.

کەسێك لەو غەریبیە بچێتە سەردانی، شاگەشکە دەبێت، ناونیشانی خۆی و ماڵی سەرۆك عەشیرەتەکەی پێ داو لەچاوەڕوانی گەیشتنی وەستا.

ئەویش بەسەیارەوە لەگەڵ باوك و براکانی بەڕێ کەوت و کە نزیکی ئەو ماڵە بۆوە، نەختێ لە دوور دایانگرت و خۆشیان لەو شوێنە دوور کەوتنەوە، بەڵام تەلەفۆن لە بەینیان هەبوو کەی قەناعەتی بەهەردوکیان هێنا لەگەڵی بچنە دەرەوە، ئەوە بە دزییەوە تەلەفۆنیان بۆ بکات.

کە چووە لایان، خوشکەکەی لەباوەش گرت و تێر تێر ماچی کرد، بەدرۆ وتی: خوا خێری ئەو خاوەن تەکسیە بگرێ کە ناوی ئەو سەرۆك عەشیرەتەم بۆی باس کرد، یەکسەر منی گەیاندە ئێرە.

ئەو شەوە تا درەنگی وەخت قسەی خۆشیان کردو وای خستە گوێی خوشکەکەی گوایە ئێستا ماڵەوە دڵیان نەرم بووە لەهەوڵی دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەکی ئەم کێشەدان.

بەیانی دوای نانخوارد قەناعەتی پێیان هێنا کە ئەوان چونکە لەو ماوە دوور و درێژە پێیان لەو ماڵە نەچۆتە دەرەوە، بۆ هەوا گۆڕینێك لەگەڵیدا بچنە دەرەوە.

ئەوانیش ڕوخسەتیان لەخاوەن ماڵ خواست پیاسەیەکی دەرەوە بکەن، ئەو ئافرەتەش بەناوی دەست بەئاوگەیاندن چووە ئاودەست، بەهێواشی تەلەفۆن بۆ کرد خۆیان ئامادە بکەن ئەوە بەتەمان بێنە دەرەوە، ئەوانیش کەوتنە چاوەڕوانی، کە هاتنە دەرەوە، نەختێ لەو شوێنە دوور کەوتنەوە، ئەوان کە بەخۆ و دوو سەیارەوە هاتبوون، لێیان هاتنە دەست، هەردوکیان قۆڵبەست کرد و بەرەو شوێنێکی نادیاریان بردن کە دوای دوو ڕۆژ بەکوژراوی تەرمی هەردوکیان لە نزیك ئەو شوێنە فڕێدا کە لێی هەڵاتبوون.

ئەو ئافرەتەی بۆ نەختێ پارە ئەو کارەی ئەنجامداو بووە هۆکاری کوژرانی دوو کەس،

بەخەیاڵی خۆی پارەو پوول ماڵ و منداڵەکەی دڵخۆش دەکات، کەچی دوای دوو مانگ بەسەر ئەو رووداوە، باسی ئەو ئافرەتەیان کرد پیاوەکەی تەڵاقی داوە و چۆتەوە ماڵی باوکی، بەمەش وایلێهات هێندەی خەفەت لەو وەزعەی خۆی بخوات کە پیاو و منداڵەکانی لەدەستدا، وەکو شێتی لێهات ، لەماڵی باوکی ئەگەر نەیبەستنەوە خۆی رووت دەکاتەوە و بەکۆڵانان وەردەبێت، هەمیشە قسەیەك بەسەر زارییەوەیە دەڵێ: پارە، پارە.. کاتێکیش پارەی دەدەنێ دەمێك و دوان تێڕادەمێنێ ئەوجا دەداتە قاژ و قیژە و پارەکە جرووپر دەکات و دەیدڕێنێ.

* * *

لەوەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ:

یەکەم: مرۆۆ کە شەیتان زەفەری پێ ببات، ئامادەیە بۆ دینارێك برایەکەی بفرۆشێ.

دووەم: مرۆۆ هەڵەیە ئەگەر پێی وابێ دەتوانێ لەڕێی پارەیەکی پیسەوە بەختەوەری زیاتر بۆ خێزانەکەی دابین بکات.

سێیەم: هەموو کارێکی خراپ جگە لەخراپەکاری هیچی بەدواوە نیە.

چوارەم: خوشك و برا و خزماتی زۆر لە پارە گەورەترە مرۆۆ بۆ پارە کەسی خۆی بەکوژ بدات.

بۆ زاخاوی مێشك:

ناسیارێکم گێڕایەوە، وتی: برایەکەم لە زستانێکی سەرما و سوڵی تووشدا ئەسپێکی کڕیبوو، نیوەی شەوبوو چوو بەو شەوە سۆبە داری ئاگردا تاوەکو ئەسپەکەی سەرمای نەبێت، ئەوجا لەجێوە رورنی قرچاندەوە بۆ ئەوەی لەپشت و ملی ئەسپەکەی بدات. بەو دیمەنە تاسام، بەپەرۆشەوە لێم پرسی: توخوا ئەگەر من نەخۆشبم ئەوها بەدەورم دادێی؟

ئەویش بەدەم زەردەیەکەوە: نەوەڵڵا بۆچی ئەوها بەدەورت دابێم؟

کە وتم: ئەی من برات نیم؟

وتی: ئاخر ئەو ئەسپە پارەم پێی داوە بەڵام تۆ برای منی، پارەم بەتۆ نەداوە.

❀ ❀ ❀

قَالَ تَعَالَى:

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

﴿ بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِيئَتُهُ فَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٨١﴾ ﴾ البقرة: ٨١

# چی بچێنی، ئەوە دەدوورییەوە

هەمووومان ئەو فەرموودەی پێغەمبەرمان (ﷺ) بەرگوێ کەوتووە کە لەسەردەمی جاهیلیەتدا ئافرەتێك بەهۆی بەندکردنی پشیلەیەکەوە کە نە نانی دەداتێ، نە ئاو و نە بەڕەڵای دەکات تا پشیلەکە مرد، بەو هۆیەوە خوای پەروەردگار خستیە دۆزخەوە.

✍بەسەرهاتی یەکەم:

**چۆن سەیارەکەم لێی برد، ئاوا سەیارەکەیان لێ بردم...**

📖 ڕۆژێکیان من و باوکم لەگەڕەکی (باداوە) چووینە پرسەی ناسیارێ، هەتا بەرە بەری بانگی نیوەڕۆ لەو مزگەوتەی تەك ماڵیان مابنەوە، باوکم حەزی لێبوو بچینەوە، بەڵام خاوەن پرسەکە سوێندی لێ خواردین تاوەکو نانی نیوەڕۆیان لەلادا نەخۆین نەمێڵێ بەهیچ لایەکدا بڕۆین.

لەبەر دڵی ئەو مایەوە، کاتێك لە مزگەوت هەستان، لەگەڵ ئەو حەشاماتە چووینە ماڵی بابای پرسەدار، نانیان دانا، نان خورا و چا خواریەوە، ئەوەندەی نەبرد بەسەردا بانگی نیوەڕۆی دا، هەر لەوێ نوێژمان بەکۆمەڵ دابەستا.

ئەو ژوورەی لێی دانیشتبووین، جمەی دەهات، گوێم هەڵخست، گەلێ باس و خواسی تێا کرایەوە، لەدەرگای دەیەها باس درا، باس هاتە سەر ئەوەی پیاو چی بچێنێ، ئەوە بەدورێتەوە.

کابرایەکی بەتەمەن لەتەنیشت باوکمەوە دانیشتبوو، ڕووی کردە خەڵکەکە و بەسەرهاتێکی خۆی بۆ گێڕاینەوە، دەمی هەمووانی وەکو تەڵەی تەقیو داخست کە ورتەمان لەدەمەوە دەرنەیەت و گوێی بۆ قوڵاغ بکەن، وتی:

هیچ شتێك لە نەبوونی ناهەموار و پڕسوێ نییە[132]..ئەو قسەیە ڕاستە: نەبوونی سەگێکە ڕەگێکی لە هارییەوەیە.. پیاو ئەگەر نەبوو بێ، وەکو شێتی لێدێ و بەڕاست و چەپی خۆیدا دەکەوێتە پەلەقاژێ (شەلم کوێرم نابوێرم) کێی بەردەست بکەوێ، تێی ڕوو دەبێ و پەلاماری دەدات، کە هەندێ جار چی شتێك خودا پێی ناخۆشە، ئەو شتە دەکات.

بەیانیەکی زوو، تازە شەبەقی دابوو، گرانییە، لەماڵەوە نان نییە بیخۆین، منداڵەکان لەتاو برسێتی زیڕەیان ڕۆژە ڕێیەك دەڕوات.. قەرز و قۆی ئەم و ئەو سنووری هەیە کە لەسنووری خۆی دەرچوو بێتام دەبێ، لەناو خەڵك ڕەزات قورس دەبێ کە ئەوەی بتناسێ پارەت بەقەرز ناداتێ[133] هەر کارێکت بێتە پێش، خەڵکەکە خۆیت لێ دەشارێتەوە نەوەکو ڕووی لێبنێی، داوای شتێکی لێبکەی[134]

دەمانچەیەکم بەخواستن لە هاوڕێیەکم وەرگرت، یەك دوو جار دەمانچەکەم نایە سەر تەوێڵی نێوچەوانم خۆمی پێبکوژم، باشبوو هەر زوو شەیتانم بە نەعلەت کرد و پاشگەز بوومەوە، بە خۆمم وت: بە مردنم هیچ لەمەسەلەکان ناگۆڕێ، ئەگەر کێشەکان زیاتر گەورە و قووڵتر نەبنەوە کە ئەو ماڵ و منداڵەش پێیەوە سەرگەردانبن، وا باشە ورە بەر نەدەم و بە ئومێدەوە بژیم.. لێ ئەو بەیانیە بەکڵۆجێ خوێن بەری چاوی گرتبووم، هیچم وەك خۆی نەدەدی، دەمووت: یان دەبێ یەکێك بکوژم یان شتێك بـــە

---

[132] - عـن ابي هريـرة (ﷺ) قال: قـال رسـول الله (ﷺ): ( لـيس الغنـى عـن كثـرة العـرض، ولكـن الغنـى غنـى الـنفس). (بخـاري/ الرقـاق/٦٠٨١) واتـە: (ئـەبو هـورەيرە)(ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( دەوڵەمەندی بەشتی زۆر نییە، بەڵکو دەوڵەمەندیی ئەوەیە کە دڵ و دەروونت دەوڵەمەند بێت)

[133] - * ڕۆژێکیان کابرایەك بۆ قەرزو قۆ ڕووی لە ناسیارێکینا بڕێ پارەی بەقەرز بداتێ، کاتێك چووە لای، باسی مەینەتی خۆی بۆ کرد داهاتەوە توند هەردوو دەستی ناسیارەکەی ماچ کرد، کەچی ناسیارەکەی خراپتر داهاتەوە هەردوو قاچی کابرای ماچ کرد. کابرا واقی وڕما، بەتەوسەوە پرسی: ئەوە چیە بۆچی وات کرد؟ ئەویش لەوەڵامدا وتی: تۆ ئێستا هاتووی دەستمت ماچ کرد بۆ ئەوەی پارەت بەقەرز بدەمێ بەڵام بۆ دوو ڕۆژیتر من دەبێ قاچەکانت ماچ بکەم بەس ئەوەندە قەرزەکەم بدەیتەوە.

* کابرایەکی دەوڵەمەند هەبوو زۆر سەخی دڵ و دەروون بوو، ئەوەی بهاتایەتە بەر دەرگای ماڵی، نائومێدی نەدەکرد، ئەوەی دوای قەرزی لێ بکردایە، قەرزی پێ دەدا، وایلێهات تووشی ئیفلاسبوون هات، چونکە ئەوەی پارەی بەقەرز دابوویێ، پارەکەی نەدەدایەوە. ڕۆژێکیان کابرایەك بە کزۆڵیەوە هاتە لای و داوای قەرزی لێکرد، ئەویش بە دەم زەردەخەنەیەکەوە پێی وت: بەسەرچاو قەرزت پێ دەدەم، بەڵام دەترسێم قەرزەکەم بدەیتەوە.

شتێك بكەم.

خۆم گۆڕی، چوومە دەرەوە، لە چۆڵەوانییەكی جادەی سەرەكی، دەمانچەم خستە بەر پشدێنم و ڕاوەستام، تەكسییەك بەرەو ڕووم هات، لەدوورەوە دەستم لێڕاگرت، خاوەن تەكسیەكە هێواشی كردەوە تا لە جادە قیرەكە چووە سەر خۆڵەكەو ڕایگرت، بە بەری پشتەوە سووڕامەوە، دەمانچەی بەر پشتم دەركرد، ڕامكێشا و لەسەر سەری كابرام ڕاگرت و لێیم ڕاخوڕی: (هێێبێ وەرە خوارەوە تاوەكو نەمكوشتووی).

كابرای شوفێر ترس جێی پێ لەق كرد بوو، خەریكبوو خوێن لە لەشی بووەستێ و ببوورێتەوە، ڕوخساری وەك پەلكە پیاز زەرد هەڵگەڕا، بە هێواشی دابەزی و قاچەكانی عاردی نەدەگرت، پاڵێكم پێوەینا، سواری تەكسییەكە بووم و تێم تەقاند، ئەفسووف شەش سەد، حەوت سەد مەترێك ڕۆیشتم و نەڕۆیشتم، لە ناخەوە ویژدان ختووكەیدام بەخۆم بڵێم: ئەوە ئیش بوو كردت؟ كێ دەڵێ ژیانی خێزانێك لەسەر ئەو تەكسییە نییە وا بەپای پیلان بەم بەیانییە لێی دەرفێنی؟.

مووچركەیەكم بەلەش دەگەڕا، لەكەڵەموستی پێمەوە دەرچوو..هەستم بە پەشیمانیەكی زۆر كرد، لەجیاتی خۆقوتاركردن و تەفنیشكردنی سەیارەكە و فرۆشتنی، بەرەو لای خاوەنەكەی پێچم پێدایەوە ، لەسەیارەكە دابەزیم، بە دەم فرمێسك ڕشتنەوە سویچەكەیم پێیداو پێموت: فەرموو قوربان، داوای لێبوردنت لێ دەكەم، هەڵەیەك بوو ڕوویدا.

كابرا چاو ئەبڵەق بوو، بە پەرۆشەوە پرسی: چ شتێك وای كرد بگەڕێیتەوە؟ لەكاتێكدا من دەستم لەو سەیارە شووشتبوو جارێكیتر بیبینمەوە[١٣٥]

هەناسەیەكی قووڵم هەڵكێشا: ویژدان ڕێگەی پێ نەدام.. من دزو جەردە و ڕێگر نیم، ئەو دەمانچەیەم لە نەبوونی و نەداری خۆم هەڵگرت كەتنێكی پێبكەم، ویستم بەو دەمانچەیە خۆم بكوژم، دەستم نەچویی، دەی بەیارمەتیت.

---

[١٣٥] – كاك حاجی ( زیاد تەیب) لەسەرەتای ئەوەدەكان ماڵی لەهەولێر- گەڕەكی باداوە بوو، تەكسیەكی بەرازیلی هەبوو، ژیانی خێزانێك لەسەر ئەو سەیارەیە بوو، بەیانیەكی زوو چووە دەرەوە كارێك، كاسبیەك بكات، كەسێكی نەناس دەستی لێ ڕادەگرێ، ئەویش لەبەردەمیدا هێواشی دەكاتەوە، كابرا دەمانچەی لێ دەردێنێ و لەسەیارەكەی دادەگرێ و دەیبات، ئەوسا و ئێستاش كەس نەیزانی ئەو دزە كێ بوو؟ چارەنووسی سەیارەكەی بەكوێ گەیشت؟

سێ چوار شەقاو بۆ پێشەوە هەنگاوم هەڵگرت، کابراکە بانگی کردم، لە جێوە چەقیم، ڕووم وەرچەرخاند، بەرەو لام هات، دەستی نایە باخەڵی و شەدەیەك پارەی دەرهێنا (پارەیەکی زۆر) بێ ژماردن بۆی ڕاگرتم: فەرموو ئەو پارەیە ببە و بۆ منداڵەکانتی خەرج بکە، هەر لێرەوە هەزار جار گەردەنت خۆش و ئازابێ.

بەشەرمەوە وتم: ئاخر. وتی:ئاخر و ماخری پێ ناوێ من مەمنوونی تۆم، ئەی ئەگەر ئەو سەیارەیە ئاوە و ئاو بچوایە، ئەو وەختە چیم بکردایە؟ چیم لەدەست دەهات؟، فەرموو.

بەدەستی لەرزۆکەوە پارەکەم وەرگرت و سوپاسیم کرد..هەر بەو بەیانییە چوومە بازاڕ، خواردنێکی خۆشم پێکڕی و گەڕامەوە ماڵ، بەو نەختە پارە کەوتمە تێکەو لێکەی ئیشکردنێکی سەرپێیی، وردە وردە خۆم گرتەوە، لەڕێی برادەرێکەوە شتم بە قاچاخ لەو دیوی ئێران بۆ ئەو دیو دێنا، دوای چوار ساڵ ، بە دوو دەفتەر دۆلار تەکسییەکم پێ کڕی ئیشی پێبکەم، ئەفسووس ئەوجارەیان ئەوەی من چاوەڕوانیم نەدەکرد، ڕوویدا.

بەیانییەکیان تازە شەبەقی دابوو، چوومە دەرەوە داخیلییەك بکەم، ڕێك لەو شوێنەی کاتی خۆی دەمانچەم لە کابرا ڕاگرت، کابرایەك دەستی لێڕاگرتم، تەکسییەکەم هێواش کردەوە، لە جادە قیرەکە لامدایە سەر خۆڵەکە و بۆیم ڕاگرت، کابراکە بەلای پشتەوە هات، دەمانچەی بەر پشتی دەرکرد و لێی ڕاخوڕیم: هێنێی وەرە خوارێ تاوەکو نەمکوشتووی؟.

ڕەنگ و ڕووم تێکچوو، ترس هەوزەڵی بۆ هێنام، بە هێواشی هاتمە خوارەوە، توند پاڵێکی پێوەنام و سواری تەکسییەکە بوو، تێی تەقاند، من کاتی خۆی شەش سەد، حەوت سەد مەترێك ڕۆیشتم و ڕێوڕێ گەڕامەوە، بەڵام ئەو کابرایە چۆن ڕۆیشت، نەگەڕایەوە..سەری دنیام لێ وێك هاتەوە، لەو چۆڵەوانیە کەوتمە چاوەڕوانی سەیارەیەك هات بە پەلە سوار بووم و منی گەیاندە نزیکترین بنکەی پۆلیس، سکاڵام نووسی، ئەوانیش بۆ سەرەداوی دۆزینەوەی سەیارەکە، هیچیان پێنەکرا، لە خەفەتان یەك هەفتەیەك ئاگر لە ماڵمان هەڵنەکرا، ، ناهەق نەبووین چونکە هیچ لەوە ناخۆشتر نییە بەگەرما و سەرما و شەونخوونی پارەو پولێکی زۆر پێکەوە بنێیت، ئەوجا لەچاو تروکانێکدا ڕەنجت بەبا بڕوا و هەموو بەرهەمەکەت بفەوتێ، سەرەڕای ئەوەیش

هەمیشە دەموت: ئەوە تاقیکردنەوەی خوایە بۆ بەندەکانی، هەر خوا دەیدات و هەر ئەویش لێتی دەسەنێتەوە.

زەرەر تاڵە، بـــەو برە پارەی لە ماڵەوە مابوو، دەستم دایێ کاروکاسبی و ژیانێکی ئاساییم پێی بەڕێ دەکرد، وەلێ بۆ ساتێك چییە ئەو سەیارەم لە دڵ دەرنەدەچوو، دوای چوار ساڵ هەمیسا ئەوەی بە خەیاڵم نەدەهات، جارێکی دیکە ڕوویدایەوە.

ڕۆژێکیان کابرایەکی نەناس هاتە ماڵمان، تاوێ دوان مایەوە، وتی: ئەوەی ڕاستی بێت هەفتەیەك زیاترە بەشوێن تۆ دەگەڕێم، شوکر دواجار خۆت وماڵەکەتانم دۆزیەوە، من لە بەریتانیا دەژێم، هاوڕێیەکم "کاروان"ی ناوە، منی لە هەندەرانەوە ڕاسپارد ئەو ئەمانەتیەت بەدەست بگەیەنم، فەرموو.

بەبێ موبالاتی زەرفەکەم لێی وەرگرت، لە ناخەوە هەر وامدەزانی ڕەنگە نامە و شتێکی لەو چەشنەبێ، ئاخر من هاوڕێیەکم بەم ناوە لەدەرەوەی وڵات نییە.

کە زەرفەکەم هەڵپچڕی و کردمەوە، چوار دەفتەر دۆلار و نامەیەکی تێدابوو، نامەکەم کردەوە، ناسنامەی من و کاغەزێکی تێدا بوو، کاغەزەکەم خوێندەوە، نووسیبووی: برای بەڕێزم، سڵاوی خوات لێبێ، توخوا گەردەنم ئازاد بکە کاتی خۆی زۆر پەرۆشی ئەوەبووم بچمە هەندەران، لەماڵەوە دینارێکم شك نەدەبرد بیبەم، بۆیە ئەوەی کردم بەلێسەندنی تەکسییەکەت، بە داوای لێبوردنەوە هەر ئەوکاتە بەگۆترە بە دەفتەرو نیوێکم فرۆشت و بۆ ئەو هەموو ساڵە، وا لەگەڵ ئەو نامەیەدا (٤) دەفتەر دۆلارت بۆ دەنێرمەوە، مەمنوونت دەبم ئەگەر گەردەنم ئازاد بکەی. لە خوارەوە ناو و واژووی خۆی لەسەر کردبوو...دەمم بەش بۆوە!!!چاو ئەبڵەق بووم، وەك باوەڕ بەچاوەکانم نەکەم، چەند جارێ چاوەکانم هەڵگلۆفت: ئاخر من دەمێکە دەستم لەو سەیارە شوشتووە، هەرچەندە بەردەوام خەفەتی لێ دەخۆم. ئەویش وتی: کاروان لەو ساوەی گەیشتۆتە ئەوروپا، تا بە ئەمڕۆ ڕادەگا، هەمیشە خەفەت لەوە دەخوات چۆن ئەو زەرەر و زیانەی تۆ قەرەبوو بکاتەوە، بەردەوام دوعات بۆ دەکا هیچت بەسەر نەهاتبێ و لەژیان مابی.

وەك لە دەریادا دوڕ و گەوهەر بدۆزمەوە، کۆڵێ کەیفساز بووم، پێش ڕۆیشتن و گەڕانەوەی بۆ دەرەوەی وڵات، ژمارە مۆبایلەکەی کاروانم لێی وەرگرت و هەر ئەو ڕۆژە پەیوەندیم پێوەی کرد.

دواجار لە هاتنەوەی بۆ کوردستان پێش ئەوەی بچێتە هەر ماڵێك، سەردانی ماڵی کردم و ئەو سەردانە بەوە گەیشت، داخوازی شانازی کچم لێبکات، منیش دەرهـــەق بەو دەستپاکییەی ئەنجامیدا، پێشکەشیم کرد.[١٣٦]

*  *  *

✍✍بەسەرهاتی دووەم:

## شت کە بۆگەن بوو لەدەست دەردەچێ[١٣٧]

---

[١٣٦] - لەوساڵانەی ڕابردوو: لە شاری هەولێر ڕۆژێکیان کابرایەکی شوفێر بەسەیارەوە لەدووریا کە سەگێك دەبینێ ئەوە پێیەکانی پێشەوەی لەسەر جادە قیرەکە ڕاکشاندووە بێ ئەوەی ڕێی لەکەس گرتبێت، کابرا بە هـەوای هـەوەس لەبـەر خۆیـەوە دەڵێـت: واباشـە سـووکانی سـەیارەکەی بەسـەردا بشـکێنمەوە بـزانم قـەت قاچەکانی ناشکێنم! تیـژڕەو هـات، سـووکانی بـەلادا سـووڕاندەوە، تایـەی پێشـەوەی سـەیارەکەی بەسـەر قاچـەکانی دادا، سـەگەکە کەوتـە پەلـەقاژێی مـردن و هـەردوو قاچـی ورد و خـاش کـرد. کـابرا وەك ئـەوەی پاڵەوانەتیەکی گەورەی ئەنجام دابێت، بەو دیمەنە دڵخۆش بوو.

ڕۆژان هات و چوو، هەر بەو سەیارە بەهەمان شوێن گوزەر دەکات کە قاچی سەگەکەی لێ شکاند، کت وپڕ تایەی سەیارەکەی تەقی، بەناچاری لە شوێنە ڕایگرت و دابەزی، جەگی نـاو سندووقەکەی دەرکرد، خستیە ژێرییەوە بۆ ئەوەی تایە تەقیوەکە لێبکاتەوە و تایە سپێرەکەی لەشوێن دانێ. جەگەکـەی بـەرز کـردووە لـەپڕ جەگەکە خزاو هەردوو دەستی کەوتە ژێر سەیارەکە، بەمەیش دوای فریاکەوتن و گەیاندنی بۆ نەخۆشخانەی فریاکەوتن، دکتۆرەکان بڕیاریاندا هەردوو دەستی ببڕنەوە ( دەستیان بڕیەوە)

[١٣٧] - دەگێڕنەوە ڕۆژێکیا ن ئاغای گوندێك دەچێتە سەراو دەست بـەئاو بگەیـەنێ، دوو خورامکاری هـەبوون، خورامکارەکـانی لـە دوورەوە چاوەڕوانی هاتنـە دەرەوەیـان دەکرد تـا پشـتەماڵ و دەستشۆر و مەسینەی پڕ لەئاوی بۆ ببەنە بەردەم، بۆ ئەوەی بەسابوون دەست و پلی جوان بشوات، کەچی ئەوەی بووە جێی سـەرنجی یـەك لـەو دوو خورامکـارە کـە کابرایـەکی شـڤار و درێـژ بـوو بینـی ئاغـا چـەند جـارە هـەر دە دەقـە چارەگێکی پێدەچوو دەهاتە دەرەوە، ئەوجارەیان دوای زیاتر لەنیو سەعات، ئەوجا هاتە دەرەوە.

دەستشۆر و مەسینەی ئاو و سابوونی بۆ برد، کەجوان دەستی شووشت و بەپشتەماڵە(خاولی) سڕیەوە، ئاغا لەبـەر خۆیـەوە وتـی: ئەوەنـدەم پێچوو جگـە لەهەسـتکردن بـەئازار، هیچـم نـەکرد و هیچـم دانـەنا، بەڕاسـتی ناخۆشە ئەوەندە هەڵقونجێت و هیچت نەیەت.

خورامکارەکە وتی: ئەو ئیشەی تۆ ئاسانە.

کە لێی پرسی: چۆن ئاسانە لەکاتێکدا ئەوە نیو سەعاتە دانیشتووم ، هیچم نایێ.

وەڵامـی دایـەوە: قوربـان ئـەوجارەیان بەکـەیف و ئـارەزووی خـۆت شـت بخـۆ، ئـەوجا ئـەوەی لـە زگتـە بـا هـەر لەزگتبێ، چاوەڕوانبە تـاوەکو بەتـەواوی پـێ دەگات، کـەنگێ پێگەیشـت یەکسـەر بچووە ئاودەست و ئـەوەی لەزگتدایە بەبێ ئەزیەت و ئازار دێتە خوارەوە.

ئاغا نەختێ سەری باداو وتی، ئەو بیرۆکەیە شتێکی باشە، تاقی دەکەمەوە.

هاوڕێیەکم بەسەرهاتێکی خۆی بۆ گێڕامەوە، وتی:

من و مارف هەشت ساڵ لەخانوویەك کرێ بەیەکەوە بووین، هەردوکمان خاوەن ماڵ و منداڵ بووین، لەدوا دواییەکانی ئەو ساڵانە ئەوەی شێت و شبری کردم کچە گەورەکەی بوو، ڕەفتار و هەڵسوکەوت و جوڵانەوەی سەرنجی ڕاکێشام بەدزییەوە لێی بچمە پێش و پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ ببەستم، دواجار حەزمانکرد کۆتایی بەو بارودۆخە بێنین من بچمە داخوازی، ئەوە بۆ من نەختێك سەخت و دژوار بوو، لەلایەك من و باوکی هاوڕێی یەك بووین و وەکو یەك خێزان لەو خانووە بەیەکەوە بووین، بەناچاری ماڵم جیاکردەوە، خانوویەکی دیکەم بەکرێ گرت، بەکەمتر لەدوو هەفتە بێ گوێدان بەڕاز و حەزی ژنەکەم، ڕووم لە باوکمنا خوازبێنی کچەکەی مارفم بۆ بکات، کە ڕۆیشت و هاتەوە، وتی: ئەو ماڵە دەڵێن ئێمە کچی خۆمان سەربەهەوێ بەشوو نادەین.

دوای سێ جار چوونە پێش و ڕەتکردنەوەی، هیچ ڕێگەیەکم لەبەردەم نەما، من و کچەکەی لەشەوێکی ئەنگوست لەچاودا سەری خۆمان هەڵگرت، چووینە گوندێکی دوورە دەست، دوای بزربوونمان بۆ ماوەی دوو شەو، هەردوکمان قەناعەتمان بۆ دروست بوو کە ڕەدووکەوتن و ڕاکردن چارەسەر نییە، هاتینەوە نزیکی سنوورەکە و لەترسی هەڕەشە و کوشتنمان بەمۆبایل پەیوەندیم بەهاوڕێیەکی پۆلیسەوە کرد ئەویش بەسەیارەی دایەرە هات من و کچەی هەڵگرت و تەسلیمی بنکەی پۆلیسی کردین.

---

جەمی ئێوارە گەلێ شتی خوارد، لەنێو حەوشەی ماڵەکەیدا هات و چوو، تەواو تەنگاوبوو، بەمەیش پێی هەڵێنا، بەڵام پێڕانەگەیشت بڕواتە پێشاو، پیسایی بەخۆی داکرد، پیسایی بەنێو شەرواڵەکەی چووە ناو لینگی و شۆڕبۆوە بۆ ناو نەعلەکانی.

ئاغا ئەوەندە بەخۆی تەریق بۆوە، یەکسەر چووە حەمام و خۆی پاك کردەوە، کاتێك هاتە دەرەوە بانگی خورامکارەکەی کردو بەتووڕەییەوە پێی وت: وەرە بزانم بۆچی حەیات بردم؟

خورامکارەکە بەترسەوە زمانی گەڕاند: قوربان ڕەنگە هەڵەیە لەو مەسەلەیە دابێت.

لێی پرسی: مەسەلەی چی؟

وتی: من بۆ لابردنی ئەو ئێش و ژان و دانانی ئەوەی لەناو زگتە وتم: کەی پێگەیشت یەکسەر داینێ، بەڵام ئەوەی لەزگی تۆدابوو لە پێگەیشتن تێپەڕی، ترشا، بۆگەنی بوو، شتێکیش بۆگەنی بوو لەدەست دەردەچێ.

کەس و کاری مارف دوای بڵاوبوونەوەی ئەو هەواڵە، یەکەم ئیش بیکەین ئێوارەیەکیان بەتفەنگ هەڵیانکوتایە سەر ماڵی باوکم و خانووەکەیان بەبەر گوللەدا، خۆشبەختانە کەس ئازاری پێنەگەیشت و ئەوانیش جگە لەبەرگریکردن لەخۆیان، هیچیان نەکرد.

باوکم کەس نەما خۆی دەخلی نەکات و دەرگا نەما لێی نەدات، ئێستاش باوکی کچە نەهاتنە رایی، دەیانوت: ئێمە کچی خۆمان دەکوژین و حسیابێکیش بۆ کوڕەکەتان دەکەین.

باوکی کچە لە مەجلیسێ وتبووی: دەبوو لەو سێ چوارجار هاتنە پێشەوەی ئەو کابرایە بکەیشتمایە ئەو ماستە موویەکی تێدایە، ئێستاش وەزعەکە لە پێگەیشتن تێپەڕی، ترشا و بۆگەن بوو، سەرەڕای ئەوەی حەیاو حەوسەتمان چوو، دەبێ پەندێکی وایان بدەینێ هەرگیز لەبیری نەکەن و لەبنی دەرنەچن تەنانەت بەجۆرێکی وا پشتیان بەعەرد بدەین، ڕاست نەبنەوە.

دوای نزاو تکا و پاڕانەوەیەکی بێشومار، ڕازیبوون بە چواردەفتەر ئاوێك بەو ئاگرە دابکەن.

باوکم بەهەزار قەرزوقۆ ئەو پارە خڕ کردەوە بۆ ئەوەی من و ئەو کچە لەبەندیخانە دەربکات و سوڵحەکەی پێ بکات.

ئێستاش دوای تەمەنێك لەسەر ئەو بۆگەنبوونە، جگە لەوەی تەمەنم چووەتە ساڵەوە، هێشتان قەرزارم و قەرزی ئەو ڕۆژە دەدەمەوە کە بۆ دوو شەو و دوو ڕۆژ ئەو کچەم هەڵگرت بێ ئەوەی دەست لەدەستی بدەم، سەرەڕای ئەوەی سێ چوار جار چوومە خوزابێنی و هەر نەیاندا، لەناو خەڵکیش هەست بەوە دەکەم بەچاوێکی ترەوە سەیر دەکرێم.

## ۞بۆ هەر من خەفەت بخۆم؟[١٣٨]۞

[١٣٨] – سروشتی زۆر لەمرۆڤەکان ئەوەیە کە شتێك بۆ خۆیان نەبێت، نابێ بۆ خەڵکی تر ببێت، ئەوەتانێ سەرکردە دیکتاتۆرەکانی جیهان هەموو شتێکیان لەپێناو خۆیان کردووە، ئامادەبوون قوربانی بەهەموو دنیا بدەن بۆ ئەوەی لە گەمە سیاسیەکان ببەنەوە و خۆیان لەسەر کورسی دەسەڵات بمێننەوە.

لەجەنگی جیهانی دووەمدا لەنێوان ساڵانی (١٩٣٩–١٩٤٥) زیاتر لە سی ملیۆن کەس بوونە قۆچی قوربانی ئەو پرۆژە شوومە شەڕانیەی (هیتلەر)ی دیکتاتۆر کە هەموو دنیای بەخزمەتکاری ئاڵمانیا دەزانی، هەرچی شەڕێك ویستی کردی و ئەو گڕەی لەهەموو جیهانی بەردا، هەرچی کاولکارییەك هەبوو ئەنجامیدا و هەوڵی

پرسیار کرا لەپێغەمبەری خوا(ﷺ)لەبارەی ئەو هۆکارەی بەهۆیەوە خەڵکی بەهەشت بەدەست دەهێنن، ئەویش فەرمووی: ( لەخوا ترسان و ڕەوشت جوانی) ئینجا پرسیار کرا لەبارەی ئەو هۆکارەی خەڵکی دەباتە دۆزەخەوە، فەرمووی: ( زمانی بەد و داوێن پیسی)( رواه الترمذي) [139]

📖 چەند ساڵێك پێش ئەمڕۆ بابەتی نێو ڕۆژنامەیەك سەرنجی ڕاکێشام ئەویش دەستگیرکردنی ئافرەتێك بوو کە دووچاری نەخۆشی ئایدز ببوو، لەلێکۆڵینەوەی دادگا دانی بەو ڕاستیە دانا کە دوای تووش بوونی بەو نەخۆشیە زیاتر لە ٥٠گەنجی تووشی هەمان نەخۆشی کردووە.

ئافرەتەکە بەزمانی خۆی دەڵێت: بێ دڵی خۆم نەکرد، گەلێ کاری ناپەسندی سێکسیم لەگەڵ ئەم و ئەو ئەنجامدا ، کاتێك بەئاگاهاتم دووچاری نەخۆشی ئایدز هاتووم و دەزانم لەبێ چارەیی ئەم نەخۆشیەدا تەمەنم بەهەمووی لەسەر یەك خڕ بکەمەوە چەند ساڵێك زیاتر ناژیم، بۆیە تاوەکو هەر من بەو دەردەوە نەچم ئەوەی بۆم ڕێککەوتبێ لەگەڵیدا کاری سێکسیم ئەنجامداوە ، بۆچی دوای من خەڵکانێکی دیکە تووشی هەمان دەرد نەیەن و بەو دەردەوە سەر نەنێنەوە؟ بۆیە لەو ڕێیەوە زیاتر لە ٥٠ گەنجم تووشی ئایدز کردووە.

منێکی کۆڵەوار و بەیەخبار دوای تەمەنێك کە ئێستا خاوەنی دوو ژنم تازە تێدەگەم حاڵی ئەو ئافرەتەی دنیاویستە هیچی لەحاڵی (عەزیز) کەمتر نیە کە من بێخەبەر لەگوێی گادا نووستبووم ، دەستم بەکلاوەمەوە گرتبوو با نەیبات کەچی هێندەی هاتە بن کلێشەمەوە تووشی ژنهێنانی دووەمی کردم.

من ئەوەندە نەدەچوومە ماڵی عەزیز کە ئەو دوو ژنی هەبوو، هەمیشە دەیوت: ئەگەر حەز دەکەی بەهەشت بەچاوی خۆت ببینی و بەختەوەرببیت ئەوە وەکو من ژنێکم هەبوو کردمە دوو ژن، تۆش کە ژنێکت هەیە بڕۆ بیکە دوو، خۆشی دوو ژنی لەوەدایە

---

دەدا بەئارەزووی خۆی نەخشەی جوگرافیای دنیا بگۆڕێ و هەموو سەروەرییەکان بۆ خۆی بگەڕێنێتەوە کە هەموو ڕێگاکان بە ئالمانیادا گوزەر بکەن.

ئەو هتلەرەی سەدان هەزار کەسی لە ئاشە مەکینەدا هاڕی و دەربەدەر و ئاوارەی وڵاتانی کرد و کەسی لەخۆی بەبەرزتر نەدەزانی، کەچی کاتێك زانی ئالمانیا شکستی هێنا و دەبێ خۆی باجی ئەو شکست و ئەو زوڵمە زۆرە بگرێ کە کوشتنی خۆیەتی، بەدەستی خۆی، خۆی کوشت.

[139] - فەرهەنگی ئاسان- ل٧٢

لەبەر ململانێی نێوانیان خزمەتی باشت دەکەن، لەپێشبڕکێدان کامەیان خواردنی لەویتر خۆشترت بۆ دروست بکات، بەیانیان کە لەخەو هەڵدەستم، ئەو نەعلم بۆ دادەنێ، ئەوی دی خاولی بەدەستەوە دەگرێ هەر دەموچاوم شووشت لێناگەڕێ دەموچاوم بسڕمەوە، جوان جوان دەیسڕێتەوە، ئەی بۆ بەڕێکردنیم نالێی؟ کاتێك بۆ دەرەوە دەڕۆم ، ئەویان پێڵاوم بۆ بۆیاخ دەکات و لەبەردەممی دادەنێ، ئەویتریان جلەکانم بۆ دێنێتە پێش و تەپوتۆزی جلەکانی بەرم دادەتەکێنێ و لەقۆڵمی هەڵدەکێشێ.

قسەکانی بەجۆرێ کاریگەر بوو، لەبەردەوام دووپاتکردنەوەی ئەو قسانەدا مێشکی بەنجکردم کە بۆ زیاتر خزمەتکردنی خۆم سەرەڕای ئەوەی ژنەکەم زۆر ڕێزم دەگرێ و خزمەتم دەکا و جوان بۆ دەرەوە بەڕێم دەکات ئەوجا وەکو بەبێ پاساوێکی شەرعی و یاسایی بیرم لە ژنهێنانی دووەم کردەوە.

لەوەشا تاوەکو قەناعەتم بەو ژنەم هێنا قیری ڕەشم سپی کرد، چونکە حەزم نەدەکرد ئیشەکە بەناخۆشی بەڕێوە بڕوات یان بەهەڕەشەو چاو سوورکردنەوە، سەرەتا کەس نەما بەگژیەوە نەنێم، دواجار بەوە گرتم، وتم: فەرموو وەرە دەتبەمە بازاڕ بەئارەزووی خۆت لەزێڕ چی هەڵدەگری، هەڵگرە و لەشتی ناو ماڵ دەست دەنێیە سەرچی؟ ئەو مووە لەپیاو نەهاتبێ ئەگەر بۆتی نەکرم.

بەو قسانەم قەناعەتی هات، ئەوەی داوای کرد بۆیم جێبەجێ کرد و لەگەڕان و سووڕانی خۆمدا ژنێکم بەگەن[١٤٠] کرد، لەو ماوەیەدا چوومە خوازبێنی و گواستمەوە، بوومە خاوەنی دوو ژن، هەفتەی یەکەمم خۆش بوو، بەبێ تەقەو ڕەقە[١٤١] کارەکان بەڕێوە دەچوون ئیدی لەوەوە بووە فەرتەنە، ژنە کۆنەکەم دەیوت: پیاوەکە دەبێ بەرنامەمان بۆ دانێیت شەوێك لای من بمێنیتەوە و شەوێکیش لای ئەو.

ژنە نوێیەکە دەیوت:من بەو بەرنامەیە ڕازی نیم، چونکە تازە بووکم و تۆش کۆنە بووکی دەبێ هەموو شەوێك لەلای من بێت و بۆ هەفتەیەك مانع نابم ئەگەر شەوێك بۆ تۆبێ و لەلات بمێنێتەوە.

ژنە کۆنەکە دەیوت: من ماڵم دەبەمە قاتی سەرەوە، قاتی سەرەوەی ئەم خانووە بۆ منە.

---

[١٤٠] – بەگەن: دیاری کرد، دەستنیشانکرد.

[١٤١] – تەقەو ڕەقە: بێکێشە.

ژنە نوێیەکە دەیوت: خەیاڵت خاوە من لەتەپە تەپ و ڕمب و هۆڕی منداڵەکانت لەخوارەوە شەق دەبەم، ماقووڵ نیە بەهەر جووڵەیەکی ئێوە لەشیرینی خەو ڕابپەڕم و بەخەبەربێم، نەخێر من دەچمە سەرەوە.

چاو سوورکردنەوەی ئەو دوو ژنە بەوە گەیشت شێر ئاسا پەلاماری یەك بدەن، منیش هەر زوو لەبەر بچووکی بالأمەوە دەکەوتمە بن پێیان. لەو ڕۆژەوە هەزار و یەك تف لەخۆم دەکەم کە نەدەبوو ئەو ناماقوڵیە بکەم، چۆن بەقسەی عەزیز قوڕ بۆخۆم بگرمەوە وماڵی خۆم وێران بکەم.

تووڕەیی و بێزاری ئەو ژنانە وایان لێ کردم خولق و خۆم نەبێ و بەبایەخەوە نەچمە دەرەوە، ئەو دەمودوو و لوتفە شیرینەی جاری جارانم نەما کە پێشتر دەگەیشتمە هەر برادەر و هاوڕێیەکم، بەدەم زەردەخەنەو قسەی خۆشەوە باسی ژیانمان بۆ یەك دەکرد.

ڕۆژێکیان تووشی عەزیز بووم، ئاوچەوانم لێی گرژ کرد، بەتالووکەوە پێموت: تو ویژدانت ئەوە ئیش بوو کردت؟ فەرموو ئەگەر ئەو قسانەی تۆ نەبوایە هەرگیز خۆم تووشی ئەم وەزعە نەدەکرد، فەرموو نەخەوم خەوە، نە خۆراك و حەوانەوە، سێ جەمە لەماڵمان شەڕو ئاژاوەیە، جەمێك نەبووە بچمەوە ماڵ بەئیسراحەت نان بخۆم، ئێ چیبکەم پارەشم نیە بچم ملی خۆم بشکێنم و خانوویەکی سەربەخۆ بۆ هەریەکەیان بکرم.

عەزیز دایە قاقای پێکەنین، سەری لێی بادام، پێموت: بۆ پێناکەنی؟ کرێیەکەت بەلاشە.

که دایەوە قاقای پێکەنین، وتی: بۆ هەر من خەفەت بخۆم؟

بەو قسانەی چاوم زەق بۆوە، ئەوجا تێگەیشتم کە ئەو کابرایە لە زەلکاوی خەم و خەفەتی دوو ژنە دەتلێتەوە و حەز دەکات پێڕی وەکو خۆی زۆربێ، یەك لەوانە من بووم تووشی ئەو زەلکاوەی کردم.

پشتم تێیکرد و پێم هەڵێنا، تەواوێ ڕۆیشتم، کتوپڕ ئاوڕم لێیدایەوە، کە وتم: تۆ ئەو تەرحە پیاوەبیت، چیتر نە سەلامت لێ دەکەم و نەسەلامم لێ بکە.

من بۆ سەرەوە هەڵکشام ، ئەویش چۆن لەجێی خۆی وەك بتێکی بێگیان وەستابوو، لەجێی خۆی نەجولا.

* * *

## ❁داری عەیبە عەیب دەگری[١٤٢] ❁

هەموو عەیبێك عەیب نیە
هیچ گوڵێك بێ دڕك نیە
بەشخوراوبی داوا بکە
شەرم لەو عەیبەدا نیە
* * *

مرۆڤ عەیبە دروست دەکا
هەر خۆی بەرگی بەبەر دەکا
چەند باسی عەیبەی بۆبکەی
دەڵێ عەیبە و عەیبە دەکا
* * *

کەبەفر بەرگەی خۆر نەگرێ
خۆریش سەر بۆ شەو دادەگرێ
گەر ئەوەبێ یاسای ژیان
داری عەیبە عەیب دەگرێ
* * *

عەیبەیەك نیە ڕاو نەکرێ
کۆت و بەندی مەرگ نەکرێ
چەند سەرکێشی لەلوتکەبێ
دەبێ عەیبە سەرکوت بکرێ
* * *

ئەوە عەیبەیە کە عەیبە

[١٤٢] - شیعری: شاخەوان عەلی، گ: چرای ڕوو ناکی، ژ: (٦٨)، س٢٠١٤، ل٣٩

عەیب نەبێ و تۆ پێت عەیبە
دەست لەماقی خۆت هەڵمەگرە
بڵێن عەیبە، بۆ ئەو عەیبە
* * *

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( هیچ کام لە ئێوە نی یە مەگەر پەروەردگار قسە و گفتوگۆی لەگەڵدا دەکات، هیچ وەرگێڕ و یاوەرێك نی یە لەنێواندا، کاتێ تەماشای لای ڕاست و چەپی دەکات کردەوەکانی دەبینێتەوە و، کاتێ لەبەردەمی ورد دەبێتەوە ئاگر بەرەو ڕووی دێت، دەخۆتان لەو ئاگرە بپارێزن گەر بە لەتە خورمایەکیش بێت، خۆ ئەگەر نەدار بوون، لەتە خورماشتان نەبوو ئەوا بەقسەیەکی باش و چاك)(متفق علیه)[143]

بەپێی کلتوور و فەرهەنگ وداب و نەریتی لادێکەمان، ڕێز و ئەدەب و ئەخلاق پەیڕەو دەکرا، تالیق و تالیقکاری نەنگ و شوورەیی بوو مەگەر کەسێك ڕووی قایم بووایە و باکی بەوە نەبوایە وەك پەڕۆی پیس دەیشۆنەوە، تفی تێ دەگرن و جنێوی دەدەنێ، ئەوانە بە شەلاتی و سەرشێت ناویان ڕۆیشتبوو، کەسێ بەقسەیەك نەمرێ، بەخەنجەرێکیش نامرێ[144]

ئەو کەسانەی چاولەدەربن، کارو پیشەی بێئیشیان لە سەرەتاتکێ و چاوچاوانێ و دیق دیقانێ لەدەرەوە بەسەر دەبەن و بەئاسانی دەستەمۆو ڕاستەڕێی ئەو واقیعە نابن تا خۆیان بەپەلێك دا دەدەن و لێیان دەقەومێ.

کچێك لەگوندەکەمان هەبوو بەگەڵ دراوسێکەیان پەیوەندیەکی تەڕی هەست و سۆزداری ناشەرعی هەبوو، لە ڕێی کانی، لەپەناو پەسێران بەیەك دەگەیشتن و دەردە دڵی خۆیان بۆ یەکتری بە با دەکرد.

---

[143] - فەرهەنگی ئاسان- ئا:رزگار کریم- ناصح فتاح- ل٧٤

[144] – مرۆڤ چەند ڕۆشنبیربێ کە خۆی بەبەرگی ئەخلاق دانەپۆشێت، ڕۆشنبیر نیە، با هەڵگری گەورەترین بڕوانامە بێت، حاجی شاکر مزوری وتی: خزمێکمان لەخانەی پلار و توانجدانەوە گوایە دەیەوێ مەدحی گەنجێکی لەمەڕ خۆمان بکات، دەیوت: ئەو کوڕە کەسێکی ڕۆشنبیرە، ڕۆشنبیریەکەی لەسەروسیمای ڕەنگی داوەتەوە، ئەوەتا نیشانەکان ئەوەیە: لەجیاتی سمێڵدانان، سمێڵی خۆی تاشیوە، ڕوون لەسەری ئەدات، پێلاوی سەفینە (واتە: پێلاوی درێژ لەپێ دەکات) و پانتۆڵی تەسك لەبەر دەکا و بڕۆی هەڵدەگرێ.

ڕۆژێکیان برای کچەکە دەڕواتە ناو ڕەزان و لەوێوە شۆڕدەبێتەوە بەتەنیشت کانی ژنان تێدەپەڕێ، پڕتاو خوشکەکەی دەبینێ ئەوە لەگەڵ کوڕە دراوسێکەیان لە پەنای تووترکێکدا خۆیان کروسکە کردووە و فسکە فسک، قسە بۆ یەك دەکەن، بەو دیمەنە تێکچوو، بیرو هۆشی لای خۆی نەماو لەتووڕەییان بەسەریانی قیژاندن و دەستی بۆ کوتەکێك برد، پەلاماری کوڕەکەیدا، نایە بن خۆی، بکوتە و بکوتە، مارانکوژی کرد. دارێکی لەسەریدا، سەری شەق کرد و خوێن لەسەری فیچقەی کرد، ئەویش تاقەتی ئەوەی نەبوو دەست بکاتەوە دوو مستان بهاوێ و بەرگریی لەخۆی بکات، هەر ئەوەندەی پێیکرا خۆی لەبن دەستی دەربێنێ و بەسەری شکاوەوە هەڵبێت.

ئێوارێ منداڵەکان باسی ئەو شەڕەیان کرد، منیش لە پەرۆشی خۆم دوای نانخواردن چوومە ماڵی باوکی کوڕەی سەر شکاو ڕۆیشتم، پێشی هەر قسەیەك، گوێم بۆ هەڵخستن دەم و دوویان تاقی بکەمەوە بزانم چی دەڵێن و بەتەمای چین؟

باوکی کوڕە هەڕەشەی دەکرد، دەیوت: قەت موستەحیلە قیامەت هەستێ لێیان خۆش نابم ، ئاخر ئەو بەستەزمانە چی کردبوو؟ کوڕەکەم مێش لەدەمی خۆی ناکاتەوە، خێرە ئەوهای لێ دەکەن؟

منیش بۆ سوڵح و سەلاحەتی ئەو کێشەیە گەلێ شێر و ڕێویم بۆ هێنانەوە کێشەکە گەورە نەکەن، دواشت کە پێموتن: ئەوە بەڕاستی نیەتی ئێوەیە ؟

وتیان: لە هەقی ئەو زوڵم و جەور و ستەمەی کردیان، لەبەر خاتری تۆ بۆ ئەوەی ببنە پەند و تەمبێن، با بێنە پێش، قسە لەو سەرییەوە خۆشە من دەفتەرێکیان لێ دەستێنم.

کە دەمی ئەوانم تاقیکردەوە، تێگەیشتم نیەتیان چییە؟ لەوێ هەستام، چوومە ماڵی باوکی کچە تاوەکو بزانم ئەوان چ شەکرێك دەشکێنن و بەتەمای چین؟

کوڕە کەتنکەرەکەیان سەرتۆپی ڕووداوەکەی لەسیرێ تا پیوازێ بۆ گێڕامەوە، ئەوجا وتی: توخوا تۆش لەجیاتی من بوایەی وات نەدەکرد؟

پێموتن: بەسەرهاتێکتان بۆ دەگێڕمەوە دوور و درێژە بەڵام بەکورتی دەیبڕێنمەوە، لەم دەڤەرەی خۆشناوەتی لای خۆمان شەوێکیان کوڕ و کچێکی نامەحرەم لەژوورەوە پێکەوە دەگرن، دەمودەست کوڕەکە دەکوژن و کچەکەش دەهێڵنەوە، ئەوەی ئەو بنەماڵەی بناسیایە نەدەهاتە داخوازی و کچەکە تەمەنێکی بەڕێ کرد بێ ئەوەی کەس لای لێ بکاتەوە مەلایەکی خزمیان هەبوو سێ ژنی هەبوون، ڕۆژێکیان چووە ماڵیان و

پێیانی وت: ئەگەر ڕازیبن حەز دەکەم کچەکەتان لەو ئاگرە ڕزگار بکەم ئەوە چیە هەڵەیەکی کردوە و ئێوەش خستووتانە ناوییەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: ( کل بني ادم خطاء، و خير الخطائين التوابون) کەواتە بەدەقی ئەو فەرموودەبێ، هەموو مرۆڤێك دەبێ هەڵە بکات و تۆبەی هەر هەڵەیەك ئەوەیە جارێکی تر بۆی نەگەڕێیتەوە، بەڕاستی من بەتەمای ژنهێنان نیم بەڵام لەپێناوی خوا ئەو ئیشە دەکەم بۆ ئەوەی نهێنی و عەیب و عاری ئەو کچەتان بشارمەوە[145] کە بەهۆی نەزانیەوە هەڵەیەکی کرد ئێوەش ئەوە چەندین ساڵە لەماڵەوە بەندتان کردوە و سزای دەروونی دەدەن.

ئەوانیش دڵیان نەرم بوو، کچەکەیان لێی مارە کرد، شوکر ئێستا ژیانێکی زۆر خۆش بەسەر دەبات و بووەتە خاوەنی بڕێك منداڵ [146] مەبەستم لەو بەسەرهاتە ئەوەیە با ئاوێ بەو ئاگرە داکەین پێش ئەوەی گەورە ببێ و خەڵك پێی بزاننەوە و کەسایەتیتان بزڕێنێت کە ئەو شەڕە لەسەر ئەو کچە بووە، بۆیە قوڕ بۆ کچەکەتان مەگرنەوە بیکوژن کە ئەوە جۆرێکە لەشەرمەزاری، یاخود بیهێڵنەوە و بەمەیش ئەوەی بتانناسێ نەیەتە پێش و زوڵم لەکچەکەتان مەکەن. من پێش ئەوەی بێمە ئێرە سەردانیەکی ئەو ماڵەم کرد بزانم بەنیەتی چین و چیان دەوێ؟[147]

---

[145] - پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ: (من ستر عورة اخيه المسلم في الدنيا ستر الله عورته يوم القيامة)

نهێنی سێ جۆرە:

یەکەم: ئەو نهێنیانەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام فەرمانی کردووە بەنەدرکاندنیان.

دووەم: نهێنییەکە خاوەنەکەی داوای نەدرکاندنی دەکات.

سێیەم: ئەو نهێنییەی لەڕێی کارو پیشەوە ئاشکرابوو بێت کە پێویستە نەدرکێندرێ.

[146] – لە ئەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو لەگەڕەکی مەتتکاوە بەهۆی یەك قسەوە کە بە کابرایەکی خوێن گەرم دەڵێن: ئەرێ ئاگات لەوەیە خوشکەکەت پەیوەندی لەگەڵ فلانە کوڕ بەستووە؟ بەو قسەیە دەفع دەبێت، بەخۆ و دەستی بەچەکەوە دەچێتە سەر ماڵی کوڕە و دەستڕێژی ماڵیان دەکات، هەشت کەسیان لێ دەکوژێ کە دوو لەو ئافرەتانەی ئەو ماڵە زگیان هەبوو، لەسەروبەندی منداڵبوون بوون.

[147] - کوڕ و باوکێك بەیەکەوە خەریکی زەوی کێڵان بوون، بەرە بەری نیوەڕۆ پشوو دەدەن و دەست هەڵدەگرن، دەچنە ژێر سێبەری دار تووییەك و دادەنیشن، کوڕەکە لە قەت تەلانێك دانیشتبوو، باوکی جۆڕکی تووتنی لەبەر پشدێن بوو جۆڕکی دەرهێنا، کەوتە پێچانەوەی سیغار و جگەرەیەکی داگیرساند. ئاوە ئاوە جگەرەیەکی ئاگر دەدا.

کوڕەکەی بەدەنگێکی ئاسایی پێی وت: بابەگیان بێ زەحمەت ئەو کاغەز و تووتنەم نادەیتێ جگەرەیەك بپێچمەوە؟.

باوکی کچەکە لە قسەکانم ورد بۆوە، پرسی : داخوازیان چیە ؟

وتم: بەسوڵحی عەشایەری و تەنانەت بەیاساشبێ کوڕەکەی ئێوە کوڕی ئەوانی نیوە مرد کردووە ئەوە ڕاستیەکە نکوڵی لێ ناکرێ، ئەوان داوای دەفتەرێك دۆلار دەکەن، ئەگەر ئێوەش ڕازیبن وادەکەم ئەو پارەیە کەم بکەمەوە.

لێیان بووە مقۆ مقۆ: ئاخر ماقووڵ نیە حەیامان ببەن و پارەشمان لێ بسەنن.

پێیانم وت: پارەکە بدەن قازانجتانەو زەرەر ناکەن، فەرموو هەموو موڵك و ماڵ و پارەی دنیا دەتوانێ ناموس بگەڕێنێتەوە؟ کورد وتەنێ: جام بشکێ بەس نەزرینگێ، ئەگەر بەقسەم بکەن بەو کارەتان دەمی خەڵك دەگرن بەوەی ئەو مەسلەتیە بەهۆی دەمەقاڵێی بەینی خۆیانەوە بووە، خوێن گەرمن ئیدی بەشەڕ هاتوون و لێکیان داوە.

قسەکەی لێ وەرگرتم کە سەرەڕای تەعداکردن، پەنجا گەلاَش [١٤٨] بدات بۆ ئەوەی حەیاو کەرامەت و ناموسیان لەناو ئاوایی نەچێ.

هەرواش بوو، ساڵێکی بەسەردا نەسووڕایەوە، کچەکەیان داخوازیەکی قیت و قۆزی هات، بەمێردیاندا، ئێستا بووەتە خاوەنی سێ کوڕ و دوو کچ و ژیانێکی خۆش بەسەر دەبات[١٤٩]

---

باوکی وەکو مێشیشی میوان نەبێت، وەڵامی نەدایەوە، دووبارە ڕووی تێ کردەوە: بابەگیان بێ زەحمەت ئەو کاغەز و توتنەم نادەیتێ جگەرەیەك بپێچمەوە؟.

دیسان خۆی لەگوورە نەبرد و وەڵامی نەدایەوە، هەمان قسەی لێ سێ بارە کردەوە: بابەگیان بێ زەحمەت ئەو کاغەز و توتنەم نادەیتێ جگەرەیەك بپێچمەوە.

هەمدیس وەڵامی نەدایەوە..

کوڕەکەی داهاتەوە بایەکی لێ بەربوو، ئەویش تەماشایەکی کرد و بەدەم قاقای پێکەنینەوە پێی وت: دەك لێت دەرنێ بۆ خۆت و تڕت.

کوڕەکەش بەهەڵپەیەکەوە وتی: بابەگیان خێرە من سێ جار بانگم کردی و وتم: بێ زەحمەت ئەو کاغەز و توتنەم نادەیتێ جگەرەیەك بپێچمەوە، وەڵامت نەدامەوە، خۆ دەنگی من سێ هێندەی ئەو تڕە گەورە بوو کەچی گوێت لێ نەبوو، خێرە بۆ ئەو بایە ئەوەندە گوێت سووك بوو؟ (مەبەست لەم قسانە ئەوەیە خەڵکانێك هەن ئامادەن بۆ شتی خراپە گوێیەکیان بکەنە دوو گوێ بەڵام لەئاست حەقیقەت خۆیان گێل دەکەن)

[١٤٨] – گەلاَ: وەرەقە، دۆلار.

[١٤٩] – کاك تاهیر سماقوڵی بۆی گێڕامەوە وتی: پیاوێك لەماڵی خۆیان کوڕێك لەژووری کچەکەی دەگرێ و دەرگایان لەسەر کلیل دەدات، بەڵام نایانکوژێ، بەمێواشی دەنێرێتە دوای باوکی کوڕەو پێی دەڵێ: فەرموو کوڕەکەتان هاتۆتە ماڵمان و خۆی لەماڵمان کوتاوە شەرەف و ناموسم ببات ، منیش وتم: با بەتەنیا ئەو کارە

**✍ مام ( عەبدوڵڵا عومەر ئیسماعیل باجووری) لەدایکبووی١٩٥٤/٧/١بۆی گێڕامەوە وتی:**

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (هیچ بەندەیەك عەیب و عاری بەندەیەکی تر داناپۆشێت مەگەر پەروەردگار لەرۆژی قیامەتدا عەیب و عارەکانی دادەپۆشێت)(أخرجه مسلم)**

**✍ پیاوێکی نیشتەجێی شاری موصل چووە حەج، فەریزەی حەجی بەجێ هێنا، لەوێ خەوی بینی، پێیان وت: خوای پەروەردگار لە سەلاح قەساب خۆش بووە و کۆشکێکی بۆ لەبەهەشت دروست کردوە.**

**که لەخەوەکەی بێدار بوویەوە، وتی: دەبێ ئەو (سەلاح قەساب)ە کێ بێت؟ بۆچی من نایناسم؟**

**خەونەکەی بەهەند هەڵنەگرت، دووبارە چووەوە حەج و هەمان خەونی بینیەوە.**

**دیسان بایەخی پێ نەدا، وتی: خەون جێی ئیعتیبار نیە، بزانە بەداڵغەی چییەوە نووستووم و ئەو خەونەم بینیوە؟**

**لەساڵی سێ یەمی گەشتە ڕۆحانیەکەیدا، هەمدیس خەونی بینی، لەخەوەکەیدا پرسیاری جێ و ڕێی کابرای کرد و وەسفی شوێنەکەیان بۆی کرد.**

---

نەکەم، بۆیە بانگم کردی تاوەکو بزانم ئەگەر ڕازی ئەوە هەروکیان لەجێوە دەکوژم بۆ ئەوەی حەیامان نەچێت، خۆ ئەگەر تەگبیرێکی دیکەت لەلایە فەرموو قسە بکە گوێم بۆ گرتووی.

ئەویش وتی: من هیچ قسەیەکم نیە، ئەگەر تۆ ڕازیبی چیت دەوێ لەبری ئەو سەرشۆڕییە دەتیدەمێ و بەبێدەنگی بەیانی بانگی مەلا دەکەین و لەیەکیان مارە دەکەین.

حێرس دایگرتم لەناخەوە بەخۆمم وت دەبێ داغیان بکەم کە هەتا ماون بەو ئازارەوە بژێن بۆ ئەوەی بۆ منالەکانی دیکەیان ببنە پەند و پۆ، باشترین خانوو بۆ ئەو سەردەمە نرخی لە دوو هەزار دینار تێپەڕی نەدەکرد، من داوای هەشت هەزار دینارم لێیان کرد، گەلێ پاڕانەوە ئەو هەشت هەزارم بۆ کردنە شەش هەزار دینار، یەك دوو خانوویان فرۆشت و پارەیەکی باشیان قەرز کرد ئەوجا هاتنە پێش و کچەکەم پێدان.

ماوەی دە دوانزە ساڵ ئەو شەش هەزار دینارەم خستە بۆفیە و تۆپ و کلیلم دا، چاوم لەوە نەبوو یەك دیناری لێ دەربکەم و بیخۆم، بەڵام لەناخەوە هێندە ناڕەحەت بووم ئەوەندەی سەیری ئەو بۆفیەم دەکرد، وامدەزانی ئاگرێك بەبەردەوامی لەهەناوم دەکوڵێ، کە زانیم کچە و کوڕە زۆر لەگەڵ یەك سوڵحاون و ڕێزی یەك دەگرن، ڕۆژێکیان بانگیانم کرد و هەموو پارەکەم بۆ گەڕاندنەوە.

کاتێك گەڕایەوە، بەپرسیار لێرە بۆ ئەویَ سەلاّح قەسابی دۆزییەوە، بینی ئەوە دوکانی گۆشتفرۆشی هەیە و خەریکی گۆشتفرۆشتنە، لەبەرانبەری وەستا، سەلاّح تەماشای کرد و پێی وت: فەرموو برا، گۆشتت دەویَ؟

وەلاّمیدایەوە: ببوورە گۆشتم ناویَ من میوانی تۆم و بۆ لای تۆ هاتووم، میوان ڕادەگرن؟

بەپێکەنینەوە : هەی بیَ قەزابی، ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی؟ میوان خۆشەویستی خوایە.

یەك دوو کڕیاری نێو دوکانەکەی بەڕیَ کرد، لەجێوە هەندێك نەرمە گۆشتی خستە زەرفێکەوە، ئەوجا دوکانەکەی داخست و لەگەڵ خۆیدا بردیەوە ماڵ.

وەختی جەم داهات، ژنی کابرا سفرەی ڕاخست، لەتەك تەرتیبانی ئەو گۆشت و شلەی دابنابوو، شووشەییَ ئارەق و بیرەی دانا.

حاجی بەو دیمەنە سەرسام بوو، حەپەسا، لەدەروونەوە بەخۆی وت: هەبیَ و نەبیَ من بەسەهوو چووم، ئەوە چ خەونێك بوو؟ ئاخر بەهەشت و کۆشك و ئارەق و بیرە خواردنەوە کووجا مەرحەبا.

سەلاّح بەهەڵپەیەکەوە دەستی بۆ ئارەق و بیرەکە درێژ کرد، پێی وت: فەرموو فەرموو، ئەگەر حەزت لێیە دەتوانی لەو خواردنەوە بەشداربی!

* ببوورە من ئەو نانەی ناخۆم تاوەکو هەندیَ پرسیار هەیە لێتی دەکەم و بەڕاستی وەلاّمم نەدەیتەوە.

+ بپرسە تاوەکو وەلاّمت بدەمەوە.

* باشە تۆ نوێژ دەکەی؟

+ نەخێر نوێژ ناکەم.

* ئەی ڕۆژوو دەگری؟

+ پرسیارێکی سەیرە، من کە نوێژ نەکەم، چۆن بەڕۆژوو دەبم؟ من لەوەتەی خۆم ناسیوە هەر خەریکی خواردنەوەی ئارەق و بیرە و قومار کردنم، چی تر، بڵیَ؟

* ئەی باشە هیچ چاکەیەکت کردووە؟

+ چاکە؟ بڕوا ناکەم هیچ چاکەیەکم کردبیَ بەچاکە بچیَ.

* وامەڵێ، تۆ چاکەیەکی گەورەت کردووە و لێمی دەشاریتیەوە، جوان بیر بکەوە هەتا ئەو شتەم پێ نەڵێیت، دەم لەو خواردنەتان نادەم .

ئەویش کەمێ بیری کردەوە، ئەوجا وتی: ئاااا، یەك چاکەم بەبیردێ ئەویش ئەوها نیە کە ئەوە یەکەمجارمە لەژیانمدا باسی بکەم، ئەو ژنەی بینیت هاتە ژوورەوە و نانەکەی لێرە دانا، ئەوە خێزانمە، کاتی خۆی کچێکی زێبا و جوان، کچی والی ئەم شارە بوو، ڕۆژێکیان سێ دز دەیرفێنن، دەیبەنە دەرەوەی شار، ڕێك دەیبەنە ناو ئەو کەونە ئاشەی[150] دەم ڕووبار کە من ڕۆژانە بۆ ئارەقخواردنەوە دەچمە ئەو شوێنە، بەدەم ئارەق خواردنەوە لە ئاشەکە نزیك بوومەوە گوێم لە نرکە و ناڵە و هات و هاواری ژنێك بوو، هۆیێکم لەخۆم زانی، بەهێواشی پێم هەڵێنا، لەدەنگەکە نزیك بوومەوە بینیم ئەوە سێ زەلامی کەترە تەعەروزی ئەو ژنە بوونە و تەعدای لێ دەکەن، زۆر دەهەری بووم نەمکردە نامەردی، ئەو تەورەی[151] بەزنجیرەوە لە قایشی بەرپێڕدێنم بەستابوو، دەستم بۆی برد و تێیان ڕوو بووم، تەورێکم لەپشتی یەکێکیان دا دڵنیام کوشتوومە هەرچەندە بەجەستەی برینەوە هەڵهات و دووەکەی دەیکەیش بەدوایەوە ڕایان کرد.

کە ڕووم کردە کچەکە و تەورەکەم لێی ڕاست کردەوە بیکوژم، نازانم بۆ دەستم نەچوویێ؟ لەناخەوە بەخۆم وت : ئەگەر بزانم بەحەزی خۆی بەدوایان کەوتووە ، ئەوە هەر لەم شوێنە لەت و پەتی دەکەم و لەکۆڵ دنیای دەکەمەوە ، چاوم لێی زەق کردەوە، ناوچەوانم لێی گرژ کرد و بەدەنگێکی بەرزەوە هاوارم بەسەردا کرد: وەرە بێ ئەدەب، پێم بڵێ بۆ خۆت بەگەریان کەوتی یان بەزۆر تۆیان هێناوەتە ئێرە؟

بەدەم گریانەوە کە فرمێسك لەچاوانی وشك نەدەبوو، سەیری کردم و وتی: بەو خوایە خیلاف ناڵێم، من کچی والی ئەو شارەم چۆن بەهەومنتە حەیا و نامووسی خۆم دەبەم؟ ئەوانە منیان ڕفاندو منیان هێنایە ئێرە، تکایە دەستم دامێنت، چارەیەکم بکە! وەرە بمکوژە کوشتنی خۆم زۆر لەوە پێ خۆشترە لەوەی بەسەرشۆڕی بچمەوە ماڵ و سبەی و دووسبەی خەڵك بەم کەین و بەینە بزانن و حەیامان بچێ نەخاسمە ئەگەر داخوازیم هات و بۆیان دەرکەوت کچ نیم چ جوابی خۆم بدەمەوە؟

---

[150] – ئاش: ئاسیاو، شوێنی هاڕینی گەنم و جۆ.

[151] – تەور: چەقۆی ئێسقان شکاند و وردکردن.

پێموت: من ئەوەندە بەڕەحم نیم بەڵام کە ناوی خوات هێنا، ئەوە لەپێناوی ئەو خوایە لەم لەحزەوە ئەو نهێنییەت دادەپۆشم و دێمە داخوازیت ئەگەر باوکت ڕازیبێ، دەتهێنم و دەتکەمە ژنی خۆم.
چوومە خوازبێنی، دوای پرس و ڕا و ڕاوێژ، تێکڕا بەو داوایە ڕازیبوون، گواستمەوە، ئێستاش زۆر لەبەری مورتاحم کە دەبینم خێزانەکەم بەئەدەب و ئەخلاقە.
حاجی ئاهێکی قووڵی پڕ بەسییەکانی هەڵکێشا و سەری بۆ لەقاند، کە بەیانی حاڵی خەونەکەی بۆ باسکرد کە سێ ساڵە لەسەر یەك خەوێکی لەو شێوەیە دەبینێ، سەلاح قەساب بەو هەواڵە دڵخۆش بوو،فرمێسکی لەچاو داباری و تۆبەیەکی نەصوحی کرد، لەو ڕۆژەوە هەموو ئەو پارانەی بەحەرام لەڕێی قومارەوە کۆی کردبوونەوە، هەر هەمووی بەخشی و بەیەکجاری وازی لە قومار کردن و ئارەقخواردنەوە هێنا و دەستی بەخواپەرستی کرد.

* * *

عن ابي هريرة(ﷺ) قال: قال رسول الله(ﷺ): ( الايمان بضع و سبعون- او: بضع و ستون- شعبة، فافضلها قول لا اله الا الله، وادناها اماطة الاذى عن الطريق، والحياء شعبة من الايمان).(بخاري/ الايمان/ امور الايمان/٩)
(ابو هريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:( ئیمان حەفتا و ئەوەندە- یا شەست و ئەوەندە- بەشە، گەورەترینیان وتنی شایەتومانە، بچوکترینیان لابردنی کۆسپێکە لەسەر ڕێگایەك، شەرم و حەیاش بەشێکە لە ئیمان).

# ۞هەندێ بەسەرهات وسەرگوزشتەی دەربەندی کەندێناوە، سادە بەڵام پڕ مانا...

❀مامۆستا( فەرهاد قادر ئۆمەر)[١٥٢] هەندێ لەو سەرگوزشتانەی بۆ گێڕامەوە کە لەبنەڕەتدا زۆر سادەن، بەڵام لەماناداا گەورەو پڕ پەندن، وتی:

✍ئۆمەری مام فەقێ هەبوو کە لەناو هۆزی سیانەتی ڕێزی لێ دەگیرا وخەڵکی گوندی قوچی کەندێناوە بوو، ئەم ئۆمەری مام فەقێیە پیاوێکی قسەزان و دەستڕۆیشتوو دەوڵەمەندبوو، لەکۆڕو مەجلیساندا هەمیشە قسەکانی جێی ئیعتیبار بوون، مام ئۆمەر گێڕایەوە گوتی: لەلای خۆمان خزمێك هەبوو تۆزێك لەسەر بوو، ئەو خزمە کوڕێکی هەبوو، کوڕە تووشی نەخۆشی دەروونی دەبێ، کابرا کوڕەی بردە لای دکتۆرێکی دەروونی.. کەچوونە لای دکتۆر، لێی پرسین: کامتان نەخۆشەکەیە..؟ کابرا دەستی کوڕەکەی گرتبوو، وتی: دکتۆر گیان ئا ئەوە نەخۆشەکەیە..! دکتۆرەکەش ڕووی لەباوکی کوڕەکە کردو گوتی: وەڵڵا بابە ئەو سەد قات ئەهوەنترە لەتوو.

✍✍ حاجی عەولای مام ئۆمەر بەگی هەبوو لەدەربەندی گۆمی کەندێناوە، پیاوێکی زۆر بەناو وشۆرەت بوو لەڕووی پیاوەتی ودەستگرتنی خەڵك، جگە لەوەش پیاوێك بوو بەدەست و قامەی خۆی مەرد بوو، تا ئەو کاتەی لەژیاندا بوو لەماڵەکەیدا هەمیشە مەجلیسی گەرم و گوڕ بوو، بەتایبەتی شەوانی زستانان تا درەنگی شەو، خزم وکەس لەوێ گردەبوونەوە.. ئەو پیاوە سیفەتێکی زۆر جوانی هەبوو، ئەگەر کابرایەك لە مەجلیسێدا لامل و عیناد بوایە لەسەر ڕاوبۆچوونی هەڵەی خۆی، ئەو بەهێمنی پێی دەگۆت: قسەی تووە کوڕم.. پاشان بەتەنیا لەگەڵی دادەنیشت ئامۆژگاری بەوە دەکرد، کە پیاو لەمەجلیساندا نابێ تێکدەری مەجلیس بێ، بەڵکو پێویستە چرای مەجلیسان بێت..! خودا هاوتای ئەو پیاوە لەناو کوردا زۆر بکات.

---

[١٥٢] - مامۆستا ( فەرهاد قادر ئۆمەر) کەسێکی خواناس و مەشرەبخۆشە، ساڵی ١٩٦٧لەهەولێر لەدایك بووە، نووسەر و ڕۆژنامەنووس، کتێبێکی بەناوی( بەفر بۆچی سپییە) بەچاپ گەیاندووە کە کۆمەڵە چیرۆکێکی منداڵانە و دوو کتێبی دیکەی بەناوی( ١- هەنگ/ منداڵان ٢- ئیسلام و ژیان/ ئایینی) ئامادەی چاپە.

✍✍✍دەگێڕنەوە لەوەختی خۆیا کوڕ وباوکێك لەیەکێك لەگوندەکانی کەندێناوە دەبێتە دەمەقاڵێیان، باوکە قوڕبەسەرەکە دەچێتە لای مدیر ناحیەی دیبەگەو سکاڵا لەسەر کوڕەکەی دەنووسێ. مدیر ناحیەش دوو پۆلیس بەدوای کوڕەکەیدا دەنێرێت ودەیهێنن، بەتوڕەییەوە لێی دەپرسێ: کوڕم لۆ لەگەڵ باوکت خراپی. ئەویش خۆی دەینی ودەبا نازانێ چی بڵێ؟ ناچار دەڵێ: گەورەم لەچاوت دەترسێم، چاوت بگرە جوابت دەدەمەوە.. مدیر ناحیەش چاوی خۆی دەگرێ ودەڵێ: دەی بڵێ. ئەویش مەجاڵێك وەردەگرێت، تێ دەتەقێنێ و لۆی دەردەچێ.

✍✍✍سالێك لەگوندی سێبیرانی گەورە مامۆستا بووم، لەم گوندە پیاوێك هەبوو واتێبگەم ناوی حاجی ئەحمەد بوو، ئەم حاجی ئەحمەدە ماوەیەك نەخۆش کەوتبوو، خزم وکەسوکارەکانی بەدەوریەوە بوون، لەو حەدوسەدەدا یەکێك لەگوند عەمری خوای دەکات.. خەڵکی گوندی حەفارەیان هێناو دەستیان بەقەبر لێدانێ کرد، هێشتا قەبرەکە تەواو نەببوو خەبەریاندا کەسێکی دیکەش مرد، کەسوکارەکانی حاجی ئەحمەدی لەناوە خۆیان مقۆ مقۆی ئەوەیان بوو کە ئەوراقی حاجی ئەحمەدیش لەمەعامەلەیەو قەبرێکی بۆ ئەویش لێ بدەن، حاجی ئەحمەد کە گوێی لەو قسانە بوو سەری ڕاستکردەوە، گۆتی: ئەرێ بابە بە ساحێبی ئەو حەفارەیە بڵێن لێرە نەمێنێ.

✍✍✍✍لەگوندی دەربەندی کەندێناوە پیاوێك هەبوو ناوی حەمەدی ڕەشەی بوو، ئەو مام حەمەدی ڕەشەی جارێك دەچێتە بەغدا، تەلەفزیۆن تازە کەوتبووە ئێراقەوە، مام حەمەد زۆر بەلایەوە سەیر ئەبێ، کە هاتبۆوە خەڵکی ئاوایی هەموو هاتن بۆ دیدەنی، دیوەخان گەرم وگوڕ بوو، باس وخواسی تەلەفزیۆنی بۆ خەڵکەکە دەگێڕایەوە کە چۆن کەسێك لەناو سندووقێکدایەو قسە بۆ خەڵك دەکات، باسی هەموو دنیایێ دەکا، بەڵام سەیر ئەکا خەڵکەکە باوەڕی پێ ناکەن وبەدرۆی ئەزانن.. بۆیە ناچار دەیکا بەگاڵتەو پێکەنین ودەڵێ: خزمینە ئەوە خەون بوو. دوای ماوەیەك خەڵکێکی دیکە دەچنە بەغدا و هەواڵی تەلەفزیۆن دێننەوە، مام حەمەد کە زانی شتەکە ڕوون بۆوە، دەست دەکات بە جنێودانیان و دەڵێ: هەی ناکەس بەچەینە من هی ئەوەمە درۆ بکەم، ئەوێ ڕۆژێ قسەکانم دەگێڕایەوە بینیم هەمووتان زەردەخەنەتان دەهاتێ وەك ئەوەی بڵێن: مام حەمەد درۆ دەکات، دەئێستا زانیتان ڕاستە؟

✍✍✍✍✍✍✍مامۆستا دەشتی خورشید، خەڵکی بیرەجنەیە گێڕایەوە، گوتی: لەو گوندانەی دەوروبەری ئێمە کەسێکی کاڵفامی منداڵکارە هەبوو، جارێك ئەو منداڵکارە دەستی ڕاخستبوو، هەندێ دانەوێڵەی لەسەر ڕوو کردبوو، پەنجەی گەورەی گەیاندبۆوە پەنجەی شەهادەی، یەکێك بەلایدا تێپەڕی پێی گوت: ئەوە چ دەکەی..؟ ئەویش گوتی: دەمەوێ کێشکەی بگرم کە کێشکەکە هات دانەوێڵەکە بخوات، پەنجەکانم دادەخەم و ملی کێشکەکە دەگرم. کابراش بە منداڵکارەکەی گۆت: کەس هەیە لەتوو کەرتر؟ منداڵکارەکەش گوتی: بەڵێ، ئەوانە پارەشیان واسل کردیە، پەنجەی بۆ کۆمەڵە کەسێك درێژ کرد کە لە پەنای دیواری مزگەوتێ دانیشتبوون.

* هەر مامۆستا دەشتی خورشید گێڕایەوە گۆتی: لەو گوندانەی دەوروبەری ئێمە مام فەتاح ناوێك هەبوو پیاوێکی دنیا دیتەو قسەخۆش بوو، منداڵەکانی مام فەتاح کۆتریان ڕاگرتبوو، ڕۆژێکیان مام فەتاح لێیان تورە دەبێت، کۆترەکان دەباتە مەیدانی کۆتران تا بیانفرۆشێ، کڕیارێکی لێ هەڵدەکەوێ و بە مام فەتاح دەڵێ: ئەو کۆترانە چەند دەفڕن..؟ مام فەتاحیش دەڵێ: دوو سەعاتێك لەئاسمان دەمێننەوە..! کابرای کڕیاریش دەڵێ: کاکە دوو سەعات چییە ئەو کۆترانەی من شەش سەعات دەفڕن. مام فەتاح سەری سوڕ دەمێنێ، بەلآم بەسەر خۆی ناهێنێ و ڕوو لە کابرا دەکات وپێی دەڵێ: بابە ئەو کۆترانەی من شێت نیینە بەو گەرمایەی شەش سەعات لەئاسمانێ بسوڕێنەوە.

✍✍✍✍✍✍✍مەلا ئاوات گێڕایەوە گوتی:لەو دەشتی کەندێناوە سمایل ناوێك هەبوو، هەندێ پارەی عەرەبێك قەرزار بووە، خەبەریان دایێ کابرای عەرەب هاتووە قەرزەکەی ئەوێتەوە.. ئەویش کە زانی ئیشەکەی خراپ هاتووە، خۆی خزاندە ناو جێ وُ بالیگانێ، ئەمرۆ نییە چەند ساڵە نەخۆشەو لەعەلاو وەلاییە.. کابرای عەرەب کە سمایلی بەو حاڵە دیت، زۆر پەرۆشی بوو، پێی گوت: سمایل هەستە مەمرە، قسەکی لۆ ئەو خەڵکەی بکە چەندی من قەرزاری؟

*مامۆستا یونس حەداد گێڕایەوە گۆتی: ساڵی ١٩٥٥ بوومە مامۆستا لەدەربەندی گۆمی کەندێناوە، سەرەتا تەنها یەك پۆل هەبوو، ساڵی دواتر هۆبەیەکی دیکەمان زیاد کرد بۆ پۆلی دوو، بۆ ساڵی سێیەم، تەوێلەیەکی گەورە هەبوو لەتەنیشت قوتابخانە بەناچاری ئەو تەوێلەیەمان خاوێن کردەوەو تەرتیبمان کردو بوو بە پۆلێك.

لەو قوتابخانەیە زۆربەی قوتابیەکان کوڕ بوون، تەنها دوو کچ هەبوو، ئەوانیش کچەکانی عەزیزاغا بوون.. بەپێی گێڕانەوەکانی مامۆستا یونس ئەو وەختی (تەغزیەی مەدرەسی) هەبووە کە شیرو بسکوێت وقەسپ وجۆرە حەبێکیان دەدا بە قوتابی پێی دەگوترا جەرگی نەهەنگ (كبد الحوت). بە پێی یادەوەریەکانی، دوو ساڵ دوای دەستبەکاربوونی دوو مامۆستایتر هاتن کە عەرەب بوون بۆ قوتابخانەی گوندەکە، مامۆستا یونس قسەیەکی خۆشی گێڕایەوەو گوتی:" مامۆستاکان هەندێك فێری کوردی ببوون، بەڵام هێشتا دووکەڵیان دەکرد، ڕۆژێك گوێم ڕاگرتبوو، یەکیان وانەی ماتماتیك(بیرکاری) دەگوتەوە دەیگووت: "ئەربعە زائید دوو یوساوی شەش" هەروەها لە بەسەرهاتێکی دیکەدا گێڕایەوە کە ڕۆژێکیان لەقوتابیەك دەدات، دایکی قوتابیەکەش دێتە قوتابخانە کەمێك بۆڵە بۆڵ دەکات، ئیدی دڵی مامۆستا یونس تۆزێك گەردی دەگری ولەبەر دڵی گران دەبیٚ، ئەو قسەیە دەگاتەوە مام فەقیٚ کە جوامێرو پیاو ماقوولی ناوچەکە بووە، ئەویش یەکسەر دێتە سەر ماڵەکەو پێیان دەڵیٚ: ئەمن قبوڵ ناکەم جارێکی دیکە شتی وا دووبارە بکەنەوە، مامۆستا لەبەر ئەوە هاتۆتە ئێرە منداڵەکانی ئێمە پەروەردە بکات وفێری خوێندن ونووسینیان بکات، دەبیٚ ئێمە ڕێزی بگرین وبە برا گەورەی خۆمانی بزانین، پاشان باوکی قوتابیەکە هاتەوە لای مامۆستا لەبری خێزانەکەی داوای لیٚ بووردنی لەمامۆستا کرد، هەتا وەکو ئەو ڕۆژەی خزمەتی مامۆستا لەو گوندەی بوو شتی وا ڕووینەدایەوە.

✍✍✍✍✍✍✍✍✍✍مامۆستا سەلام عومەر قادر گێڕایەوە گوتی: ساڵانی دوای ڕاپەڕین یاریدەدەری بەڕێوبەر بووم لەقوتابخانەی ڕاستی لەگەڕەکی تەیراوە، ئەو ساڵە میلاکی مامۆستا لەو قوتابخانەیە کەم بوو، بۆیە منیش ئایینی پۆلی دووی سەرەتاییم وەرگرتبوو.. ڕۆژێك قوتابیەکانم تاقی دەکردەوە لەوەی خوێندوومانە، نۆرە گەیشتە قوتابیەك، پرسیارم لیٚ کرد هیچ وەڵامی نەبوو، پاش ئەوەی تۆزێك داما، بەدەست ئیشارەتێکی بۆ کردم، منیش لێی چوومە پێش، سەری خستە بن سەرم پێی گووتم: مامۆستا پێنج دینارم پێیە، ئەگەر ١٠ دەرەجەم بدەیی، پارەکەت دەدەمیٚ.. منیش ئەوەم زۆر پیٚ سەیر بوو، منداڵێك لەو تەمەنە بەو شێوەیە بیر بکاتەوە، لێم پرسی: کوڕم بابت چ ئیش دەکات؟ تومەز باوکی ئیشی قاچاغی دەکرد، ئیشی قاچاغییش

وایـه هه‌میشـه پـاره‌و بـه‌رتیل ده‌دات، منداڵه‌کـه‌ش هـه‌مان ئـه‌و تـۆزو خـۆڵ و غوبـاره‌ی له‌سه‌ر نیشتووه.

✍✍✍✍✍✍✍✍✍هاوڕێیـه‌کم هه‌یـه نـاوی شـه‌وقیه، ئـه‌و شـه‌وقیه بـه‌مۆبایل کورته نامه‌یه‌کی بۆ نووسـی بـووم، ده‌ڵـێ: **دابه‌شی مه‌که‌ن، به‌ش به‌شی مه‌که‌ن یه‌ك نیشتمانه، ماڵی هه‌مووانه پێکه‌وه جوانه ئه‌م کوردستانه،** منیش له‌کورته وه‌ڵامێکدا به مۆبایل به‌م شێوه‌یه وه‌ڵام دایه‌وه: **خوا بیانگرێ هـه‌موویان دابه‌شکرد، حه‌قی میلله‌تی کوردیان زایع کرد، کوردستان جوان بوو ناشیرینیان کرد.**

✍✍✍✍✍✍✍✍✍✍هاوڕێیـه‌کی خۆشه‌ویسـتی سـه‌رده‌می قوتابیـه‌تی لـه ئامـاده‌یی رزگـاری مه‌سـعودی نـاوه ئێسـتا مامۆسـتایه لـه‌ئاماده‌یی حـه‌مرین، ئـه‌و مامۆسـتا مه‌سـعووده به‌بۆنـه‌ی جـه‌ژنی ڕه‌مـه‌زانی سـاڵی ٢٠١٣ کورتـه نامه‌یـه‌کی پیرۆزبـــایی جـــه‌ژنی بـــه‌مۆبایل بـــۆ نـــاردبووم، له‌نامه‌که‌یـــدا ده‌ڵـــێ: **سه‌د ساڵیتریش گه‌ر ته‌مه‌ن مابێ، کۆچان هه‌ڵگرم پشتم چه‌ما بێ، گه‌ر مسقاڵێکیش هێزم تیا مابێ، دڵم له‌ئاستت بێ وه‌فا نابێ، له‌به‌رامبه‌ردا نه‌ك جارێ، هه‌زار جار ده‌ڵێم: جه‌ژنت پیرۆز بێ.** ..منیش له‌کورته وه‌ڵامێکدا به مۆبایل به‌م شێوه‌یه وه‌ڵام دایه‌وه: **یاخوا ته‌مه‌نت زیاد له‌سه‌د ساڵ بێ، هێزو تواناشت وه‌ك قوله‌ی قاف بێ، هه‌رگیز نه‌بینم پشتت چه‌ما بێ، ئه‌و دڵه گه‌وره‌ت هـه‌رده‌م ئاوا بێ، بۆ دڵسۆزیشت تاجی وه‌فات له‌سه‌ر ئه‌که‌م، گه‌ر له ئه‌حوالیشت نه‌پرسم، له‌دڵه‌وه بیرت ئه‌که‌م.. نـه‌ك هه‌ر جارێ هه‌زاران جار جه‌ژن له‌تۆ پیرۆز ئه‌که‌م ئه‌ی هاوڕێ خۆشه‌ویسته‌که‌م.**

✍✍✍✍✍✍✍✍✍✍✍ کاك هیوا ناوێك هه‌بوو له‌گۆڤاری ستانده‌ر به‌یه‌که‌وه هاوکـار بـووین، لـه‌وه‌ڵامی مۆبایلـه نامه‌یه‌کدا کـه گلـه‌یی وگازانـده‌ی ئـه‌وه‌ی کـرد بـوو له‌وه‌ی ماوه‌یه‌که هه‌واڵیم نه‌پرسیوه، به‌م شێوه‌یه بۆم نووسییه‌وه: وتیان به مۆم بۆ باق وبریقی جارانت نییه، وتی: شه‌وقی خۆره خه‌تای منی تیا نییه.

✍✍✍✍✍✍✍✍✍✍✍✍عه‌بـدوڵڵای حـاجی سمـایلی ده‌ربه‌نـدی گـۆمی که‌نـدێناوه‌ی، کـه ده‌بـۆوه خـه‌زووری خۆشم، ئـه‌و لـه‌وه‌ختێکی زۆر خـراپ خێزانه‌کـه‌ی عـه‌مری خـوای کـرد، دوای یـه‌ك دوو مـانگ ویسـتی ژنـێ مـاره بکاتـه‌وه.. کیـژه‌کانی و ده‌وروبـه‌ری پێیـان خـۆش نـه‌بوو، ئـه‌منیش بـه دژه‌بـاوی هـه‌موو لایـه‌کی کۆپه‌ڵـه

هەڵبەستێکی حەیرانەکەی حەسەن سیساوەم بەکورتە نامەیەکی مۆبایل بۆ مام عەبدوڵڵا نارد: حەیران دەڵێ: خەوی ناو قاپوتی لەگەڵ نازدار حەیرانێ خۆشترە.

✍✍✍✍✍✍✍✍✍✍✍✍✍✍سالانێك لەگوندی گربدەوی نوێی بەردەرەش مامۆستا بووم، عەزەدین موختاری گوند بوو، ئەو کاك عەزەدینە کورێکی هەشت نۆ ساڵانەی ناو محەمەدی لەلای ئێمە قوتابی بوو.. رۆژێك محەمەد زۆر بەخێرایی بەلای مندا تێپەری، پەشۆکا بوو، منیش پێم وت ها محەمەد چی بووە وا پەشۆکاوی..؟ ئەویش گوتی: کو نەشێوێم مامۆستا، سونەتکەر هاتیتە گوندی، نەکو سونەتم بکەن. پێم گوت: لۆ ئەتوو سونەت نەکرای..؟ ئەویش گوتی: سونەت کرایمە، بەس ئەگەر جارێکیکەش سونەتیان کردمەوە.

* * *

📖پیاوێک خەڵکی (بنی سلمە) بوو هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پرسی: پێغەمبەری خوا، ئاخۆ دایک و باوکم هیچ مافێکیان لەسەرم بێت پاش مردنیان بۆیان بکەم؟ فەرمووی: ( بەڵێ، نوێژکردن لەسەریان و، داوا لێخۆشبوون و، بەجێگەیاندنی پەیمان و بەڵێنیان پاش خۆیان، لەگەڵ بەجێگەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی کە بەهۆی ئەوانەوە دروست بووە و رێزگرتنیش لە هاوەڵانی ئەوان)(أخرجه أبوداود)

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

﴿ ۞ إِنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ ﴿٣٨﴾ ﴾ الحج: ٣٨

# نیشانەکانی خیانەتـــی زەوجـــی و.... نەبوونی بە نموونە

زۆرجار ژنان پیاوەکانیان بەساردو سڕی دەبینن، کۆمەڵێك گومانی خراپ بەناخ و دڵ و دەروونیـــان گـــوزەر دەکـــات، گومانـــەکانیان دەگاتـــە ئـــەو ئاســـتەی بڵـــێن: پیاوەکانمان خیانەتمان لێ دەکەن.

لەوەشدا ژن هەیە بەبێ بەڵگە هەڵناچێ و خۆی لـەگوورە نابات، هەیشە لەبچوکترین جوڵانـەوەی پیاوەکـەی دەکەوێتـە گومـان و هەمیشـە بـەزمانی زبر،بەتونـد و تیژییـەوە ناخی خۆی بەتاڵ دەکاتەوە کە چی بەمێشك داهات هەمووی بۆ هەڵدەڕێژێ.

چەندین توێژینەوەی کۆمەڵایەتی ئەنجامدراوە، ژمارەیەك خاڵیان بۆ دەرخستنی ئەو خیانەتـە ڕیزبەنـد کـردووە بـەوەی ئەگـەر پیـاوان ئـەو خاڵانـەیان تێدا هاتـە دی، ئـەوە خیانەتی هاوسەرێتیان ئەنجامداوە، هەرچەندە مەرج نیە هـەر کەسێك ئەو نیشـانانەی لێ هاتەدی ئەوە لەبیری خیانەت دابێ، لەو خاڵانە:

١-درێژکردنـەوەی کاتـەکانی کـارکردن بـەبێ هـۆ بـەس تـەنها نەیەتـەوە مـاڵ لـەپێناو خۆدزینەوە لەژیانی خێزانداری.

٢-کەمدوویی و سارد و سڕی لـە ڕەفتـارو هەڵسوکەوتی دا بەبەراورد لەگەڵ پێشتر کە کەسێکی کراوە و دەمبەخەندە و قسەخۆش بووە کەچی ئەو هەستە ئەڤینداریيـەی پێشـان بۆ خێزانەکەی دەردەبڕی ئێستا خـۆی لـێ بـەدوور دەگـرێ، لەوەشدا داڵغە و خەیاڵی بەرەو جیهانێکی تر دەڕوات وەکو بیر لـەژیانێکی تـر و کەسێکی تـر بکاتـەوە کاتێك لەتەك خێزانەکەی دادەنیشێ.

٣-چـوونە سـەر ئینتـەرنێت بـەبێ بەرنامـە بـەوەی( لـە وەخـت و ناوەخـت خـۆی بـە ئینتەرنێتـەوە سـەرقاڵ دەکـات و ژنەکـەی فـەرامۆش دەکـات) لەوەشـدا نەخـەوتن و خەوزڕان و بێتاقەتی خۆی دەکاتە پاساو تـاوەکو تـوخنی خێزانەکەی نەکەوێ و لێـی نزیك نەبێتەوە.

٤-هەڵچوونی دەروونی و دەنگ بەرزکردنەوە لە کاتێکدا ژنەکەی هەندێ پرسیاری دەرەوەی لێ دەکات، پێی تووڕە دەبێ کە بگرە هەندێ جار دەگاتە ڕادەی قسەی ناشیرین و جنێودان، بۆ نموونە کاتێك لێی دەپرسێ: لەکوێ بووی؟ لە گەڵ کێ بووی؟ بۆچی مۆبایلەکەت داخرابوو...هتد.

٥- سارو سڕی لەکاری جیماع بەبەراورد لەگەڵ کاتەکانی پێشووتر بەکڵۆجێ پیاوەکەی هیچ کێشەیەکی نەخۆشی و چوونە ساڵەوەی پێوە دیار نیە پاساو بێت بۆ خۆدزینەوەی لەو کارە شەرعیەدا[١٥٣]

٦-گۆڕان لە ڕووی پۆشینی جلوبەرگ و کاتەکانی خەوتن و گۆڕانکاریەکانی دیکەی وەك زیاتر چوونە گەرماو و داواکاری خواردنی نوێ و...هتد.

٧-خۆخافلاندن بە مۆبایل و قسەکردنی دوور و درێژ و بەهێمنی و لەسەرخۆیی لەگەڵ کەسانی نەناسراو تا ژنەکەی تێنەگات باسی چی دەکا و پێویست نەبوونی ئەو کات کوشتنە زۆرەی بەمۆبایل کە دەکرێ شتەکان لەچوارچێوەیەکدا کورت بکاتەوە، کەچی مۆبایلەکەی بۆ تاوێك چیە لەخۆی دوورناخاتەوە.

📖 ئەگەر بجوولێنەوە، نەبوونی ڕووتان تێناکات...[١٥٤]

---

[١٥٣] - کابرایەکی نوێژنەکەری داوێن پیس لە مەجلیسێك دانیشتبوو، بەشانازییەوە دەیوت: لەگەڵ ژنێ چاك و چۆنیم هەبوو، تەلەفۆنمان لەبەین بوو، پیاوەکەیم دەناسی و هاتوچۆی ماڵیانم دەکرد، پیاوەکەی وەکو من ئارەقخۆر بوو، ژنەکەیشی سەرەڕای ئەو جوانیەی هەیبوو، کەچی پیاوەکەی فەرامۆش و پشتگوێی خستبوو، بەئاشکرا لەگەڵ ئەم و ئەو ڕای دەبوارد، چەند جارێ بەئاشکرا ژنە سۆزانی هێنابووەوە ماڵ، تەنانەت بەهۆی قومارکردنەوە درەنگی شەو لە نادی دەکەوێ و بەسەرخۆشی دەگەڕایتەوە ماڵ و یەکسەر بۆ سەر پێخەف و لێی دەخەوێ.

شەوێکیان ژنەکەی تەلەفۆنی بۆ کردم ئەو شەوە بچمە ماڵیان و لەلای بمێنمەوە، پیاوەکەی بەسەفەر چووبووە دهۆك، منیش بەپیر داواکەیەوە چووم، ئەو شەوە پێکەوە ڕامانبوارد، پێش دەرچوون، پێی وتم: وا مەزانە سۆزانی بم، کە لەگەڵت ڕامبوارد پێموایە بەم کارە تۆڵەی خۆم لەپیاوەکەم دەکەمەوە لەکاتێکدا بەئاشکرا خیانەتم لێ دەکات، ئەگەر ئەو خیانەتم دەرهەق بکات، تور ویژدانت ناهەقم ئەگەر منیش ناپاکی دەرهەق بکەم؟(مرۆڤ کە خوا نەناسێ و شەرمی لێ نەکات هەموو شتێك دەکات بێ ئەوەی بیر لەگەورەیی گوناهەکەی بکاتەوە)

کابرایەکی تر بۆی گێڕامەوە وتی: تازە بەتازە ژنم هێنابوو، لەیەکەم شەوەوە ژنەکەم پێی وتم: دەستم دامێنت، من چەتری تۆم و تۆیش چەتری منی.. من نامووسی تۆم و تۆش نامووسی منی، تکات لێ دەکەم خیانەتم لێ مەکە با خیانەتت لێ نەکەم.

✍ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: لەوە ناترسم هەژاری و نەبوونی ڕووتان تێ بکات، بەڵام لەوە دەترسم کە دونیاتان بۆ فراوان ببێ وەکو چۆن بۆ پێشوەکانتان فراوان ببوو ئێوەش پێشبڕکێی تێدا بکەن وەکو چۆن ئەوان پێشبڕکێیان تێدا دەکرد ئەمجا لەناوتان ببات وەك چۆن ئەوانی لەناو برد[155]

دەوترێ: نەبوونی ڕەگێکی لەهارییەوە.. بەڵام هەبوونی و نەبوونی ئازمایشی خوای پەروەردگارە بۆ بەندەکان تاوەکو بزانێت: کابرای نەبوو بەو بەشەی خۆی ڕازییە؟ کابرای هەبوو قەدری ئەو نیعمەتە دەگرێ کە پێی دراوە بۆ ئەوەی یارمەتی لێقەوماوانی پێ بدات؟

هیچ کەس لەبرسا نەمردووە ئەگەر جووڵەیەکی تێدابێت.

✍ خێرت بۆ دەوروبەرت هەبێت باشترە لەوەی هەر بەدە متەوە بکەن!!

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: (دەستی بەرز و کاروکاسبی باشترە لەو دەستەی نزمە و دەست پان دەکاتەوە، لەخێر و چاکەدا لەکەس و کاری خۆتەوە دەست پێبکە، باشترین چاکە و خێریش ئەوەیە لەسەر دەوڵەمەندی بکرێت، ئەوەشی خۆی بپارێزێ

---

[154] - ئەوانەی ئەمڕۆ بەناوی نەبوونییەوە سەر بەم کون و ئەو کون دادەگرن، لەمزگەوت و سەرشەقام و کۆڵانەکانی گەڕەك دەرۆزە و سواڵ دەکەن، ژمارەیەکی زۆر کەم و دەگمەنی لێ دەرچێ، ئەویتر بەکڵاوات دەپارێتەوە و دەستی پان دەکاتەوە، ئێوارەیەکیان دوای نوێژی خەوتنان(عیشا) کاتێ گەنجێك دوای سەلامدانەوەی مەلا و سەلامدانەوەی ئەو خەڵکەی مزگەوت، هەستایە سەرپێ و کەوتە نووزانەوە بەوەی پێویستی بەیارمەتیە و هیچی نیە لەماڵەوە بیخوات.

کابرایەکی نوێژکەر لەتەکمەوە دانیشتبوو زکری دەکرد، خۆی بۆ نەگیرا، وتی: هەفتەکەی ئەولاتر هەر لەو مزگەوتە کابرایەك دوای نوێژی شێوان سکاڵای حاڵی خۆی کرد گوایە دەستکورتە و پێویستی بەعەمەلیاتە و منداڵێکی بەگەر خۆی دابوو، لێی چوومە پێش، پێموت: پێویستیت بە نەشتەرگەرییە؟ وتی: بەڵێ. وتم: ئەگەر پارە هەبێ؟ وتی: هەر سبەی زوو نەشتەرگەرییەکەی بۆ ئەنجامی دەدەم. منیش پێموت: دەباشە من یارمەتیت دەدەم.. لەکاغەزێکدا ناوی خۆم و ژمارەی مۆبایلەکەم بۆی نووسی و پێمدا، وتم: ئەوەش تەلەفۆنی منە، سبەی یەك تەلەفۆن بۆ برای خۆت بکە، لەهەر کوێیەك بیت دێمە دوات و بۆ کام خەستەخانەی دەڵێی دێم تاوەکو تەواو بوونی نەشتەرگەرییەکە ناهێڵم یەك دینار بدەی، هەموو پارەکە خۆم دەیدەم.

کابراش بەسوپاسەوە کاغەزەکەی لێ وەرگرتم ، ئەوسا و ئێستاش چاوەڕوان بووم تەلەفۆنم بۆ بکات، تەلەفۆنی نەکرد و ئەو سیناریۆیەی لێرە و لەوێ بەناوی نەشتەرگەرییەوە دەیکرد، هەر هەمووی درۆ بوون.

[155] - قال( ﷺ)(فوالله مالفقر اخشى عليكم ولكني اخشى عليكم ان تبسط عليكم الدنيا كما بسطت من كان قبلكم فتنافسوها كما تنافسوا فتهلككم كما اهلكتم) رواه البخاري و مسلم

خوای گەورە دەیپارێزێ، ئەوەشی دڵ دەوڵەمەند بێت و نەفسی بەرز بگرێت لەدەست پانکردنەوە ئەوا پەروەردگار دەوڵەمەندی دەکات)(متفق علیه)

📖 مامۆستا (ئەبوبەکر شوان) لە شەوچەرەکەیدا بەسەرهاتی (مار و چۆلەکە)مان بۆ دەگێڕێتەوە:

✎ پیاوێك هەبوو، تەوەزەڵ و بخۆ و بڕۆ، بژێوی ڕۆژانەی خۆی لە مزگەوت بەدەست دێنا..ڕۆژێکیان مامۆستا بانگی کرد و پێی وت: کاکی خۆم، بۆ کارێك ناکەی بژێوی خۆت حەلاڵ بکەی چیتر چاوت لەدەستی ئەم و ئەو نەبێ، خوای گەورەش لە قورئانێدا باس لەکۆشش و هەوڵ و ماندوو بوون دەکات بەوەی لە تۆ حەرەکەت، هەرچۆنێ بوو کابرای لۆژ هاتە ڕایێ بۆ ئەوەی لە بەیانییەکەی زووتر نییە بەرەو کارێك بڕوا و نانێ بۆ خۆی پەیدا بکات تا چیتر چاوی لەدەستی ئەم و ئەو نەبێ.

بەیانی ڕۆژی پاشتر ناوی خوای لێهێناو بۆ کارکردن بەرەو شار کەوتە ڕێ، لە ڕێگادا تووشی شۆك هات کە بینی ئەوە چۆلەکەیەك بەدەنووکی خواردن بۆ مارێك دێنێ، مارەکەش نابینا بوو، بیری کردەوە خوای گەورە کەس لەبیر ناکا و نانی هەموو خوڵقێنراوێکە، ڕێ و ڕێ گەڕایەوە مزگەوت و مامۆستاش بەبینینی سەرسام بوو، بەتاسەوە لێی پرسی: کابرا ئەی بڕیار نەبوو بچیە شار ئیشێك بۆ خۆت بکەی، خێرە وا گەڕایەوە؟

کابرا سەربووردەی مار و چۆلەکەکەی بۆ مامۆستا گێڕایەوە، مامۆستاش وتی: کاکی خۆم، بۆ خۆت دەکەیتە مارەکە، بۆ خۆت ناکەیتە چۆلەکەکە؟ ئەگەر خێرت بۆ دەوروبەرت هەبێت باشتر نیە لەوەی هەر بەدەمتەوە بکەن؟[١٥٦]

* * *

[١٥٦] - جارێك هاوەڵان پرسیاریان کرد لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) کام کاروکاسبی باشە؟ فەرمووی: ( ئەوەی مرۆڤ بەدەستی خۆی پەیدای بکات) هەروەها (ﷺ) دەفەرموێت: ( باشترین خواردنی مرۆڤ ئەوەیە لەبەروبوومی دەستی خۆی بخوات، وەچەی مرۆڤیش هەر لەبەرهەمی خۆیەتی) (اخرجه ابوداود و الحاکم)

قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

﴿وَمَا الْحَيَوٰةُ الدُّنْيَآ إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَلَلدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٣٢﴾﴾
الأنعام: ٣٢

## ژیـــــان چی یە؟ بیناسە...

پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێت: دنیا لەلای خوا باڵە مێشوولەیەك ناهێنێ [١٥٧]

هـەروەها لەفەرموودەیـەكی دیكـەدا هـاتووە: دنیـا لەچـاو دواڕۆژ وەك ئـەوە وایـە كـە یـەكێكتان پەنجـەی بخاتـە دەریـاوە، بابڕوانێ داخوا چـی پێوە هـاتووە؟! واتـە ژیـان و ڕابواردنی دنیا لەچاو دواڕۆژ هەر وەك ئەو ئەندازە ئاوە وایە كە بە قامكی كەسێكەوە دێ كە دەیخاتە دەریاوە لەچاو ئاوی دەریا [١٥٨]

هەروەها دەفەرمووێ: ( كن في الدنيا كأنك غريب أو عابر سبيل): لە دنیـادا وەكو ئاوارە و كۆچەر یان ڕێبوارێ بە. بوخاری گێڕاویێتیەوە، جامع اللاصول، ج١،ص٣٩٢

یـارانی پێغەمبـەر( ﷺ) بـاش لـەم وانەیـە تێگەیشـتبوون و لەبـەریان كردبـوو كـە لـە ژیانیانـدا جێبـەجێیان دەكـرد، ئەمـەش بـووە هۆكارێـك تـاوەكو شوێنكەوتوان بەچاكە شوێنیان بكەون.

(ئەبوبـەكری صـدیق) (رضي الله عنه) لـە جـەنگی ( تـەبووك) هـەموو سـامانی خـۆی بـۆ سـوپای (العسرة) دەكاتە خێر.

(عوسمــانی كــوڕی عــەفان) (رضي الله عنه) ســێ ســەد حوشــتر بــەبارەوە دەبەخشــێت و لــە گێڕانەوەیەكی تردا هاتووە: هەزار دینار دەكاتە خێر و لەپێش پێغەمبەری دادەنێت.

(عومـەری كـوڕی خـەتاب)یش (رضي الله عنه) هـەموو مـاڵی خـۆی دەبەخشـێت، تەنانـەت دوای ئەوەی بووە خەلیفەی موسڵمانان و بـەهێزترین كاربەدەسـت بـوو لەسـەر زەوی بـۆ ئـەو كاتـە كـە كیسـرا و قەیسـەر لێـی دەترسـان، ڕۆژێكیـان نێـردراوی كیسـرا دێتـە لای، دەبینێت ئیمامی عومەر لەژێر سێبەری درەختێك خەوی لێكەوتووە و جل و بەرگێكی

---

[١٥٧] -قال(ﷺ ) ( الدنيا لا تعدل عندالله جناح بعوضة) رواه الديلمي.

[١٥٨] -قال( ﷺ) (ما الدنيا في الاخرة الا مثل ما يجعل احدكم اصبعه في اليم فلينظر بم برجع) رواه مسلم

پیناوی و کۆنی لەبەرە، بەم دیمەنە سەری سور دەمێنێ و دەڵێ: بەڕاستی دادپەروەریت کردووە بۆیە بەبێ ترس نووستویت[159]

ئیمامی شافعی (رەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێت: دنیا وەکو ئێسقانی دەمی سەگێك وایە، ئەو سەگە چەند زمانی لێ بدات ئەوەندە تام و چێژی لێ وەردەگرێت وەکو چۆن زیانیش بەزمانی دەگات.

ژیان سەر سەخترین قوتابخانەیە، مرۆڤ نازانێ لە چ قۆناغێکدایە! نازانێ کامە تاقیکردنەوەی هەیە و ناشتوانێ گزی و قۆپیە بکات چونکە پرسیاری هیچ کەسێك وەکو ئەویتر نیە.

❁رۆژێکیان هاوڕێیەکم قسەیەکی جوانی کرد، وتی: ژیان لەوەدا دەبینم ئەگەر درەنگ بمرم وەکو چۆن تازە لەدایك ببووم، ئاوا ببمەوە مندال، هەروەها چۆن تاوەکو گەورە بووم کەسم نەدەناسی، ئاوام لێبێ و کەس نەناسمەوە، تەنانەت بەجۆرێ شەکەت و کەیل و بێ تاقەت دەبم وەکو چۆن منداڵێکی ساوا دەستی هیچ ناگرێ، ئاوا دەستم هیچ نەگرێ و توانای ڕۆیشتنم نەمێنێت وەکو چۆن بەساوایی نەمدەتوانی بڕۆم و هەر دەبوو خزمەت بکرێم. باشترین پێناسە بۆ ژیان وتە پڕشنگدارەکەی سەرداری مرۆڤایەتییە کە دەفەرموێت: ( هەر کەسێك ڕۆژ بکاتەوە و لەش ساغ بێت و، دڵنیا بێت لەنێو خەڵکی دا و نانی ئەو ڕۆژەی هەبێت، ئەوا وەك ئەوە وەهایە هەموو دنیای پێشکەش کرابێت)(رواه الترمذي)

دیل کارنگی دەڵێت: بیر لە ژیان بکەنەوە، بەڵام خەمی بۆ مەخۆن

✍رۆژان رۆژیان لەدوایە...

پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێت: ( دنیا ماڵی یەکێکە کە بێ نەواو ماڵ بێت و، ماڵی یەکێکیشە کەوا بێ ماڵ و سامان بێت و، یەکێکیش پارە و سامانی تیا کۆدەکاتەوە ژیریی و عەقڵی لەدەست دابێت).( اخرجه احمد) و (والبیهقی)

✍ مامۆستا هەمزە عەباس فەقێ [160] بۆی گێڕامەوە وتی:

---

[159] – سەبارەت بە قەزا و قەدەر، دەگێڕنەوە کابرایەك دزی کردبوو، هێنایانەی لای ئیمامی عومەر، ئیمامی عومەر لێی پرسی: بۆچی دزی دەکەی؟ وەڵامی دایەوە وتی: بۆیە دزی دەکەم چونکە خوا لەچارەی نووسیوم دزی بکەم. ئیمامی عومەر وتی: مادام تۆ خوا لەچارەی نووسیبی دزی بکەی، ئەوا منیش خوا لەچارەی نووسیوم دەستت بڕم.

[160] – سەرنووسەری گۆڤاری (ژیاری)ە، مرۆڤێکی دڵسۆز و کادیرێکی بەئەزموونی بواری پەروەردەییە.

ئافرەتێك دەڵێت: لەگەڵ هاوسەرەکەم ژیانمان دەگوزەراند، هاوسەرەکەم زۆر دەوڵەمەند بوو، بەڵام زۆر پیسکە و ڕەزیل بوو! ڕۆژێکیان خوانێکی باشم ئامادەکردبوو کاتی نیوەڕۆ بوو لەناکاو لەدەرگا درا، منیش دەرگاکەم کردەوە و بینیم پیاوێکی هەژاری برسییە و داوای نان یان خواردنێك دەکات، گەڕامەوە بۆ لای هاوسەرەکەم و حاڵەکەم بۆی باس کرد، ئەویش وتی: دەرگاکەی بەسەر داخە و بڵێ خۆشمان هەژارین.

وتم: کەی ئێمە هەژارین؟

وتی: چیم پێ وتی ئاوا بکە.

منیش پیاوە هەژارەکەم بەبرسێتی بەڕێکرد و بەدەروونی پڕ لەئازارەوە دەرگاکەم داخست.

ڕۆژان هاتن و ڕۆژان چوون، دوای ماوەیەکی کەم هاوسەرەکەم تووشی زەرەرێکی زۆر هات و دەست بەتاڵ و مایەپووچ مایەوە! تەنانەت توانای بەڕێوەبردنی ماڵیشی نەماو دواجار دەستبەرداری منیش بوو تەڵاقی دام، ماوەیەك بەم حاڵە ژیانم گوزەراند، دواتر پیاوێکی خواناس ودەستکراوە هاتە داوام و منیش ڕازی بووم شووی پێبکەم.

پیاوەکە ماڵ و گوزەرانێکی باشی هەبوو، ڕۆژێکیان بەهەمان شێوە لەسەر نانخواردنی نیوەڕۆ بووین لەدەرگا درا، کاتێك دەرگام کردەوە بینیم پیاوێکی داماو و برسی داوای لوقمە نانێکی دەکرد، منیش وەك هەمیشە گەڕامەوە لای هاوسەرەکەم و پێمگوت: ئەوە هەژارێکی برسی هاتۆتە بەرقاپی ماڵمان و داوای خواردن دەکات.

ئەویش وتی:ئەم خواردنەی هەموو بۆ ببە ئێمە لەو باشترین، داخوا لەکەیەوە ئەو داماوە نانی نەخواردووە.

کاتێك خواردنەکەم بەهەژارەکەدا، سەرنجمدا و ناسیمەوە، بۆیە زۆر بەزەییم پیاهاتەوە و هەناسەیەکی ساردم هەڵکێشا، هاوسەرەکەم وتی: ئەوە بۆچی وا غەمبار بوویت؟

وتم: دەزانی ئەو پیاوە هەژارە کێ یە؟

وتی: بەچی بزانم؟ کێ یە؟

منیش وتم: ئەوە هاوسەرەکەی پێشوومە!!

هاوسەرەکەم سەرنجیدام و وتی: ئەی تۆ دەزانی من کێم؟

وتم: ئەوە مانای چیە تۆ کێی؟

وتی: منیش ئەو پیاوە هەژارە بووم کە هاتمە بەردەرگاکەی ئێوە و بەبێنازی و سکی برسییەوە دەرگاتان بەڕووم داخست! کەواتە ڕۆژان ڕۆژیان لەدوایە، با هەرگیز بەماڵ و سامان،گەنجی و جوانی، هێز و بازوومان لەخۆبایی نەبین، ڕۆژەکان ماڵئاوایی دەکەن و هەڵوێستەکان دەمێننەوە).

✍پێغەمبەر(ﷺ) پێی دەفەرموون: (ان الدنیا حلوة خضرة وان الله مستخلفكم فیها فناظر كیف تعملون، الا فاتقوا الدنیا واتقوا النساء)...: دنیا سەوزە و شیرینە، خوا ئێوەی تێدا بەجێهێشتووە، سەیر دەکا چۆن هەڵسوکەوت دەکەن، خۆتان لە دنیا و ئافرەت بپارێزن.( موسلیم و نەسائی گێڕاویانەتەوە، جامع الاصول،ج٤، ص٥،٤٠

✍ ئەنیشتاین دەڵێت: من بەهیچ شێوەیەك بیر لە داهاتوو ناکەمەوە، چونکە هەرچیەك بێت ئیتر ڕوو دەدات، ئەو چرکەساتەی کە ئێستا تێیدا دەژین نە دوێنێ و نە ئەمڕۆ ناتوانێت بیگۆڕێت، لەبەر ئەوە گرنگترین کات ئێستایە کە تێیدا دەژیت.

ئەو وتەیە هاندانە پەند لەڕابردووی خۆمان وەرگرین، ئەگەر هەڵە و پەڵەمان هەبوو، بەخۆماندا بچینەوە زیاتر خزمەتی مرۆڤایەتی و خواناسی بکەینە سەرمەشقی پەیامی ژیانمان.

### ❁ مردن و ژیان وەکو یەکە!

✎ پێغەمبەر نوح(علیه السلام) ٩٥٠ ساڵ ژیان کاتێك لێیان پرسی: ژیان بەلاتەوە چی یە؟ چۆن دەڕوانیتە ژیان؟ لەوەڵامدا وتی: ژیان وەکو خانوویەکی دوو دەرگەیی وایە کە لە دەرگایەکەوە بچیتە ژوور و لەویتر بێیە دەرەوە[١٦١]

✎ فەیلەسوفی یۆنانی(ئەرستۆ) هەمیشە دەیگوت: مردن و ژیان یەکسانن...

ڕۆژێك یەکێك پێی دەڵێت: ئەی کەوایە بۆ خۆت ناکوژیت ئەگەر یەکسانن؟

ئەرستۆ لە وەڵامدا دەڵێت: ئەی گەمژە، من وتومە یەکسانن، نەم وتووە مردن خۆشترە تا خۆمی بۆ بکوژم[١٦٢]

✎ لە بیرمەندێکیان پرسی ژیان چی فێرکردووی؟ لەوەڵامدا وتی: ژیان فێری کردم نرخی هەر شتێك بەئەندازەی خۆی بدەم، بۆ ئێستام بژیم، نەك داهاتوو.( مەبەست لە

[١٦١] - پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ( چوار ڕەفتار بەدبەختی و سەرگەردانی یە: نەرشتنی فرمێسك و، دڵڕەقی و ئومێد درێژی و، سووربوون لەسەر دنیا) (اخرجه ابو نعیم في الحلیه)

[١٦٢] - گۆڤاری گوڵان- ژمارە (٨٦٧) ١٣ی شوبات٢٠١٢

ئێستا نەك داهاتوو ئەوەیە كەس نازانێ تاوەكو سبەی دەژیێ یان نا؟ كەس نازانێ ئەمڕۆی لەبەیانی باشتر دەبێ یان خراپتر و...هتد. ئەوەش لەگەڵ وتە بەنرخەی ئیمامی عەلی(رەزای خوای لێبێ) هاوڕایە كە دەڵێت: بەجۆری كار بۆ دنیات بكە وەكو ئەوەی نەمریت و بەجۆریێ كار بۆ دواڕۆژت بكە وەكو ئەوەی بەیانی بمریت.

✎ **مامۆستا مەلا جەمال بەگی مەلۆك دەڵێت:** هەرگیز دوو خۆشەویست بۆ یەك نابن، ئەگەر بۆ یەكیش بن، ئەوە مردن لەیەكیان دەكات.

* * *

# بەسەرهاتی جورەیجی خوا پەرست

📖پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:

– لەناو لانکدا کەس گفتوگۆی نەکردووە، سێ کەس نەبێ: عیسای کوڕی مریەم، ئەو منداڵەی بەهۆی جورەیجەوە هاتە ئاخاوتن. جورەیج پیاوێکی خواپەرست بوو، خەڵوەتگایەکی بۆ خۆی دانابوو بەندایەتی تیا دەکرد، دایکی هات بۆ لای – لەکاتێکدا جورەیج نوێژی دەکرد – پێی وت: کوڕم جورەیج! ئەویش ( لە دڵی خۆیدا) وتی: خوایە تیا ماووم لەنێوان دایکم و نوێژەکەمدا؟. پاشان بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی، دایکی گەڕایەوە. بۆ بەیانی بەهەمان شێوە هاتەوە لای، ئەو هەر نوێژی دەکرد، دایکی وتی: ئەی جورەیج! ئەویش وتی: (خوایە تیا ماووم لەنێوان دایکم و نوێژەکەمدا؟ پاشان بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی، بۆ بەیانی سێهەمیش هاتەوە ئەو هەر نوێژی دەکرد، بۆیە دایکی وتی: ئەی جورەیج. ئەویش وتی: خوایە تیا ماووم لەنێوان دایکم و نوێژەکەمدا؟ بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی، بۆیە دایکی نزای لێکرد و وتی: خوایە مەیمرێنە هەتا ڕوخساری داوێنپیسان دەبینێت! ئا لێرەدا ئیسرائیلیەکان کەوتنە باسی جورەیج و عیبادەتەکەی.

ئافرەتێکی بەدڕەوشت هەبوو نموونە بوو لەجوانیدا، وتی: ئەگەر ئێوە بتانەوێ ئەوا من جورەیج لەخشتە دەبەم و پاشان ئافرەتەکە چووە لای جورەیج و ڕێگەی پێگرت، بەڵام جورەیج گوێی پێنەدا، ئافرەتەکە چوو بۆ لای شوانێك کە سەردانی خەڵوەتگای جورەیجی دەکرد، خۆی دایە دەستی و کاری داوێن پیسی لەگەڵ ئەنجامدا و سکی پڕ بوو، کاتێك کە منداڵەکەی بوو، وتی: ئەم منداڵە لە جورەیجە. خەڵکەکە چوون بۆ لای جورەیج وخەڵوەتگاکەیان ڕووخاند و لە خەڵوەتگاکە دایان گرت و دەستیان کرد بەلێدانی، جورەیج دەیوت: چیتانە! بۆ وام لێدەکەن؟ وتیان: تۆ لەگەڵ ئەم ئافرەتە بەدڕەوشتە کاری داوێن پیسیت ئەنجامداوە،منداڵی لە تۆ بووە. جورەیج وتی: کوا منداڵەکە؟ منداڵەکەیان هێنا بۆ لای، وتی:وازم لێبێنن هەتا نوێژ دەکەم، دەستیکرد بە نوێژکردن، کاتێك لێبوویەوە، هات بۆ لای منداڵەکە و دەستی مالی بە سکی منداڵەکەدا و وتی: کوڕە باوکت کێیە؟ منداڵەکە هاتە گۆ و وتی: فلان کەسی شوانە. خەڵکەکە ڕوویان کردە جورەیج و پاشان ماچیان کرد و دەستیان بەسەردا دەهێنا،

وتیان: خەڵوەتگەکەت بە زێڕ و زیو بۆ دروست دەکەینەوە. جورەیج وتی: نەخێر، بەڵکو وەکو خۆی لێبکەنەوە- کە لە گڵ و قوڕ بوو- ئەوانیش ئەو کارەیان ئەنجامدا. (سێهەم) منداڵێکیش خەریکی شیرخواردن بوو، پیاوێکی خواناس کە سواری ئەسپێکی خۆشڕەو بووبوو بەوێدا تێ پەڕی، دایکی منداڵەکە وتی: خوایە ئەم کوڕەم وەك ئەم سوارە لێبکەیت، منداڵەکە وازی لەمەمکی دایکی هێناو ڕووی کردە پیاوەکە و سەیری کرد، وتی: خوایە وەکو ئەوم لێنەکەیت. پاشان دەستی کردەوە بەمژینی شیری دایکی.(ابو هریرە) دەڵێ: (ئەو دیمەنەم لەبەرچاوە کە پێغەمبەر(د.خ) ئەم چیرۆکەی دەگێڕایەوە و پەنجەی شەیەتمانی خستبۆوە نێو دەمیەوەو دەیمژی) پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی:( ئەم منداڵ و دایکە) بەلای ئافرەتێکدا تێپەڕین کە بەتوندی لێیان دەدا، دەیانوت: داوێن پیسیت کردووە، دزیت کردووە. ئافرەتەکەش دەیوت: خوام بەسەو تەنها پشتم بەو قایمە، دایکی وتی: خوایە ئەم کوڕەم وەك ئەم ئافرەتە لێنەکەیت.( جارێکی تر) منداڵەکە وازی لەشیرخواردن هێناو سەیرێکی ئافرەتەکەی کرد، وتی: خوایە وەکو ئەوم لێبکەیت، پاشان دایکی لەگەڵی کەوتە گفتوگۆ، بەسەرسامیەوە وتی: لاڵ بیت. پیاوێکی شەنگ و شۆخ تێپەڕی وتم: خوایە کوڕەکەم وەکو ئەو لێبکەیت؟ کەچی تۆ وتت: خوایە وەك ئەوم لێنەکەیت. پاشان هاتین بەسەر ئەو کەنیزەکەی لێیان دەداو پێیان دەوت: داوێن پیسی و دزیت کردووە، تێپەڕین، من وتم: خوایە کوڕەکەم وا لێنەکەیت( کەچی تۆ بەپێچەوانەوە) وتت: خوایە وەکو ئەوم لێبکەیت! منداڵەکە وتی: پیاوەکە کەسێکی تاوانبار بوو بۆیە منیش وتم: خوایە وەکو ئەوم لێنەکەیت، ئافرەتەکەش کە پێیان دەوت: داوێن پیسی و دزیت کردووە، نەداوێن پیسی کردبوو، نەدزی بۆیە منیش وتم: خوایە وەك ئەوم لێبکەیت[١٦٣]

[١٦٣] - عن ابي هريرة(ﷺ) عن النبي(ﷺ) قال: : لم لم يتكلم في المهد الا ثلاثة: عيسى ابن مريم، وصاحب جريج، وكان جريج رجلا عابدا، فاتخذ صومعة فكان فيها، فأتته امه و هو يصلي فقالت: يا جريج، فقال: يارب، امي و صلاتي؟ فاقبل على صلاته، فانصرفت، فلما كان من الغد أتته وهو يصلي، فقالت: يا جريج، فقال: يارب امي و صلاتي؟ فأقبل على صلاته، فانصرفت، فلما كان من الغد أتته(وهو يصلي) فقالت: ياجريج، فقال: يارب أمي و صلاتي؟ فأقبل على صلاته، فقالت: اللهم لا تمته حتى ينظر الى وجوه المومسات، فتذاكر بنو اسرائيل جريجا عبادته، وكانت امراة بغي يتمثل بحسنها، فقالت: ان شئتم لافتننه لكم. قال: فتعرضت له فلم يلتفت اليها، فأتت راعيا كان ياوي الى صومعته فامكنته من نفسها، فوقع عليخا، فحملت،فلما ءلدت قالت: هو من جريج، فأتوه فاستنزلوه، وهدموا صومعته، وجعلوا يضربونه. فقال: ما شأنكم؟ قالوا:

زنيت بهذه البغي فولدت منك. فقال: أين الصبي؟فجاؤا به. فقال: دعوني حتى أصلي، فصلى، فلما انصرفت اتى الصبي فطعن في بطنه وقال: ياغلام من ابوك؟ قال: فلان الراعي. قال: فأقبلوا على جريج يقبلونه و يتمسحون به، وقالوا: بنبي لك صومعتك من ذهب. قال: لا، اعيدها من طين كما كانت ففعلوا. و بينا صبي يرضع من امه، فمر رجل راكب على دابة فارهة، وشارة حسنة، فقالت امه: اللهم اجعل ابني مثل هذا، فترك الثدي و اقبل اليه، فنظر اليه، فقال اللهم لا تجعلني مثله. ثم اقبل على ثديه، فجعل يرتضع- قال: فكأني انظر الى رسول الله(ص) وهو يحكي ارتضاعه باصبعه السبابة في فمه فجعل يمصها- قال: ومروا بجارية وهم يضربونها، ويقولون: زنيت سرقت، وهي تقول: حسبي الله ونعم الوكيل، فقالت أمه: اللهم لا تجعل ابني مثلها، فترك الرضاع و نظر اليها فقال: اللهم اجعلني مثلها، فهناك تراجعا الحديث. فقالت: حلقى، مر رجل حسن الهيئة فقلت: اللهم اجعل ابني مثله، فقلت: اللهم لا تجعلني مثله! ومروا بهذه الامة وهم يضربونها ويقولون: زنيت سرقت، فقلت: اللهم لا تجعلني ابني مثلها، فقلت: اللهم اجعلني مثلها! قال: ان ذاك الرجل كان جبارا، فقلت: اللهم لا تجعلني مثله، وان هذه: يقولون لها: زنيت ولم تزن، وسرقت ، ولم تسرق، فقلت: اللهم اجعلني مثلها).( بخاري/ الانبياء/٣٢٥٣)

